# ناودارانی کورد

نووسینی میر بەسری

عەبدول خالق عەلائەدین
کردوویەتی بەکوردی

سلێمانی ٢٠٠٢

# پێشەكی وەرگێڕ

**ئەوەی ڕاستی بێ دەمێك بوو ئاواتە خوازی ئەوە بووم كە بتوانم سەربوردە و بەسەرهاتی هەندێ لە پیاوانی هەڵكەوتە و سیاسەتمەداری لێهاتووی میللەتەكەمان بنووسم كە زوربەی زۆریان فەرامۆش كراون و هەقی خۆیان وەك پێویست نەدراوەتێ، بێ نازو بێ نەوازشت لە ئارامگەی سەرمەدی خامۆشاندا سەریان ناوەتەوە، هەمیشە شیعرە بەهادارەكەی شاعیری مەزنی كورد حاجی قادر لە مێشكما دەزرنگێتەوە كە دەڵێ:**

كتێب و دەفتەر و تەئریخ و كاغەز

بەكوردی گەر بنوسرایە زوبانی

مەلا و شێخ و میر و پادشامان

هەتا مەحشەر دەما ناونیشانی

**تا لەم دووایەدا خۆشبەختانە ئەو دەرفەت و هەلەم بۆ ڕەخسا تاسەو ئارەزوو نیازی پڕجۆشی هێنامە دی. ئەویش بەهۆی ئەم كتێبەی بە ناونیشانی "اعلام الكرد" دانەری "میر بەسرییە" كەوتە دەستم كەوا لە (لەندەن) بە زمانی عەرەبی ساڵی ١٩٩١ بە چاپ گەیەندراوە، ئیتر لەوساوە واتە لە ساڵی ١٩٩٢ بەسەر گەرمی‌یەوە كەوتمە كاری وەرگێڕانی بۆ زمانی شیرینی نەتەوەكەمان، دەبێ ئەوەش بە خوێنەری خۆشەویستمان ڕابگەیەنم كە دانەری ئەم كتێبە پیاوێكی بیانییە، نەلە ڕەگەز و نە لە ئاینا فڕی بەسەر كوردەوە نیە، كەچی ئەم نوسەرە مەردە ئەرك و ڕەنج و شەونخونی و ماندوبونێكی یەكجار زۆری كێشاوە كە شایستەی ڕێزو تەقدیری هەموو كوردێك بێ. دەتوانم بڵێم كەسی تر لە ئێمە لەبەر هەر هۆیەك بوبێت ئەم كارە پیرۆزەی بەم**

شیوه فراوانییه نەکردووه کە ئەرکی سەرشانی خۆمان بوو، میرو سەردارو پاشـاو رۆڵـەی بـەهرەوەرو خـێرخوازی میللەتەکـەمان زینـدوو بکەینـەوە، کـارو رەفتـارو هەلویسـتی جوامیرانـەی نەتەوایـەتیو کۆمەلایـەتی و مرۆڤایـەتی و بەخشـندەییان بەرچاو بخەین، هەریەکەش بە پیی بارو دۆخ و سەردەمی خۆیان مامەلەیان لەگـەلا بکریْ نەك بە تاوو تەرازوو پیوانەی ئەمرۆی بیرورای سیاسی و چینایەتیو چـەپ رەوی سەیر بکرین، ئەوەی زیاتر جیی داخ و پەرۆشییە ئیمە نەك کەم تەرخەمیمان لەوەدایە کە یادیان ناکەینەوە و ریزمان لیْ نەناون و پەیکەرمان بۆ نەتاشیون، یا لە سوچیکی لاپـەرەی میـژووا شـوینیکمان پـێ رەوا نـەدیتوون. بـەلکو بـە پیچەوانـەی ئەوەوە نەمانهیشتووە لە گۆریشدا بحەسینەوە، ناوونـاتۆرەو تۆمەتی دەرەبـەگ، یـا کۆنەپەرسـت و سـەربە داروەدەسـتەی ئیمپریالیزیشـمان خسـتۆتە پالیـان. بیگومـان ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە دوژمنانی کورد ئەم هەلە بۆ سودی خۆیان بقۆزنەوە. دەبینین بە دریژایی رۆژگـاری میـژوو چـەندین زانـای نـاودار و پیـاوی هۆشمـەند و سیاسەت مەدارو سـەرداری بـەتوانامان لیْ پـەیدا بووبـیْ ئـەوا یەکسـەر رەگەزنامـەی خۆیان داوەتیْ و لە کوردیان بیبەری کردووە، جا تۆش هەر هاوار بکەو بلیْ: کورینـە، عالەمینـە، ئـەوە راست نییە کـاریکی ناپاکی‌یـە لەگـەلْ حەقیقـەت و میـژوودا، داخـۆ چەندی بە چەند؟ئیمەیەکی بیْ تەخت و بەخت چۆنمان بۆ دەسەلمینن!؟..

نرخ و بایـەخی ئەم کتیبـە زیاتر لەوەدایـە کـە دانەرەکـەی کـورد نیـەو بـەزمانی عـەرەبی داینـاوە. لەتـەك ئەوەشـا دانەرەکـەی پیـاویکی بـیر روونـاك و نووسـەر و شاعیرو ئەدیبیکی ناودارە، شوینیکی تایبەتی گران بەها و سەنگینی لەناو جیهانی ئـەدەب و رۆشـنبیرییا هەیـە و بـەگیانی بیلایـەنی و هەسـتی پـر خۆشەویسـتی مرۆڤایـەتی بۆمـان بۆتـە پـاریزەرو شـاهیدیکی سـەر راسـت، توانیویـەتی بـەهۆی دۆستایەتی و هەلسوکەوتی لەگەلْ کوردی رۆشنبیرو شارەزاو پایەبەرز زانیارییـەکی ووردو فـراوان دەربـارەی بەسـەرهاتەکانی کوردسـتان و پیـاوانی نـاودارو ناسـراو بەدەسـت بینـی، سـەرەرای ئـەوەش پشـتی بـە چـەند سـەرچاوەی بـاوەر پیکـراوی میژوویی بەستووە، لەگەلْ ئەوەشا مانای وانییە کە کورد لەو مرۆڤانەی ناویان لـەم

کتێبەدا هاتووە زیاتری لێ هەڵنەکەوتووە، بەڵکو وەکو کورد گۆتەنی (ئەوە مستێکە نمونەی خەروارێکە) دەتوانم بڵێم ئەم کتێبە سەرچاوەیەکی بەهادارە بۆ ئێمەی کوردو بە شێوەیەکی تێکڕایش بۆ هەموو تۆژەرەوەو مێژوو نوسانی تایبەتمەند. لە وەرگێڕانیشدا هەوڵی ئەوەم داوە دەستکاری لە چۆنێتی و شێوازی نوسین و رستەو ماناکانیدا نەکەم مەگەر بە گوێرەی پێویست، کوردو کۆشی ئەوەشم بووە کە بتوانم وێنەی هەر یەکێك لەم زاتانەی ناویان هاتووە بڵاو بکەمەوە، بۆ ئەم مەبەستەش پەیوەندیم بە زۆر برادەرو دۆست و ناسیاوان و خزم و کەسو کاریانەوە کردووە، بەهەر حاڵ کۆمەڵە وێنەیەکم بە هۆی چەند برایەکەوە دەست گیر بوو کە شایستەی سوپاسن ئەگەر چی ژمارەیان لە ئاستی خواست و قەوارەی کتێبەکەدا نەبوو. ئیتر تکام وایە لە کەم و کوڕیمان ببورن، هیوادارم ئەم کتێبەش بەشداربوونێك بێ لە خزمەتی مێژوو و ئەدەبی گەلەکەمان، هەزار سلاویش بۆ گیانی پاکی ئەو مرۆڤانە بێ کە بۆ خێرو خۆشی و سەرفرازی نەوەی کوردی ستەم دیدەمان تێکۆشاون.

عەبدول خالق عەلائەدین

هەولێر

١٩٩٤

# کورتەیەك لە ژیانی دانەر

میر بەسری ساڵی ١٩١١ لە بەغدا هاتۆتە جیهان ،خوێندنی سەرەتایی‌و ناوەندی و دواناوەندی لەوێ تەواودەکات، پاشان لە جامیعەی فەرەنسا دەخوێنێ لە ئابووری‌و ئادابی جیهانی پسپۆڕ و تایبەتمەند دەبێ،گەلێ فەرمانی گرنگ و بایەخداری جیا جیای بینیوە، سکرتێری وەزارەتی دەرەوەی عێراق و لەهەمان وەزارەتدا بریکاری بەڕێوەبەرایەتی تەشریفاتییەکەش بووە، بەڕێوەبەری ژووری بازرگانی بەغداو سەرەك دەرهێنەری گۆڤارەکەی بووە، بەڕێوەبەری گشتی (جمعیة التمور العراقیة) بووە، بەنوێنەری عێراق لە کۆنگرەو پێشانگاکانی جیاجیا لە: پاریس و نیویۆرك، کەمبرج ومیونخ بەشداربووە، سەرپەرشتی دەرچوونی شەش کتێبی کردووە کە بە زمانی ئینگلیزی لەسەر ئابووری و باج و خەراج و کار لە : عێراق، لیبیا، عومان، مەملەکەتی عەرەبی سعودی و میرنشینەکانی عەرەبی نوسراون، هەروەها هەڵبژێردراوە بە ئەندامی کۆمەلەی ئاسیەوی مەلەکی لە لەندەن، جگە لەوەش ئەندامی (نادی القلم العراقی) بوە (جمعیة القلم الدولیة) لە لەندەن، سەرۆکی تایفەی موسەویەکان بووە لە عیراق و پاشان لە سالی ١٩٧٤ روودەکاتە لەندەن. هەرچەندە تەمەنیکی زۆری هەیە، بەلام هەر بەردەوامە لەنوسین و کتیب دانان و بەرهەمی ئەدەبی. دانەر، ئەدیب و نووسەریکی بەهرەوەرو بەتوانایە جگە لە دیوانی شیعر چەندەها کتیبی ئەدەبی و زانستی و میژوویی بەهاداری بەزمانی عەرەبی و ئینگلیزی و فەرەنسی داناوە[1].

(١)ئیوارەی رۆژی دووشەممەی ١٢-١٠-١٩٩٨ لەگەڵ دوو خزمی تر چوومە سەردانی میر بەسری، بەرووخۆشی لەگەڵ هاوسەرەکەی بەپیرمانەوە هاتن، گەلێ وتوویژی هەمەچەشنەی ئەدەبی و کۆمەلایەتی و میژوویی هاتە ژیر باس، تا بلێی پیاویکی بیر رووناك و شارەزا بە باروذۆخی رابردووی رووداوی سیاسی سەردەمی پاشایەتی و دۆستایەتی و هەلسوکەوتی لەگەڵ کاربەدەست و ناودارانی ئەوسا بەتایبەتی هی کورد هەبووە.

# پێشەکی دانەر

ڕەنگە کەم نەتەوەی زیندووی وەك گەلی كورد هەبێ کەلەم چاخ وسەردەمە نوێیەدا بۆی نەڕەخسا بێ بە ئاوات و ئامانجی خۆی بگات، ئەم میللەتە گەلێ سەرۆك و سەردارو سەرکردە و ئەدیب وشاعیری بەرزی لێ پاشەکەوت بووە، لەسەر مێژوو و بیری مرۆڤایەتی دا کاریگەر بوون، گەلێ شۆڕش و ڕاپەڕین و بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی لە ولاتە جیاکانی لێی نیشتەجێ بوون بەرپا کردووە، جارەهاش دووچاری داپلۆسین و چەوساندنەوە و دەردەسەری بوون.

زۆر خۆم بە بەختەوەر دەزانم کە ئەم کتێبە سادەیەم پێشکەشی ئەم نەتەوەیە و ڕۆڵەو مرۆڤەکانی بکەم، کەوا بە خۆشەویستی و دۆستایەتییان لە بەغدا و لەندەن شاد بووم، لە پێش هەموویانەوە ئاشنای سەروەرم خوالێخۆش بوو"تۆفیق وەهبی بەگ " و وەزیری مەردی کوژراو"سەعید قەزاز"...

میر بەسری

لەندەن ١٩٩١

# چاو پیاخشاندنێك لەسەر گەلی كورد

نەتەوەی كورد لەناوچەكانی توركیا و ئێران وعێراقدا[1] بلاّوبوونەتەوە و هەندێ ئیماراتیان لە باكوری عێراق دا دامەزراندووە، لەوانە ئیماراتی سۆرانیەكان كە لە ناویاندا محەمەدی پاشای ڕەواندوزی ناسراو بە "میری كوّرە" ناوبانگی دەركردبوو،حكومەتی عوسمانی لە ساڵی (١٨٣٦)دا ئیماراتەكەی لەناوبرد، لە هەمان ساڵدا توركەكان ئیمارەتی بادینانیشیان نەهێشت، بەلاّم گرنگترین ئیمارەتەكانی كورد ئیمارەتی بنەماڵەی بابان بوو لە سلێمانی كە ١٨٠ ساڵ زیاتری خایاند، لەسەرەتاوە بەشێوەی ئایینی سەری هەڵداوە، دامەزرێنەرەكەی باباسلێمان كوڕی فەقێ ئەحمەد باپیرە گەورەی بنەماڵەی بابان بوو، كە لە ساڵی (١٦٧٥) كۆچی دوایی كردووە.

كوڕ و نەوەكانی لە خانەوادەی بابان جێگایان گرتۆتەوە و فەرمانڕەوایی سلێمانی یان كردووە... ناودار ترینیان خالید پاشا( ١٧٣٢_١٧٤٢ ز)، عەبدولڕەحمان پاشا (١٧٨٩_١٨١٣ ز) و مەحمود پاشا (١٨١٣_١٨٣٤ز) بوو كەوا موقیمی بەریتانی لە بەغداوە چۆتە سەردانی و لە یاداشتی گەشتەكەیدا باسی كردووە.

دووا میری بابان ئەحمەدپاشا بوو (١٨٣٨_١٨٤٧ ز) توركەكان فەرمانڕەواكەیان لە ساڵی ١٨٤٧ نەهێشت و ڕەوانەی ئاستانەیان كرد و عەبدڵلاّ پاشای برایان لە شوێن دانا، پاشان ئەویشیان لە ساڵی(١٨٥١ز) لابرد و فەرمانبەرێكی توركیان لە جێگا دانا.

دوای ئەمە پیاوانی بنەماڵەی بابان پلەو پایەی بەرزیان لە حكومەتی توركی و پاشان لە حكومەتی عێراقی پێ دراوە.

گەلی جار خێڵ و هۆزەکانی کورد لە حکومەتی تورکی هەلگەراونەتەوە، بەتایبەتی عەشیرەتەکانی (میللییە) لە سوریا بە سەرۆکایەتی ئیبراهیم پاشای کوری محەمەد(میللی)، لە عیراق یش بارزانیوهۆزی هەمەوەند.

شەریف پاشا سالی١٩١٩ چۆتە کۆنگرەی ئاشتی لە ڤرسای، ویست و داخوازیەکانی گەلی کوردی پیشکەش کردووە. پەیمانی "سیڤەر"سالی ١٩٢٠ بەسترا، مافی کوردی تیدا رەچاوکرا ، بەلام پاش سی سال بە پەیمانی "لۆزان" گۆردراو کوردەکان لە ٥ی شوباتی سالی ١٩٢٥ شۆرشیان لە ناوچەی ئورفەو دیار بەکر بە سەرۆکایەتی شیخ سەعید نەقشبەندی بەرپا کرد[٢]، بزووتنەوەکەیان پەرەی سەند و کوردەکان چەند گوندیکیان سوتاند، هەندێ کۆمەلی کۆنەپەرست لە (ئەنقەرە) کە لە سیاسەتی مستەفا کەمال پاشا (ئەتاتورک)ی عیلمانی قایل نەبوون پشتگیری کوردەکانیان کرد. حکومەتی تورکی بایەخیکی زۆری بە مەسەلەکەدا، یاسایەکی تایبەتی لە ئەنجومەنی نیشتیمانیدا دەرچواند، دەسەلاتیکی بەرفراوانی بۆ لە ناوبردنی شۆرشگیران پیدرا، دادگای سەربەخۆیی دامەزراند، لە نیسانی ١٩٢٥ شۆرشەکەیان دامرکاندەوە، شیخ سەعیدیان گرت و حوکم درا، لە ٢٩ی حوزەیرانی هەمان سالدا لەگەل دوکتۆر فوئاد بەگ و چل و شەش کەسیتر لە سیدارە دران، حکومەتی تورکی بەتوندی و درو چەتوونی کەوتە داپلۆسینیان .. لەگەل ئەوەشا کوردەکان دووبارە لە سالانی ١٩٢٧و١٩٢٨ راپەرین و هەلگەرانەوە .

دوای جەنگی دووەمی جیهانی کۆماری مەهاباد بەسەرۆکایەتی قازی محەمەد راگەیەندرا. نزیکەی یازدە مانگی خایاند، کاتی هیزی سۆڤیەتی کشایەوە حکومەتی ئیرانی کۆمارەکەی لە ناو برد و قازی محەمەدی لە ٣١ی ئازاری ١٩٤٧ لە سیدارەدا، بەلام لە عیراق شۆرشەکانی کورد بە سەرۆکایەتی شیخ مەحمود تینی سەند، پاشان بەسەرکردایەتی شیخ ئەحمەدی بارزانی و مەلا مستەفای برای. دەبی ئەوەش بگوتری: تاکە هەولیك کە بۆ دامەزراندنی دەولەتیکی یەکگرتووی کوردی درابی ئەویش لە سەر ئەنجامی جەنگی یەکەمی جیهانی کاتی بەستنی پەیمانی "سیڤەر" بوو "غوستاف غوترو" لە کتیبەکەیدا لە ژیر ناوی (فەرەنسا لە سوریاو کلیکیا)دا کە

**سـالی ۱۹۲۰ دەرچـووە دەڵـی: لـە ئاکـامی تیکشـکانی تورکیاوداگـیر کردنـی ناوچـەی کلیکیـا و بنکـەی ئەتەنـە لـە لایـەن فەرەنسـە و ئینگلتـەرەوە، تورکـەکان کەوتنـە جموجـۆڵ و هـاندانی سـەرۆکەکانی کـورد لـە ناوچـەی مـاردین و دیاربـەکر بـۆ داواکـاری سـەربەخۆبوونی کوردسـتان، سـولەیمان نـەزیف کـە لـە رەگـەزی کـوردی دیـار بـەکرە و عـەبدوللا جـەودەت و هیـتر لـە پیشـەوای ئـەو بـیرووراو و داخوازیانە بوون.**

**شاعیر و ئەدیبانی کورد هەمیشە شانازی بەزمان و نەتەوەکەی خۆیان دەکەن، شیخ رەزای تالەبانی هەلبەستیکی لە ژیر ناوی (خاکی بابان) داناوە باسی شکۆداری بابان و پایتەختەکەیان دەکاودەلی:**

لە بیرم دی سولەیمانی کە دارلمولکی بابان بوو
نەمەحکومی عەجەم نە سوخرەکیشی ئالی عوسمان بوو
لەبەر قاپی سەرا سەفیان دەبەست شیخ و مەلا و زاهید
مەتافی کەعبە بوو ئەربابی حاجەت گردی سەیوان بوو
لەبەر تابووری عەسکەر ری نەبوو بۆ مەجلیسی شا؟
سەدای مۆسیقە و نەققارە تا ئەیوانی کەیوان بوو
دریخ بۆ ئەو زەمانە، ئەو دەمە، ئەو عەسرە ئەو رۆژە
کە مەیدانی جریت بازی لە دەوری کانی ئاسکان بوو

**پاشان دەلی:**

عەرەب ئینکاری فەزلی ئیوە ناکەم ئەفزەلن ئەمما
سەلاحەدین کە دنیای گرت لە زومرەی کوردی بابان بوو

**شاعیرانی ئەم دوایـەی نەتـەوەی کـورد پـیرەمیرد و فایـەق بیکـەس و عـەبدوللا گۆران ناوبانگیـان دەرکـرد، پـیرەمیرد هـەزار پـەندی کـوردی هۆنیوەتـەوە، چـیرۆك و داسـتانەکانی زینـدوو کردونەتـەوە، بـەجوانی وەسـفی سروشـتی چـاو ئـەندازی ئەفسوناوی کوردستانی کردووە.**

**ئەمین زەکی بە تۆمـارکردنی میـژووی سـلیمانی ولاتـی کـوردی و سـەربوردەی پیاوانی خـەریك بـووە، رایسـپاردووە چـەند دیـرە شـیعریَ لەسـەر گۆرەکـەی نـەقش بکری، ئەمەش واتاکەیەتی: "ئەگەر بەچاوی خۆم سەرفرازی و ئازادی گەلەکەم نەدی بزانن رەوان و گیانم تا رۆژی قیامەت لە ژیر باری خەما دەنالینی، گەر حـەز بکـەن گیانم ئارام و شادمان بیت دەبی لاوانی کورد بینە کۆری خەبات و تیکۆشان". بەلام تۆفیق وەهبی کاری بەرز و پر سوودی میژوویی بۆ کورد بـە جیـهیناوە، ریزمـانی زمانەکەی داناوە، وەسیەتی کردووە تەرمەکەی ببـەن لەقـەد چیـای پیرەمـەگرون لـە دۆلی جوانرۆ بنیـژن بۆ ئـەوەی گیـان و رەوانـە گەراوەکـەی بـۆ هـەوارو نیشـتمانی دیرینی ئارامگربی.**

مستەفا پاشا یامولکی گوتوویەتی:

ئەترسم بمرم ئەی وەتەن نەبینم بەختیاری تۆ ؟

بنووسن با لەسەر گۆرم وەتەن غەمگین و من غەمگین ؟

ئەحمەد موختاری جاف دەلی:

"لە خەو هەلسن درەنگە میللەتی کورد خەو زەرەرتانە

هەموو تەئریخی عالەم شاهیدی فەزل و هونەرتانە

دەسا تیکۆشن ئەی قەومی نەجیبی بی کەس و مەزلوم

بە کورتی بیبرن ئەو ریگە دوورەی وا لەبەرتانە "

---

**(١)جگـە لـەو شـوینانەی کـە دانـەر باسـی کـردووە کـورد لـە روسـیاو سـوریاو لوبنـان وە بەشیوەیەکی کەمتر لە شوینانی تریش هەیە، لـەم دواییەشدا بـەهۆی باری نالـەباری کوردسـتان ژمارەیەکی زۆری کورد روویکردۆتە ولاتانی ئەوروپاو بە پەناهەندەیی لی نیشتەجی بوون.**

**(٢)لە٥ی شوباتی ١٩٢٥ شۆرشی شیخ سەعید لە تورکیا بەرپا بوو. (وەرگیر)**

بنج و بناوانی خیزانی بابانەکان نادیارە، فەرمانرەواییان لە بەشیکی گەورەی کوردستانی باکوری عیراقدا کردووە، بە پیی داستان و چیرۆکە لیکجیاکان کە دەیگیرنەوە زۆرترینی بەلای ئەندیشەو خەیالەوە چوون، میژوونوس محەمەد ئەمین زەکی بەگ لە کتیبەکەیدا "میژووی سلیمانی "کە محەمەد جەمیل رۆژ بەیانی وەریگیراوەتە سەر زمانی عەرەبی، ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە گوایە :دەولەتی عوسمانی هەندی زەوی و زاری لە ناوچەی پشدەر بۆ فەقێ ئەحمەدی باپیرە گەورەی ئەو خیزانە دابریوە. ئیتر لەویجلەوی فەرمانرەوایی پشدەر و مەرگە و ماوەت و سەردەشتی گرتۆتە دەست ، کاتێ ژیان بەجێ دەهیلیت باباسلیمان (سلیمان بەبە) کوری بووبی یاخود نەوەی لە ١٦٧٠ ز جیگای گرتۆتەوە و توانیویەتی دەسەلاتی خۆی بەر فراوان بکا بۆ ناوچەی کەرکوك و لەگەل (متسرف)ەکەی دلاوەر پاشا جەنگاوەوبەسەریدا زال بووە، سلیمان بەتەواوی خۆی چەسپاند، کاروباری ئیمارەتەکەی ریك خست، توانی بەسەر هیرشەکانی کە لە بەغداوە بۆی هاتووە سەر کەوی، پاشان حکومەتی عوسمانی سالی ١٧٠٠بە سوپایەکی مەزنی بی شومارەوە کە لە هیزی دیار بەکر و حەلەب و بەغدا پیك هاتبوو هەلی کوتایە سەری ، ناچاری خۆ بە دەستەوەدان بووە، ناردوویانەتە ئاستانە ،زۆری پی ناچی_ئیمارەتی سنجق بابان _ ی پی دەبەخشن کە پایتەختەکەی گوندی قەلاچوالانە.. دەشبی سەر بە پاریزگای کەرکوك بووبی... کە سلیمان بەگ سالی ١٧٠٣ کۆچی دوایی دەکات و ولاتەکەی تووشی شلەژان دەبی، حکومەتی عوسمانی جلەوی کاروبارەکەی دەگریتە دەست —متسلم— دەکەن بەکارگیری و دەیخەنە سەر ناوچەی شارەزوور، پاشان یەك لە رۆلەکانی خیزانی بابان، خانە محەمەد پاشا پەیدا دەبیو دەتوانیت سالی ١٧٢١ ئیمارەتی بابان بژینیتەوە، شەرو شۆرو کوشتاریکی زۆر لە نیوان والی بەغدا و ئەحمەد پاشا و ئیرانیەکان روو دەدا، سوپای عوسمانی لە ١٧٢٥ دا شاری هەمەدان داگیر دەکات، خانە پاشای لی دەکەن بە والی. بەلام ئیرانیەکان سەرلەنوی سەرکەوتن بەدەست دینن، خانە پاشا دەبیتە والی ئەردەلان، خالید پاشای برای جلەوی کاروباری ئیمارەتی بابان دەگریتە دەست، شەر لە نیوان عوسمانی و فارسەکان

نەپسـایەوە، ئیرانیـەکان سـەلیم پاشـای کـوری بـەکر بـەگ دەکـەن بـە فـەرمانرەوای (قەلاچوالان)، بەلام نـەیتوانی خۆی بەرامبـەر سوپای والی بـەغدا سلیمان پاشا-ئـەبو لەیلە-رابگری و هەریمی بابان داگیر دەکات، سەلیم پاشا هـەلدی، سولەیمان پاشای کوری خالید پاشا سالی ١٧٥٤ دەکەن بە میر.

سولەیمان پاشای بابان وەك ئەمین زەکی دەلی:پیاویکی خواناس و مەردودلیرو توندو بەزەبرو زەنگ بوو، شوین متمانەی والی بەغداش بووە، ناوچەی کۆیـە و حـەریر و زەندئابادی خستە سەر فەرمانرەواکەی، لەو باج و خەراجەش خۆش دەبێ کە بریار بووبیدریتی، تا بتوانێ کەرەستەی پیویست و چەك و تفاقی سوپای بابانی پـی دابین بکات، فەرمانرەواکەی نزیکەی یـازدە سالی خایاند و لـە مـەزنترین میرەکـانی بابـان دەژمیردرێ. سوپاکەی هەردەم بۆ کۆمەکی و یارمەتی والی بەغدا لە کاتی پیویست و تـەنگاویدا ئامـادە بـووە، کـە والی بـەغدا سـلیمان "ئـەبو لەیلـە" دەمرێ -١٧٦١- عـەلی پاشا جیگای دەگریتـەوە، ئـەم والیـە داوای ئـەو باج و خەراجـەش لـە سلیمان پاشای بابان دەکاتـەوە کـە لـە سـالانی رابوردوو لەسـەری کۆبووەتـەوە... دووبـەرەکیش لـەناو ئەندامانی خیزانی بابان روودەدات.

سلیمان پاشا لەرووی حکومەتی بەغدا رادەوەستی، سوپاکەی نشوستـی دینـیو هانا دەباتە بەر کەریم خانی زەند لە ئیران، والی بـەغدا سـالی ١٧٦٢ ئەحمـەد پاشای برای سلیمان پاشا دەکاتە میری بابان، بۆ سالی ئایندە والی بەغدا سوپایەك بۆ گرتنی عەشیرەتی (کعب) کۆ دەکاتەوە، داواش لە ئەحمەد پاشا دەکا لە تـەکیا بـروا، سلیمان پاشا بە دیارنەبوونی برای لە ئیمارەتەکەدا بەهەل دەزانـێ و هەلمـەت دەباتـە سـەر قەلاچوالان و داگیری دەکات، بەلام کە ئەحمەد پاشا لە شـەری (بن کعب) دەگەریتـەوە ئیمارەتەکەی لی دەستینیتەوە، والی بـەغدا عـەلی پاشـا لـە سـالی ١٧٦٣ دا دەکـوژری و عومەر پاشا دیتە جیی و دەستبەجی سلیمان پاشا بۆ هـەریمی بابـان دەگەرینیتـەوە : کۆیە، حەریر، هەولیر، ئالتون کۆپری، قەرەحەسەن، زەندئابادو بەدرەو جەسان _ی بۆ دەخاتـە سـەر ئیمارەتەکـەی، بـەلام سـلیمان زۆر بـە ئیمارەتەکـەی شـادمان نابـێ، لـە شیرین خەودا لـە مالی خۆیدا دەکوژری، محەمـەد پاشای بـرای لـە ١٧٦٥ دا جیگـای

دەگریتەوە، ئیمارەتی بابان کەوا ۱۸۰ سالی خایاند میژوویەکی پر لە هەرا و ئاژاوە و پشیوی عەشیرەتگەری و شەرو ناکۆکی نیوان بەغداو ئیرانی دراوسیو ململانیو رکەبەری دریژ خایانی نیوان ئەندامانی خیزانەکە هەمیشە لە هەلکشان و داشکان دا بووە، چوونە سەر کارو فەرمان، لابردن و لیکەوتن، ملکەچی و یاخی بوون؛ زۆر کاریان کردبووە سەر بارودۆخی ئیمارەتەکە. میرەکان سوودیان لە هەل و دەرفەتی بەرەنگار بوونی بەردەوامی عوسمانی و ئیرانی بینیوە، بە هەرحال و باریك هیزیکی سوپایی ئەوتۆبوو کە حسابی بۆ بکری، گەلی جار والی بەغدا داوای کۆمەك و یارمەتی لی کردوون و هانایان هیناوەتە بەریان بۆ تەمبی کردن و داپلۆسینی عەشیرەتە سەر پیچکەر و یاخی بووەکان، یاخود بۆ جەنگی ئیرانی پەنای بردۆتە بەر سوپاکەیان ...

محەمەد پاشا لایەنگری ئیران بوو، دەکەویتە نامە ناردن بۆ شای ئیران، کەریم خانی زەند، عومەری پاشای والی دلی لیدەرەنجی، مەحمود پاشای لە جی دادەنی، ئەویش دەچی ئەحمەد پاشای برای کە لە قەلای سروچیك بەند کرا بوو رزگار دەکات و بۆ ئیمارەتەکەی دەنیریتەوە، پاشان بۆ جاری دووەم محەمەد پاشا دیتەوە سەر حوکم.

حکومەتی عوسمانی سالی ۱۷۷٦ بریاری جەنگی لە سەر ئیران راگەیاند، سوپا لە دیاربەکرو ناوچەکانی تر بەرەو بەغدا کشا، بەلام لەم ئانەدا تاوانی فیتنەگەری خرایە پال عومەر پاشاو لیان خست لە دووایشا کوژرا، کەریم خانیان دلنەوا و رازی کرد، فەرمانرەوایی درایە عەبدولا پاشا، لە دووسالی زیاتر نەخایاند، حەسەن پاشای والی کەرکوك بووە جینشین، سالی ۱۷۷۷ ئەحمەد پاشا دووای شەری ئیران بۆ دووەم جار دەگەریتەوە سەر ئیمارەتەکەی، ئەمین زەکی بەگ دەلی: والیەکانی عوسمانی لە سوپای ئینکیشاری دلنیا نەبوون و سوپای کۆلمەندی (المملوکی) نوی بوو، ریك و پیك نەبوو، لەبەر ئەوە پیویستیان بە یارمەتی هیزی شارەزوور دەبوو، هەر کە ناچار دەبوون داوای کۆمەکیان لی دەکردن و دەلی: سوپای بابان بایەخی یەکجار زۆری پیدرا بوو، راهیندرا بوو لە سەر بەرزترین شیوازی مەشق و راهینانی

جەنگی، ژێر دەستەی دەسەلاتی بنەماڵەیەکی خانەوادەی فەرمانرەوابوو، چەکدار و پرچەك کراو هەر دەم ئامادەی کۆرو مەیدانی جەنگ بوو، گەلی لە سوپای هاوچەشنی ئەوسای عیراق بەرزتر بوو، پۆشتە و پەرداخ بوو، میر و سەرکردەکانی سوپا جل و بەرگی ئاوریشم و نایابیان لە ناو شار لەبەر دەکرد، کەرەستەو شتومەکی نەخشکراو، رەخت وجبەخانەی زۆر و گران بەها.

ئەمانە هەمووشکۆداری وقەشەنگی دابووە شانشینەکەیان، بەلام سەرەرای ئەم هەموو رووکەشی و تواناوهێزەشیان رووداوی داگیرساوی بەردەوامی ناو خۆیان، هەر جار ناچاری هێنانی هێزی بیگانە بۆ دەست خستنە ناو کاروباری ولاتەکەیان، ئەمە وای لێ کردبوون کە گومان لێ کراوبن، داخۆ سەر بە چ لایەك و ژێر دەسەلاتی کام حکومەت بن، تەنانەت ئەو هێزەشیان بوو بە سەرچاوە و هۆیەکی گەورە بۆ گەف و هەرەشەی سەر حکومەتەکەی خۆشیان.

ئەحمەد پاشا دەمرێ و مەحمود پاشا جێگای‌دەگرێتەوە، سلیمان پاشا سالی ١٧٨٠ بە والیەتی بەغدا دادەمەزری، مەحمود پاشا پێنج سەد سواری بە سەرکردایەتی عوسمان بەگی کوری بۆ دەنێری، بەرهەلستکارانی والی لە ناو دەبەن، سولەیمان پاشا کە بە گەورە ناسرا بوو لە مەزنترین والیەکانی مەمالیك بوو، بیست و دوو سال فەرمانرەوایی بەغدای کردووە، ئەم والیە گومان لە مەحمود پاشا دەکاو لە میرایەتی دەخات، ئیمارەتەکە لە سالی ١٧٨٢ بە حەسەن پاشا کوری خالید پاشا دەسپێردری،پاشان زۆری پێ ناچی مەحمود پاشا ئاشت دەکاتەوە ودەیهێنێتەوە سەر تەختی فەرمانرەوایی، لە سالی داهاتوودا دووبارە لای دەباتەوە، ئیبراهیم پاشای کوری ئەحمەد پاشای برازای دەکاتە جێنشینی. ئیبراهیم پاشا ماوەیەك ژیانی لە بەغدا بەسەر بردبوو، لە ژیانی شارستانیەتی و رابواردنەکەی راهاتبوو لای گران بوو لە گوندێکی پەرپوتی وەك قەلاچوالان بژی، سالی ١٧٨٥ هەستا لە تەنیشت دیی مەلکەندی کەوتە خانووبەرە دروست کردن، سەرای حکومەت و مزگەوت و بازارو حەمام و میوانخانەی لێ بنیات نا، ناوی لێنا (سلیمانی)[1] لە ریز بادی ناوی سولەیمان پاشای والی بەغدا، لە سالی ١٧٨٧ ئیبراهیم پاشایان لێ خست، عوسمان

پاشایان لە جی دانا، ئەمەشیان بە فەرمانی والی ژەهـری دەرخـوارد درا و مـرد، بـۆ ماوەیـەکی کـەم ئیبراهیم پاشـایان گـەراندەوە ئیمارەتەکـەی، پاشـان لـە ١٧٨٩ لایـان بـردەوە، عـەبدول رەحمـان پاشـای لـەجێ دانـرا، بـۆ جـاری سـێیەم ئیـبراهیم پاشـا گەریندرایەوە سەر تەختی فەرمانرەوایی، هەتا سالی ١٨٠٣ لە موسڵ سەری نایـەوە، بۆ دووەم جار عەبدول رەحمان پاشا هاتـەوە سـەر کار، والی بـەغدا عـەلی پاشا؛ داوای کۆمـەك و بەگـەڵ کـەوتنی سـوپاکەی لـێ دەکـات بـۆ مەبەسـتی سـەرکوتکردنی وەهابیـەکان کـە بەسـەر شاری بەسرەیان دا دابوو، سـوپای بابـانی گەیشـتە (احسـا) هەرچەندە سەدان جەنگاوەر و سەربازیان لەبەر گەرما و تینوویتی گیانیـان لـە دەست دا، بـەلام شـەری شیرانە و کاری دلیرانـەیان ئـەنجامدا، کاتـێ عـەبدول رەحمـان پاشـا دەگەریتـەوە سـەیر دەکا والی بـەغدا لەبـەر هـەندی کاروباری نـا بـەدل کـە هاتۆتـە کـای گـۆراوە و نیـازی خراپـەی هەیـە، بۆیـە ئـەویش لیـی هەلگەرایـەوە و خـۆی بـۆ دەستەوکەری ئامادە کرد.هانـای بردەبـەر حکومـەتی ئیرانی، والی بـەغدا بـە خـۆی و سوپاکەیەوە بەرەو کەرکوك بەری کەوت عەبدول رەحمان پاشاش خۆی لـە دەربەندی بازیان قایم کرد. بەلام کاتی سەیری هیزی سوپای دوژمنی کرد گەرایـەوە سلیمانی، بـەلام لـە شـەرەکە شکاو خالید پاشا برای ئیـبراهیم پاشـای لـە شـوین دانـا (١٨٠٥) پاشان بۆ جاری سییەم عەبدول رەحمان پاشای گەراندەوە میرنشینیەکەی (١٨٠٦).

لـە سالی ئایندەدا والی عـەلی پاشا دەکوژری، سلیمان پاشا ناسراو بـە "بچـوك" دەکری بە والی، عەبدول رەحمان پاشا سەر پیچی دەکاو لیی یاخی دەبی، والی بۆ سەر کوتکردنـی کەوتـەرێ، هەردووسوپاکە لـە دەربـەندی بازیـان بـەرنگاری یـەکتر دەبـن، عەبدول رەحمان پاشا دەشکێ و بەرەو سنووری ئیران هـەلدی، سلیمان پاشا کوری ئیبراهیم پاشـای لـە ١٨٠٨ کردە میری سلیمانی، زۆری نـەخایاند بـۆ جـاری چـوارەم عەبدول رەحمان پاشا کرایەوە بە میر، عـەبدول رەحمـان پاشا بـەخۆی و سوپاکەیەوە بۆ پشتگیری لی کردنی دەچی.

نیردراوی ئاستانە (حالت ئەفەندی) بۆ لادانـی سلیمان پاشای والی کـە لاساری لـەناردنی باج و خـەراجی بۆ سولتان کردبوو، شـەر لـە نیوان ئـەم و والی لـە دەرەوەی

بەغدا روودەدا، والی لە ریی گەرانەوەیدا بۆ پایتەختەکەی دەکوژری، عەبدول رەحمان پاشا داوای لە حکومەتی ئاستانە کرد کە بیکەن بە والی، خواستەکەی نەهاتە جی بەلکو لە میرایەتیشیان خست.

بۆ جاری دووەم کاروباریان بە خالید پاشای کوری مامیان سپاردەوە، لە (١٨١١) بۆ جاری پینجەم عەبدول رەحمان پاشا گەرایەوە سەر تەختی فەرمانرەوایی، لە (١٨١٢) زۆری نەخایاند لییان خستەوە و خالید پاشایان گەراندەوە، ئیتر عەبدول رەحمان پاشا لە شکری کۆکردەوە و بەرەو بەغدا کشا، لە کفری لەگەل سوپای والی عەبدوللا پاشا بە گژ یەکدا چوون، لە شەرەکەدا تیکدەشکی و بە بیست سواری دەست و پەیوەندی تایبەتی خۆیەوە هەلدی و روودەکاتە ئیران.

بۆ جاری سییەم خالید پاشا فەرمانرەوایی بابان دەگریتەوە دەست، دیسان بۆ جاری شەشەم عەبدول رەحمان پاشا سەبارەت بە هەرەشەی عەلی میرزا جیگری شای ئیران پایەکەی پیدراوە، دوای سالیك مەرگ جیهانی پی بەجی دیلی، ئەمین زەکی بەگ دەلی: بیگومان عەبدول رەحمان پاشا لە گەورە و سەروەرترین میرەکانی بابان بوو چاو نەترس و ئازاو هۆشمەند بیرو ووردبین بوو، هەرچۆنیك بی مەرج و مەزایەی فەرمانرەوایی لی هاتبووە جی، بەلام خیانەتکاری و هەلپەرستی و دوو روویی و خۆ گۆرینی خزمەکانی، تەلەکە بازی والیەکانی بەغدا، نامەردی میرەکانی ئیران، دژایەتی باری هەلکەوتەی جوغرافیای ولاتەکەی، هەراو ئاژاوەکانی کە لە ناوچەکەدا بەرپا دەبوون، ئەمانە هەمووی بونەتە کۆسپی نەهاتنە دی ئاواتەکانی_لەبەر ئەوانەی کە باسمان کرد_ پیاویکی خواناس و ریزگری کاروباری ئایینی و زانا پەروەر بوو، ئەو پەری گیان و هەستی نەتەوە پەرستی تیدا بوو.

نزیکەی بیست و چوار سالی پچرپچر فەرمانرەوایی ئیمارەتی بابانی کردووە، لەبەسەر هات و رووداوە گەورەو بچوکەکانی ئەو ماوەیەدا لە ئەندازە بەدەر بەهرەو توانای بەدەرخستووە، میستەر ریچ دەلی: عەبدول رەحمان بۆ دەربازبوونی لە والیەکانی بەغدا کەوا میرەکانی بابانیان کردبووە داردەستی

خۆیـان چۆنیـان بویسـتبارایان دەپـەراند، لییـان دەخسـتن و دەیانکردنـەوە مـیر و فەرمانرەوا، ئەو هەولی دەدا ئیمارەتەکەی راستەوخۆ ببەستیتەوە بە (بابی عالی) لـە ئاستانە.

میسـتەر ریـچ دەلـی: حـالت ئەفـەندی زۆری لەگـەل عـەبدول رەحمـان پاشـا کـرد والیـەتی بـەغدا قبـوڵ بکـات. بـەلام نـەی کـرد ووتـی: شـتیکی باشـە ببمـە وەزیریکـی پایـە بـەرز بـەلام کـەژ و کیـوی سـەر کەشـی بـەفر گرتـووی نیشـتمانم لام بەرزترو گران بەهاترە.

---

(١)میـژوو نوسـان بـەلای ئـەوەوە چـوون کـە شـاری سـلیمانی بـەناوی (بابـا سـلیمان) باپـیرە گەورەی بنەمالەی بابان و دامەزرینەری ئیمارەتەکە کراوە.(وەرگیر)

# ئیمارەتی مەحمود پاشا

لە ئاکامی کۆچی دوایی عەبدول رەحمان پاشا لە (١٨١٣)دا رای هەموو لایەك هاتە سەر ئەوەی کوری مەحمود پاشا ببیتە جی نشینی، لەو کاتەشدا حکومەتی بەغدا بەهۆی سەر گەرمی گەنجایەتی سەعید پاشای والی توشی ئالۆزی و شلەژانی هاتبوو، وەللاش زاواکەشی دەفتەردار داود ئەفەندی دوایی بوو بە "داود پاشا" لیی یاخی دەبی، لەگەل دەست و پیوەندەکانی بەغدا بەجی دیلی و روودەکاتە کوردستان، مەحمود پاشا بانگ هیشتنی بۆ چوونە سلیمانی لی دەکات و پیشوازی و بەپیرەوە چونیکی گەرم و بالایان بۆکرد، داود چل رۆژ مانەوەیان لە سلیمانی لەگەل مەحمود پاشا و پیاوەکانی بۆ کەرکوك بە ری کەوتن، چەند لە ریگا بەرەو پیش دەرۆیشتن لایەنگریان زۆرتر دەبوو، لە کۆتایی شوباتی سالی ١٨١٧ گەیشتنە بەغدا، دوای ئەوەی سەعید پاشا دەکوژری... داود لەسەر تەختی والیەتی دادەنیشێ، مەحمود پاشا لەترسی هەرەشەی حاکمی کرماشان لە داوود پاشا هەلگەرایەوە، ئاژاوە لە نیوان هەردوو حکومەتەکەی بەغدا و ئیران بەرپا دەبی، پاشان جەنگ لەگەل حکومەتی عوسمانی هەلگیرسا، لەشکری ئیران کشا تا گەیشتە(دەلی عەباس) بەلام نەخۆشی رشانەوە قرانی بە سوپاکەی ئیران هینا، هەردوو لا ریکەوتن بەو مەرجەی عەبدوللا پاشا ببیتە میری سلیمانی. بەلام زۆری نەبرد مەحمود پاشا پاش ماوەیەکی کەم گەرایەوە ئیمارەتەکەی، لە سالی داهاتوودا (١٨٢٢) عەبدوللا پاشا دووبارە دەرپیەراندەوە و دەستی بەسەر ئیمارەتەکەدا گرتەوە.

# موقیمی بەریتانی بە کوردستاندا دەگەڕێ

کلۆدیـۆس جیمـس ریـچ بـە موقیمـی بـەریتانی لـە بـەغدا دادەمـەزرێ (١٨٠٨) دەمـەقالی و شـەرە ئاخـاوتنیك لـە نیـوان ئـەم و والی بـەغدا روودەدا، لـە ئازاری ١٨٢٠ بڕیاریدا گەشتیك بە کوردستان دا بکا، ئەو سەردانەشی لە کتیبەکەیدا لە ژیر ناوی"چیرۆکی نیشتەجیبوون لە کوردستان دا" تۆمار کردووە، دوای مردنی ژنەکـەی لـە سـالی ١٨٣٦ بـە چـاپی گـەیاندووە، ئـەم کتیبـەش بـهاءالدین نـوری وەریگیراوەتە سەر زمانی عەرەبی لە ژیر ناوی "رحلە ریچ فی العراق عام ١٨٢٠ " و لـە سـالی ١٩٥١ چـاپی کـردووە.موقیمـی بـەریتانی لـە گەشـتەکەیدا نووسـەرە فارسییەکەی "محەمەد کوری حوسین" ناودار بە "المنشیء البغدادی" لەگەل خۆی دەبا، هـەروەها گەشـتەکەی بـە زمـانی فارسـی بـۆ تۆمـار کـردووە. عـەباس عـەزاوی وەریگیراوەتەوە سەر زمانی عەرەبی و ناوی ناوە "رحلە المنشیء البغدادی" و لە سالی ١٩٤٨ بە چاپی گەیاندووە.

ریچ لە تشرینی یەکەمی ١٨٢٠ لەگەل "المنشیء البغدادی" سەردانی سلیمانی دەکـات و چـەندین جـار دیـدارو چاوپیکـەوتنی لەگـەل مـەحمود پاشـادا بـووە، لـە باسکردنی شارەکەشدا: ژمارەی دانیشتوانی بە دە هـەزار کـەس وخانووەکانیشی بـە ٢١٤٤ خەملاندوە ولەمانە ١٣٠ مالە جوولەکە و نۆ مال کلدانی و پینج مالْ ئەرمەنی بووە، پینج مزگەوت، کەنیسەیەکی بچوك، شەش ئوتیل و پینج گـەرماوی تیدا بـووە، لـە دەوروبـەری شارەکەشدا گەلی کەلاوە و خـانوی روخـاوی لی بـەدی کـردووە.لـەوی توشی پیاویکی پیری خەلکی گوندی دارشمانەی نیشتمانی خیزانی بابانەکان دەبی، چیرۆکی فەقی ئەحمەدی باپیرە گەورەیانی بۆ دەگیریتەوە، گوتویەتی: فـەقی ئەحمـەد لە دوژمنکاریەتی عەشیرەتی بلباس کە بەهیزترین عەشیرەتی پشدەرە بیزار دەبیو

روودەکاتە ئاستانە، خۆی تیکەل بە سوپاکەی دەکا، لەو کاتەشدا سولتان لەگەل (فرەنج) لە ناحەزی و شەرو جەنگدا بووە، فەقی ئەحمەد بۆ یەکیك لە سوار چاك و ئازاکانی فرەنج دیتە مەیدان و بە سەریدا زال دەبی و لە عاردی دەدا، کە سەیر دەکا ئەوا ئافرەتیکە جلی پیاوانی پۆشیوە، ئەم ژنە مارە دەکا، لەسەر خواستی خۆی سولتان ئیمارەتی گوندی دارشمانە و دەورووبەری پی دەبەخشی.. ئیتر لەگەل ژنە فرەنجیەکەی دەگەریتەوە گوندەکەی خۆی،دوو کوری لەو ژنە دەبیٚ، یەکیانی ناوناوە باباسلیمان و ئەویتریان بوداق کیغان، پاشان ژنەکە دوای ئەوەی هیرش دەباتە سەر بلباسەکان چواریان لی دەکوژری و بۆی دەردەچی و ودەگاتەوە ولاتەکەی خۆی، فەقی ئەحمەد بەدوایا دەچی و دەیدۆزیتەوە، دەیهینیتەوە پشدەر.

-منشیء البغدادی- دەلی: لە سلیمانی ٣٠٠ مالە جوولەکە، پەنجا مالە دیانی کلدانی و شەش هەزار مالە کوردی شافیعی لییەو دەلی: فەرمانرەواکان پاشاکانی بابانن، خەلکەکەی تریش کرمانجن، هەر چوار لای شارەکە بە چیا دەورە دراوە،دوو سەد گوندی لە دەوروبەرە، تەنیا خورماو نارنج نەبی دەنا هەموو جۆرە میوەجاتیکی هەیە، ئاوەکەی کاریز و کانیاوە، سوارەی بابان لە وولاتی_رۆم_دا بە ئازاو نەبەرد ناسراون.

ریچ باری نالەباری ئیمارەتی بابان و شاری سلیمانی دەردەخات و دەلی: یەك لە میرەکان پیی گوتم؛ حەسادەتی خۆ بەخۆیی میرەکان بۆتە هۆی نزمی و پەریشانیان، ئەگەر حەسوودی و رکەبەریان لە نیوان دا نەبوایە ئەوا حکومەتی عوسمانیو ئیرانی پییان نەدەویرا و نەیاندەتوانی بییان بەزینن، مەحمود پاشا پیی دەلی: گەشەکردن و راست کردنەوەی باری حکومەتی بابان زەحمەتە مەگەر خوا بۆ میرەکانی بابان دەردی تاعون بنیری تاکە کەسیکی لی دەربچی ئەوانیتر هیچیان هەلٚ نەبویری و هەموویان لەناوببا. ریچ میری لەبارەی ویران بوونی سلیمانی دوواندوە.

مەحمود پاشا بەداخ و حەسرەتیکەوە وەلامی داوەتەوە: ئەگەر پشویك بدەن و دەرفەتی ئاسودە و حەسانەوەیان ببی ئەوا ئاوەدانیان دەکردەوە و خانو بەرەی جوان

و قەشەنگیان لێ بنیاد دەنا، خۆ ئەگەر فەرمانرەواییەکەی کات و دەرفەتی مانەوەی زۆر بێ، ئەوا بۆ بەختەوەری و خۆشگوزەرانی خەلکەکە و بلاوکردنەوەی هیمنی و ئاسایش کاری دەکرد، بەلام کیشە و ئاژاوەی بەردەوام بۆتە هۆی کزی و کەسادی بازرگانی و ئیش و کار.

## دووا رۆژانی دەولەت

مەحمود پاشا بۆ جاری سێیەم فەرمانرەوایی سلیمانی گرتەوە دەست. عەبدوللا پاشا سالی ١٨٢٣ بۆ حاکمیەتی کۆیە گواسترایەوە، پاشان شەر لە نیوان مەحمود پاشا و محەمەد پاشای رواندوزی بەرپابوو، بەلام بابانی بە یارمەتی سوپای ئیرانی توانی بە تیکشکاوی بیانگەرینیتەوە.داود پاشای والی کەوتە ناحەزی دەولەتی بابان و هەول و تەقەلای لەناوبردنی دەدا. سوپایەکی بە سەرکردایەتی محەمەد پاشا کوری خالید پاشا بۆ بەگژاچوونیدا نارد، هەریمی بابان خاپورو ویران بوو، مەحمود پاشا بۆ پاراستنی حکومەتەکەی چاری ناچاربوو دیسان هانا بباتەوە بەر ئیران، پاشان کیشە و ناکۆکی لەگەل رەواندوزی پەیدا بۆوە. سلیمان بەگی برای مەحمود پاشا ئەوەی بە هەل زانی لە ١٨٢٧ سلیمانی داگیر کرد، مەحمود پایتەختەکەی بەجیهیشت، چووە قزلجە و دوایی بە ناچاری ئەم جارەش رووی کردەوە ئیران،حکومەتی ئیران بە هانای هاتو توانی بگەریتەوە سلیمانی و براکەی لێ دەرپەراند. بەلام سلیمان ملکەچی بار و ئەمری واقیع نەبوو، دووبارە بە یارمەتی داود پاشا هیرشی هینایەوە بۆ سەر برا گەورەکەی، شکاندی و وای لیکرد دیسان بۆ ئیران هەلیت، شەر لە نیوان دوو برا بەردەوام بوو، محمود پاشا پشتی بە عەباس میرزا جیگری ئیران و سلیمان ... لە دواییدا بۆ بوون بە "پاشا" پشتی بە والی بەغدا

دەبەست. لە ئەنجامدا محمود پاشا سەرکەوت و لە ١٨٣٠ گەرایەوە بارەگای فەرمانرەواکەی.

محەمەد ئەمین زەکی دەڵێ: ئەم شەرە بەردەوامەی نیوان دوو برا ئیمارەتەکەی لاواز کرد و هیزی لەبەر بری، ولاتەکەشی بەرەو ویرانی و کاول کردن برد. زیانی گیان و مال و سامان نایەتە سەر ژمارە، جلەوی کارو باری ولاتی بابان لە دەست میرەکانی بابان چووبووە دەر، دەسەلاتی حوکمرانی کەوتبووە ژیر دەستی ئیران و بەغدا، ئەو هیز و توانایەی کە لە سەردەمی عەبدولرەحمان پاشا هەیبوو گیانی بەغدای هەژاند بوو، تا ئەوەی کارو باری عیراق لە ژیر ئارەزووی میرەکانی بابان بەریوە دەچوو، ئیرانی تۆقاند بوو، کەچی لەم سەردەمەدا لەژیر دەستی چەند هەزار سەربازیکی شر و پەریشانی ئیرانی مل کەچ بوون، توشی نەهامەتی و ویرانکاری و نەبوونی و بی دەسەلاتی هاتن، گیچەڵ و فیتنە و ئاژاوە بوونی هەمیشەیی نیوان خۆبەخۆیی، میرەکانی بابانی کردبووە بلقی سەر ئاو. لەو کاتەش دا ئیمارەتی سۆران بەهۆی محەمەد پاشای رەواندوزی تین و هیزی سەند و تەواو پیشکەوتوو بوو، نەخۆشی تاعون لە هەموو ناوچەکانی عیراق و کوردستان و ئیران بلاوببۆوە، بەجاری وەك گەلاریزانی پایز خەلکی دادەوەراند، لەگەل ئەوەشا شەر لە نیوان مەحمود و سلیمانی برای هەر بەردەوام بوو، بەلکو گەرمتر بوو هەردووك بار تەقای یەکتر تا ئەوەی مەحمود ناچار دەبی لە ١٨٣٤ ولاتەکەی بەجێ بهیلی و بچیتە ئاستانە[1]، لەو کاتەدا دەولەتی عوسمانی توانی کۆتایی بە حوکمرانی مەمالیك بینی لە بەغدا، سوپاکەی ئابلوقەی شارەکەی دا بەسەر داود پاشادا زال بوو، جیگرە نوییەکەی عەلی رەزا پاشای والی لە ١٨٣١ بۆ ئاستانە راپیچ درا، رەواندوزی هەولیدا باری ئالۆزی ئیمارەتی بابان هەلیکی رەخساوی دەست بەسەرداگرتنی بی، والی بەغداو حکومەتی ئیرانی بۆ بەربەستی مەبەستی پاشای رەواندوزی ریك کەوتن کەوا پشتگیری سلیمان پاشای سلیمانی بکەن و لەسەر ئەوە ریککەوتن کە هیلی رانیەو زیی گچکە، سنوورو تخوبی نیوان هەردووئیمارەتەکە بی، لای راستی بۆ رەواندوزی و لای چەپی بۆ بابان، بەشی رۆژ ئاوای دەربەند بۆ حکومەتی رەواندوزو لای رۆژهەلاتی بۆ حکومەتی

سلیمانی بی، لەو کاتەش دا حەمە(محەمەد شەریف) سەرۆکی هەمەوەند کە بەئازاو جەربەزەو چەتوونی ناسرا بوو کەوتە بەربەرەکانی سلیمان پاشا، بەلام محەمەد شەریف لەنزیك سلیمانی دەکوژری، ئیتر دنیابۆ ئەو میرە بابانی‌یە ئاسودە و هیمن دەبی تاکو لە ١٨٣٨ کۆچی دوایی دەکات، ئەحمەد پاشای کورە گەورەی دەبیتە جینشینی، وەك محەمەد ئەمین زەکی دەلی: ژیرو هۆشمەند و لاوچاك بوو، هەندی ئارەزوومەندیتی زەبرو زەنگ و چوونە مەیدانی هەبوو، سوپایەکی مەزنی پرچەکی نوێی دامەزراند، ئۆردوگای لە دەرەوەی شار بۆ دانا. بەلام مەحمود پاشای مامی بە پشتیوانی سوپای ئیرانی دەگەریتەوە سلیمانی و داگیری دەکا، حکومەتی ئیرانی کەناچار دەبی هیزەکانی خۆی بکیشیتەوە ئەحمەد پاشا لە ١٨٤٢ دەگەریتەوە سلیمانی، ئەوەی شایانی باسە میری سۆران محەمەد پاشای رەواندوزی هیرشی بردە سەر یەزیدیەکان سەری لە دونان تا گەیشتە ناوچەی موسل، دەولەتی عوسمانی بریاری لە ناوبردنی دا، سوپایەکی گەورەی بە سەرکردایەتی والی سیواس سەردار رەشید محەمەد پاشای هەنارده سەری، فەرمانیش بە والی بەغدا و موسل-یش درا کە پشتگیری بکەن، بەر لەوەی بکەونە جەنگ و بەرنگار بوون سەردار رەشید محەمەد پاشا داوای سەرپیچی ویاخی نەبوونی لە محەمەد پاشا کرد.بەبی شەر خۆی بەدەستەوەداو رەوانەی ئەستەنبولی کرد، دوای ئەوە هەر چۆنی بووبی لە - ترازبوون- یان سیواس دەکوژری.. ئیتر ئیمارەتی سۆران سالی ١٨٣٦ لەناو دەچی، لە هەمان کاتیشدا ئیمارەتی عەمادیەش لەلایەن ئیسماعیل پاشا کوری تەیار پاشا کە لە عەلی رەزا پاشای والی هەلگەرایەوە ئابلوقەی ئامیدی داو ئەمیرەکەی گرت و بۆ بەغدای دوور خستەوە، بەم جۆرە ئیمارەتی ئامیدیش لەناو برا، ولاتەکەشیان خستە سەر موسڵ.

دوا رۆژانی ئەحمەد پاشا لە ئاشوب و شەرو شۆر بەدەر نەبوو کە محەمەد نەجیب پاشا لە ١٨٤٢لە جیگای عەلی رەزا پاشا بە والی بەغدا دانرا، بریاری لەناوبردنی ئیمارەتی بابانی داو خستیە سەر دەولەت و سەربازی تورکی لە ئۆردوگای شارەکە دانا، داوای لە ئەحمەد پاشا کرد بیتە بەغدا، لە سالی

**١٨٤٧براكەی كردە قایمقامی قەزای سلیمانی، والی گەورە نامیق پاشا سالی ١٨٥١ عەبدوللا پاشای لە قایمقامیتی خست و رەوانەی ئاستانەی كرد، بۆ ماوەیەكی كەم لە بنەمالەی بابان عەزیز بەگی لە جیگا دانا، پاشان میر لیوای سوپای عوسمانی ئیسماعیل پاشای كردە قایمقامی سلیمانی، بەمەش كۆتایی بە ئیمارەتی بابان هات.**

**عەباس عەزاوی لە كتیبەكەیدا "عشائر العراق الكردية_الجزء الثاني" لە ئەحمەد حەمدی بەگ بابان كوری محەمەد رەشید پاشا كوری سلیمان پاشا كوری خالید پاشا كوری خالید كوری بابا سلیمانی بیستووە و دەلی كەوا: سەرەتای ئیمارەتی بابان دیار نییە، بەلام میژووەكەی لەوەتەی سالی ١٤٩٥ هەتا لەناوچوونی لە ١٨٤٧ زاندراوە، میری ئیمارەتی بابان سلیمان پاشا سالی ١٨١٠ بەغدا_ی داگیر كردووە. دەلین گوایە لەگەل هۆزی بلباس و پشدەر دەچنەوە سەر خالید_ *ناویك_بەلام "ابا الثناء الالوسی"* ئەوە بەراست نازانیٚ، لە بنەمالەی بابان زۆر پیاوی هۆشمەند و ناودار دوای لەناوچوونی دەولەتەكەیان هەلكەوتن، پایەی بەرزو گەورەیان لە دەولەتی عوسمانی، دوای ئەوە لە حكومەتی عیراق لەسەردەمی پاشایەتیدا بەدەست هیناوە، لەوانە: موفتی بەغدا، فەیزی زەهاوی (نەوەی میر سلیمان پاشا) و كورەكەی جەمیل سدقی شاعیری گەورەی عیراق.**

---

**(١)لە ئاكامی بەردەوامی شەرو ناكۆكی ئەو دوو برا میرە، دانیشتوانی كەم بوونەوە، تاعونیش بۆتە سەری نەگبەتییەكە، كە (فریزەر) لەسەردەشتەوە بەرەو سلیمانی بەریٚ دەكەویٚ بە دریژایی ریگا گوند دیكی ئاوەدان بەدی ناكات، تەنانەت كە دەگاتە سلیمانی بە ناو كەلاوەی خانووی رووخاودا دەیبەن بۆ ئەو خانووە داتەپیوەی بۆی تەرخانكرابوو. بەرەیەك نابیٚ بۆی رابخەن!! سلیمان پاشاش لەكەناری شاردا لە ناو خیوەتیكی هەژارانەدا بیٚ هیچ دەبدەبەیەكی پاشایانە پیشوازی لەم میوانەدەكات، خەلك ئەوەندە هەژارو نەدار ئەبن كاتیك سەركردە ئیرانییەكە روو لە پاشای بابان**

دەنێ (٢٠٠) تمەنیان بۆ پێویستیەکانی ژیانیـان بـۆ پـەیدا بکـا، سـلیمان پاشـا بـەخۆی و هـەموو دەولەمەندەکانی سلیمانی ئەم پارە کەمەیان بۆ هەل ناسورێ!! "وەرگێر"

# ناودارانی
# بنەماڵەی بابان دوای نەمانی
# دەولەتەکەیان

## ئەحمەد پاشا

ئەحمەد پاشا کوری سلیمان پاشا دوا میری بنەماڵەی بابانەکان بوو، ساڵی ١٨٤٧ لە ئیمارەتەکەیان لادا، رەوانەی ئەستەنبولیان کرد، لە ١٨٥٦ کردیانە والی یەمەن، پاشان والی وان ١٨٦٣، جاریکی تر بە پایەی وەزیر دەیکەنەوە والی یەمەن ١٨٦٤ ، دوایی بە والیەتی دەگوازریتەوە بۆ ئەرزروم ١٨٦٧-١٨٨٠، دوای ئەوە دەبیتە والی ئەتەنە، لە کۆتایی ئەو ساڵەدا کۆچی دوایی دەکات.

کورەکانی: ئەحمەد پاشا، خەلیل خالید پاشا، میر لیوا مستەفا پاشاو عیزەت پاشا بوو.

## عزیزبەگ بابان

عەزیز بەگ کوری عەبدولرەحمان پاشای مامی ئەحمەد پاشای دوا میرەکانی بنەماڵەی بابانە. لە ئاکامی دامەزرانی عەبدوللا پاشا بە قایمقامی سلیمانی عەزیز بەگ لەگەل مەحمود بەگی ساحیبقران سلیمانی بەجی دیلن، لەگەل هەندی لە عەشیرەتی هەمەوەند بۆ مەبەستی بەگژداچوونی لەشکری عوسمانی ریك دەکەوی، هەردوو لەشکر لەنزیك کریچنەو دەربەندی بازیان بەرەنگاری یەکتر دەبن، مەحمود بەگ دوای ئەوەی هەمەوەندەکان وازی لی دینن لە دەورووبەری ساڵی ١٨٤٨ یا ١٨٥٠، لە کەرکوك دەکوژری، بەلام عەزیز بەگ لەبەربەرەکانی سوپای تورکی بەردەوام دەبی... تا لەو هات و هەرایەدا ئەویش لەناو دەچێ.

## عەبدوللا موسیب پاشا

بــرای هـــەره بچوکـــی ئەحمـــەد پاشـــایە، والی بـــەغدا دەیکاتـــە قایمقـــامی ســـلیمانی (١٨٤٧_١٨٥١)، پاشـــان دەینیرنـــە ئاســـتانە، دوای ئـــەوە بـــە پایـــەی بەریوەبەرایەتیـەکان دادەمـەزری؛ قایمقـام پاشـان موتەسـەریفی چلـدر ، عـرش، بـەنی غـازی و خـەربوت، دوایـی بـە پایـەی وەزیـر دەبیتـە والی بەسـرە (١٨٧٧)، کاروبارەکـەی دووسـال هەلسـوراندووە، پاشـان دەچیتـە بـەیروت، لـەوی لە ١٨٨١ کۆچی دوایی دەکات.

## محەمەد رەشید پاشا

کوری سلیمان پاشای کوری عەبدول رەحمان پاشایە، سالی ١٨٢٢ لە شاری سلیمانی هاتۆتە دونیا، فەرمانی بەریوەبەرایەتی لە ولایەتی بەغدا بینیوە، دووجار دەبیتە موتەسەریفی حیللەو مونتەفیك و موتەسەریفی تەعز (لە یەمەن ) و دیرزورە، پاشان بووەتە والی بەتلیس ١٨٨٢_١٨٨٦ دوای ئەوە لە ئاستانە نیشتەجی دەبی و لەوی لە ١٨٩٥ کۆچی دوایی دەکات.

یەعقوب سەرکیس دەلی: کە محەمەد رەشید پاشا موتەسەریفی حیللە دەبی، بە زەبرو توندو تیژی دەناسری تا ئەوەی پییان وتووە (خدیو) واتە ئەمیر. مولك و زەوی و زاریکی زۆری لەو لیوایەدا هەبووە.

## خەلیل خالید پاشا

کوری ئەحمەد پاشای دوا میرەکانی بابانە لە شاری سلیمانی بە دیل دەگیری، بۆ والی بەغدا نەجیب پاشای دەنیرن، ئەویش رەوانەی ئاستانەی دەکات و لەوی دەچیتە خویندگای جەنگی، بە ئەفسەر دەردەچێ، ماوەیەك دەبیتە مامۆستا پاشان بە وەرگیر لـە وەزارەتـی دەرەوە دادەمـەزری ١٨٧٣، دوایـی بـە نووسـەر دەگوازریتـەوە بـۆ بالیوزخانەی تورکی لە پاریس و لەندەن، بۆ ئاستانە دەگەریتەوە و دەبیتە ماموستای

ئـەمیر محەمـەد رەشـادی جـی نشـین"ولی العـهد"، دوایـی بـە دەسـت نیشـان کردنـی سنووری قەرەداغ ئیمارەتی "جبل الاسود"یان (مۆنتغرۆ) هەلساوە، دەیکەنە سەفیر لە شاری (جتینجە) پایتەختی ئەو ئیمارەتە، بە بالیۆز بۆ بولگراد دەگوازریتەوە، پاشان بۆ تەهران، نزیکەی دە سالی لی دەمینیتەوە، لە سالی ١٨٨٩ دەبیتە والی ئەتەنە بەلام لەوپایەدا دەست بەکار نابی، بەلکو بە والیەتی بەیروت دادەمەزری و نزیکەی دوو سالی لی بەسەر دەبا، لە سالی ١٨٩١ ، بۆ والیەتی قسطمونی دەگوازریتەوە بەلام بی پرس و را بەجیی دیلی و دەگەریتەوە ئاستانە و واز لە پایەکەی دینی بەلام "باب العالی" بەواز هینانەکەی قایل نابی.حکومەت لی ی دەکەویتە گومانەوە، لە ١٨٩٣ بۆ قەیسەری ئاوارەی دەکەن، لەوی دەمینیتەوە هەتا مەرگ لە ١٨٩٩ یەخەگیری دەبی.

محەمەد ئەمین زەکی دەلی: ئەو پیاوە ئەدیبیکی بەرزو بە توانا بوو، ئاگاداری حال و بارو نەریەتی ئەوروپا بووە، پینج شەش زمانی دەزانی و شارەزایی ئەدەبە کەشیان بووە.

## محەمەد شەریف پاشا

گەورە کوری سەعید پاشای کوری حوسین پاشای کوری ئەحمەد ئاغای بنەمالەی خەندانە، هەندی جار بە جەنەرال شەریف سەبری پاشا ناو براوە، سالی ١٨٦٥ لە ئەستەنبول هاتۆتە جیهان، چۆتە ناو سوپا، گەیشتە پایەی (فەریق_سوارە)، لە سالی ١٨٩٠ چۆتە خوازبینی(ئەمیرە ئامینە)ی کچی محەمەد عەبدول حەمید پاشا کوری محەمەد عەلی پاشا والی میسر کە دەکا خوشکی محەمەد سەعید حەلیم "صدر الاعظم "ی تورکی، ئەو خاتوونە سالی ١٨٦٨ لە قاهیرە لەدایک بووەو لە ئەستەنبۆڵ مارەیی براوە، لە ١٩٢٦ لە پاریس کۆچی دوایی کردووە.

شەریف پاشا لە سالی ١٨٩٨ بە وەزیری مفەوەزی تورکی لە ستۆکهۆلم دامەزراوە ... هەتا سالی ١٩٠٩ لەم پایەدا دەمینیتەوە، لە سالی ١٩١٣ تاوانی

بەشداربوونی لە کوشتنی مەحمود شەوکەت پاشای خراوەتە پاڵ. پاش ملە حوکمی لەسیدارەدانی بەسەردا دەدرێ، ناگەڕیتەوە تورکیا بەلکو هەر لە دەرەوە دەژیا هەتا لە سالی ١٩٤٤ کۆچی دوایی دەکات.

کە کۆنگرەی ئاشتی لە سالی ١٩١٩ لە پاریس دەبەستری، یاداشتیکی داواکاری مافی نەتەوەی کوردی بە هاوبەش بوونی (بوغوس نوبار پاشا)ی نوینەری ئەرمەن {١٨٥٨-١٩٣٠} پیشکەش کردووە. هەردوو نوینەرەکە لەسەر ئەوە ریککەوتن کە هەوڵ و کۆششیان بۆ وەدەستهینانی مافی نەتەوەکانیان بکەن بەیەك.

شەریف پاشا لە ١٩٢٠ لیژنەیەکی بە سەرۆکایەتی خۆی بە ناوی خۆی بوون لە پایتەختی فەرەنسا پیکهینا، هاوپەیمانەکان لە ١٠ی ئاب ١٩٢٠دا (پەیمانی سیڤەر) یان لەگەڵ تورکیادا بەست، تورکەکان دانیان بە دەولەتی ئەرمەنی سەربەخۆ نا، پەیمانەکە ئەوەشی گەیاند کەوا لیژنەیەك لە نوینەرانی بەریتانیا، فەرەنساو ئیتالیا لە ئەستەنبول پیکبهینریٚ بۆ دانانی پرۆژەی بەریوەبەرایەتییەکی ناوخۆیی سەربەخۆ بۆ ئەو ناوچە کوردییانەی کەوتونەتە رۆژهەلاتی فورات و باشووری ئەرمینیاو باکوری سنوری تورکیاو سوریاو عیراق، بەلام مستەفا کەمال (ئەتاتورك) سەرکردایەتی بەرگری کردنی دژ بە سولتان و هاوپەیمانەکانی لە ئەنەزۆلدا کرد، بەسەر یۆنانیەکاندا زاڵ بوو، پەیمانی سیڤەر نەبەسترا، بەلکو پەیمانی - لۆزان - لە ٢٤ی تەمموز ١٩٢٣ لە جیگای ئەوا مۆر کرا.

بەندەکانی پەیمانی پیشوی تایبەت بە ئەرمینیاو کوردستان لادرا، شەریف پاشا بۆ دورە پەریزی و لاتەریك بوونەکەی خۆی دەگەریتەوە[1]، جەنەرال حەسەن ئەرفەع لە کتیبەکەیدا (الاکراد) کەوا سالی ١٩٦٦ لە نیویۆرك بە زمانی ئینگلیزی دەرچووە، لەسەر شەریف پاشای نووسیوە کەوا دۆستایەتی و شوناسی کەسایەتی لەگەلیا هەبووە.

حەسەن ئەرفەع: سوپا سالاری سوپای ئیرانی بووە، پاش ئەوە پایەی دەکریٚ بە بالویزی ئیران لە تورکیا (١٩٥٨-١٩٦١) هەروەها لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بالویزی ئیران بووە لە ستۆکهۆلم، کە شەریف پاشا لە هەمان کاتدا لەوێ نوینەری

**توركيا دەبيت، هەردوو دبلۆماسى پەيوەندييەكى بەتينى دۆستايەتييان لە نيواندا پەيدا دەبێ. حەسەن ئەرفەع دەلێ: شەريف پاشا لايەنگرى سياسەتى سولتان عەبدول حەميد بووە، بەلام كە توركيا سالى ١٩١٤ دژ بە هاوپەيمانەكان كەوتە جەنگ و چووە پاڵ ئەلمانيا نارەزايى و قايل نەبوونى خۆى دەربرىو ريى پيدرا لەگەڵ بەرهەلستكارانى تر بچنە دەرەوەى ولات. لە شارى مۆنتكارلۆ لە فەرەنسا نيشتەجێ دەبێو ژيانيكى بەگلەرانە بەسەردەبا.**

**كە جەنگ كۆتايى هات، چووە پاريس پەيوەندى بە ئەنجوومەنى بالاى هاوپەيمانەكان و نوينەرى دەولەتە سەركەوتووەكانەوە كرد لە كۆنگرەى ئاشتيدا. زۆر هەوڵ و تەقەلاى لەگەلدا كردن بۆ بريياردانى سەربەخۆبوونى كوردستان.**

---

**(١)دلپاكى و خۆش بروايى ئيمەى كورد گەلى هەلومەرجى لەبارى ميژوويى لەدەست داوين، دوژمنانمان توانيويانە بە ناوى ئاينەوە يان برايەتىو پەيمانو بەلينى بە درۆ لە خشتەبراوين و بۆيان كردوين بە هەوينى بە ئاوات گەيشتنمان. وەك دكتۆر وەليد حەمدى لە كتيبەكەيا (الكرد و كردستان في الوثائق البريطانية)دا لە لاپەرە ٢٥ دەلێ: لە ئابى ١٩١٩ يەك لە جەنەرالەكانى سوپاى توركى مستەفا كەمال پاشا توانى هيزەكەى لە ئەنازۆڵ كۆبكاتەوە كە پيكهاتبوو لە (٣٥)هەزار سەرباز – وە لە بارەگاكەى لە شارى (سيوس) دامەزرا بە مەبەستى بەرگرى و دژايەتى هاوپەيمانەكان – لە كاتيكدا لە ئايارى ١٩١٩ شارى (سميرنا)ى توركى لە لايەن يۆنانيەكانەوە داگير كرابوو – بە پەيدا بوونى مستەفا كەمال سەركردەكانى كورد كەوتنە خۆيانو هەستيان بە مەترسى ئەنجام نەگەيشتنى مەسەلەى كورد كرد لە (قحطة) نزيك شارۆچكەى (ملاطيا) كۆبوونەوە، هيزيكى كورديان بۆ رووبەرووبوونەوە و لەناوبردنى هيزەكەى مستەفا كەمال پيكهينا، كەچى لەو ئانەدا موديرى موخابەراتى بەريتانى (عقيد بيل) لە حەلەبەوە دەگاتە ئەوێ. بە ناوى حكومەتەكەيەوە – واتە حكومەتى بەريتانيا – پييان رادەگەيەنێ كە بە هيچ كاريكى سوپايى دژ بە مستەفا كەمال هەلنەستن، چونكە هاوپەيمانەكان هەروەك بەلينيان پيداون رشتن لە سەر جيبە جيكردنى مەسەلەى**

کورد. ئیتر ئەوە وای لە کوردەکان کرد کە بە تەفروتوناکردنی هیزی جەنەراڵ مستەفا کەمال بە هاوکاری ئەرمەنیەکان هەلنەستن. لە کاتیکدا کۆماری یەریڤان بە ئاسنی دەیتوانی ئەرمینیای تورکی داگیر بکا. بەمجۆرە کوردەکان و ئەرمینیەکان بەهۆی پشتبەستن بە نیاز پاکی هاوپەیمانەکان و دلنیاکردنیان کەوتنە هەلەیەکی گەورەوە. "وەرگیر"

## مەسەلەی کورد لە کۆنگرەی قاهرەدا

لە مانگی ئازاری سالی ١٩٢١ کۆنگرەی قاهرە بەسەرۆکایەتی وەزیری موستەعمەرات ونستون چەرچڵ بۆ نەهیشتنی گیروگرفتەکانی رۆژهەلاتی ناوەراست بەسترا، بریاری پالاوتنی ئەمیر "فەیسەڵ" بۆ پاشایەتی عیراق درا لە ١٥ی ئازار لە کۆبوونەوەی پینجەمدا باسی دوارۆژی کوردستانی تیادا کرا، مەندووبی سامی سیر (برسی کۆکس) ئەوەی دەرخست کە: ئەو ناوچانەی کورد نشینن کەرکوك و سلیمانی و هەندێ قەزای باکوری موسڵ بەشیکن لە عیراق و جیاناکرینەوە،لەم رایەشیدا سکرتیری کاروباری رۆژهەلات (میسس بیل) لایەنگری دەکات، بەلام میجەر (هیوبرت یانگ) کە یەکیك بوو لە فەرمانبەرانی وەزارەتی موستەعمەرات - بەشی رۆژهەلاتی ناوەراست- دواتریش لە عیراق کارمەند دەبێ بەرهەلستی دەکا و وای پیشنیار کرد کەوا دەست بەجێ دەولەتیکی کوردی دابمەزرێ و راستەخۆ لەژیر چاودیری مەندوبی سامی بەریتانی بێ نەك سەربە حکومەتی عیراق، لەمەشدا میجەر نۆئیل کەلە کوردستانا کارگوزاربووە و لە شارەزاترین فەرمانبەرانی بەریتانییە لە کاروباری کوردیدا پشتگیری رای یانگ دەکاو دەلێ: کوردەکان وایان لاباشترە کەوا بەریوبەرایەتی‌یەکی ناوخۆیی سەربەخۆییان هەبێو ناوچەیەکی بێ لایەن لە نیوان تورکیاو ئیران پیکبینن.

پاش وتوویژ کۆنگرەکە بریاری لەسەر راکەی میجەر یانگ دا کە ناوچەی کوردەکان لە بەریوەبەرایەتییەکەی عیراق جیابکریتەوە، بەلام لە هەمان کاتیشدا بریاری ئەوەشی دا کە ئەو تەرتیباتە کاتیك ئەنجام بدریٚ کە دەستەیەك بە ریك وپیکی لە کوردەکان پیکدەهینریٚ، کە ئینگلیزەکان کوردستانیان لە کۆتایی سالی ١٩١٨ داگیر کرد شیخ مەحمود بەرزنجییان لیٚ کردە فەرمانرەوا، بەلام هەندەی نەبرد لە ١٩١٩ سەربەخۆیەتی خۆی راگەیاند، هیزی بەریتانیایان بە گژەوە نا، شاری سلیمانیان دووبارە داگیر کردەوە، شیخ مەحمود دەگیریت و بۆ هندستان دوور دەخریتەوە.

لە ئەیلولی ١٩٢٢ دەگەریتەوە سلیمانی، دووبارە دەسەلات داریتی کەوتەوە دەست، کەچی هەندەی پینەچوو شۆرشی نایەوەو خۆی کردە مەلیکی کوردستان، سوپای عیراقی بەیارمەتی ئینگلیز بەرەنگاری بوو لە تەمووزی ١٩٢٤دا سلیمانی داگیر دەکەن، لەگەلٚ ئەوەشدا شیخ مەحمود لە راپەرینەکانیدا هەر بەردەوام بوو، بەلام لە راستی و واقیعدا سلیمانی و ناوچە کوردییەکان بوونە بەشیك لە مەملەکەتی عیراق بیٚ ئەوەی گویٚ بدریتە بریارەکانی قاهرە.

# شیخ مەحمود

ناسراو بە حەفید کوری شیخ سەعیدی کوری کاك ئەحمەدی شیخ مەعروفی نۆدییە، ئەو شیخ مەعروفەش کوری مستەفا کوری ئەحمەدی نۆدیی شارەزوری بەرزنجەیە، لە پیاوە بەرزەکانی(تەسەوفی) ناوچەی سلیمانیە، چۆتە گوندی نۆدی. لە سالی ١٧٥٣ لە شارەزوور هاتۆتە دنیا، لە ١٨٣٨ لە سلیمانی کۆچی دوایی کردووە، زۆر کتیبی لەسەر:عەقائید، فەرائیز، مەنتیق و (عیلم الاصول) داناوە، هەروەها تەخمیسی بوردەشی هەیە. دوای ئەو کاك ئەحمەدی شیخ (١٧٩٣_١٨٨٨) ناوبانگی پەیدا کرد، پاشی ئەو شیخ سەعیدی کوری سەرۆکایەتی رۆحی لە سلیمانی بۆ مایەوە.

شیخ سەعید لەو هەراو ئاژاوەیەی کە لە یەکەم رۆژی سالی نویی ١٩٠٩ کە لە موسل بەرپا دەکرێ دەکوژرێ[1]. شیخ مەحمود لە سالی ١٨٨١ لە سلیمانی هاتۆتە دنیاوە، زانیاری شەرع و فقەو تەفسیرو دەستوری سۆفیەتی خویندووە.لە ١٩٠٤ لەگەل باوکیدا دەچیتە ئاستانە، چاویان بە سولتان عەبدول حەمیدی دووەم دەکەوی، لە ئاکامی کوشتنی باوکی لە موسل لەگەل شیخ ئەحمەد عەلی برای دەگیری. لە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا جۆش و گری ئاگری شۆرش تینی سەند، ناچار

حکومـەتی تورکـی لـە ١٩١٠ بـەری دەدا، شـوین و پایـەی شـیخ مـەحمود چەسـپا، دەسەلاتی لەناو عەشیرەتەکان بەهیز بوو.

کە ئاگری جەنگی یەکەمی جیهانی هەلگیرسا بانگەوازی جیهاد راگەیەندرا. شیخ راپەری، بەخۆی و سەدان سوارەی ئازای لایەنگرانی لە ١٩١٥ کەوتە شـەری دژ بـە ئینگلیز لە (شعیبە). دوای هەشت مانگ دەگەریتەوە سلیمانی، پاشان کاتی لەشکری رووسـی گەیشـتە سـەر سـنووری بـاکوری عـیراق، پیـاوە جـەنگاوەرە ئـازاو چـاو نەترسـەکان بـەریان لە سوپاکە گرت و شـەریکی دلیرانە لـە پینجویـن بـەرپا بـوو، لی نەگەرا تیپەرن، پاشەو پاشی کشاندنەوە. ئینگلیزەکان سالی ١٩١٨ کەرکوکیان داگیر کردو بەجییان هیشت. پاشان دوای شەش مانگ هاتن دەستیان بەسەرداگرتەوە، لە تشرینی هـەمان سالدا شیخ مەحمودیان کردە فـەرمانرەوای کوردسـتان بـەلام زۆری نەبرد کە دیتی لە ولاتەکەیدا تواناو دەسـەلاتی پـەیداکردووە پشتی تیکردن و لییان هەلگەرایەوە.

لـە ١٩ی ئایـاری١٩١٩ سـەربەخۆیی راگەیاند، شەر لـە نیوانـی ئـەو و ئینگلـیز لـە تەنگەبـەری تاسـلوجە رووی‌دا، مـانگ و نیویـك شـەرەکە گـری سـەند، لــە ئـەنجامدا ئینگلیزەکان دەگەرینەوە شاری سلیمانی، شیخ مەحمود دەستگیر دەکەن و بۆ شاری (بۆمبای) دوور دەخەنەوە، نزیکەی سال و نیویك لە هیندستان بەسەر دەبا.

سـتیڤن لۆنگریـك لـە کتیبەکـەی دا"العـراق ١٩٠٠-١٩٥٠" دەلـی:"گـیروگرفتی کوردسـتانی باشـور لـە تشـرینی دووەمـی ١٩١٨ وای دەخواسـت کـە یاسـا شـوینی ئاشـوب و ئـاژاوە بگریتـەوە، دوور لـە زیـان بەخشـی خـەلکی دراوسـی لـە فـارس و عیراقیەکان، ئەمەش بەبی بەکارهینانی هیزی سوپایی نەدەکرا، ئەو هیزەش ئەوسا لەبەردەسـت نـەبوو.میجـەر نۆئیل کـە ئەفسـەریکی بـە تواناو فارسـی زان بـوو ناردیانـە سلیمانی کە شیخ مەحمود بەرزنجی بە فەرمان رەوای سلیمانی دابمـەزرینێ، پاشـان ببیتە یاریدەدەری، هەر لە زیـی گـەورە هـەتا دیالـە بـانگ راهیشـتنی سـەردارو سـەرەك خیل و عەشیرەتەکانیش بکریـن، ئەو رێ و رەسمـەش لـە یـەکی کـانوونی یەکـەم لـە کۆبوونەوەیـەکی گشــتی لــە ســلیمانی بــە بەشـدار بوونــی مـیر و بــەگ و ئاغاکــان

راگەیەندرا، کوردەکانی ئیران بە پیی رەگەز ناسیەکەیان بۆیان نەبوو بکەونە گەل ئەو رژیمەوە، کوردەکانی کەرکوك و کفری و هەولیر لیی لاتەریك بوون، چونکە ژیر دەست بوونیان بۆ حاکمیکی شاخاوی جیگای هۆشمەندی نەبوو[٢]، بەلام هەر لە هەلەبجەوە تا ناوچەی رەواندوز بە دەیان سەرۆك پالیان پیدا، لەگەل هەندی تیبینی تەنانەت بۆ ماوەیەکی کەمیش دەسەلاتی تا ناوچەکانی کۆیەو رانیەو رەواندوزیش چوو، زیانکاریەکانی شەری جیهانی لە شاری سلیمانی بە یارمەتی بەریتانیا زوو چارەسەر کرا، خانووەکان ئاوەدان و چاك کرانەوە، تۆو خواردەمەنییان هینا موچە و بەراتیان دابەش کرد، کاروان کەوتە هاتووچوو، کوردی بووە تاکە زمانی رەسمی، لە رۆلەی کوردیش زیاتر کەسیان لە فەرمانبەران دانەمەزراند -لونگریك- لەسەر ئاخاوتنەکەی دەرواو دەلی:خەریك بوو خەونی کوردەکان لە ژیر چاودیری بەریتانیا بیتە دی، کەچی لە چەند هەینی یەك زیاتری نەخایاند. چونکە ئەو تاقیکردنەوەیە مادەیەکی عەمەلی و سەرکەوتووی گەرەك بوو، میژوو نووسی ئینگلیزی دەیخاتە پال ئەوەی کەوا شیخ مەحمود لە سەرداریەتی دا کەسی رکەبەر نەبوو، هەروەك ئەو دەلیّ: پیاویکی سەر گەرم و پشوو تەنگ و زوو تورە دەبوو لەسەر بیر و رایەکی دیاری کراودا نەبوو[٣]، سەرۆکەکان ئامادەبوون دیاری و نیشانەی شکۆداری لی وەربگرن کەچی ئامادەی هەلگرتنی ئەنجامەکانی نەبوون، مل کەچی هیچ دەستەلاتیکی ریك و پیك نەبوون، لە کۆتایی ئەیلولی ١٩٢٢ شیخ مەحمود گەرایەوە سلیمانی، دووبارە دەسەلاتی کەوتەوە دەست، بەلام زۆری نەخایاند لە تشرینی دووەمی ١٩٢٢ لە رووی حکومەتی عیراقی راپەرییەوە، خۆی لەسەر کوردستان کردەوە مەلیك. لە کانوونی دووەمی ١٩٢٣ نووسراویکی لە ژیر مۆری مەلیکی کوردستان بۆ قونسلی روسیای سۆڤیەتی لە ئازربایجان نووسی، تییدا هاتووە کەوا: حکومەتەکەیان یارمەتی بداو پیّ لە مافە رەواکانی نەتەوەی کورد بنیو چەك و تفاقی بداتی و پەیوەندی دۆستایەتیان لەنیواندا دامەزری.

لە تەموزی ١٩٢٤ سوپای عیراقی شاری سلیمانی داگیر دەکات بەلام شیخ مەحمود توانی بۆ پشت گەلوی دەربەند رایان مالیّ. بەردەوام بوو لە بەگژداچوونی

سوپای عیراقی کە هێزی بەریتانی پشتگیری دەکرد. لە تشرینی ١٩٢٦ راویژکاری وەزارەتی ناوخۆ لەگەڵ شیخ مەحمود کۆدەبیتەوە، پاشان شیخ نوینەریکی خۆی بۆ مەبەستی ریك کەوتن لەسەر مەرجەکانی ئاشتبونەوە ناردە بەغدا. لە حوزەیرانی ١٩٢٧ ریکەوتن نامەیەکی مۆر کرد، ئەوەی دەگەیاند: کەوا شیخ مەحمود بەخۆی و خیزانەوە لە دەرەوەی عیراقدا بژین، وە خۆی لە کاروباری سیاسی نەگەیەنی، کوریکی بۆ خویندن بنیریتە بەغدا، حکومەت هەموو مولك و سامانەکانی بۆ بگەرینیتەوە، لەو سالەدا شیخ سەردانی بەغدا دەکاو لە خواروی عیراق نیشتەجی دەکری. لە سالی ١٩٢٩ ریی پیدرا بگەریتەوە کوردستان، بەلام بۆ سالی ئایندە کەوتەوە شۆرش نانەوە، دەگیری و دەینیرنە باشور. لە تەموزی ١٩٣٠ کۆمەلیك لە رووە دیارەکانی سلیمانی عەرزو حالیکیان پیشکەش بە (عصبە الامم) کرد لە جنیڤ داوای دامەزراندنی حکومەتیکی کوردیان تیدا کرد، لە ژیر چاودیری دەولەتان بێ، بەلام داواکاریەکەیان بەلاوە نراو پیی قایل نەبوون.

سالی ١٩٣٣ ری بە شیخ مەحمود درا بیتە بەغدا، لە ١٩٤١ گەرایەوە سلیمانی[٤]، بە بزوتنەوەیەکی یاخی بووانەی کەم خایەن هەلسا، پاشان خۆی بەدەست حکومەتەوەدا. ئیتر خۆی لە ژیانی گشتی گۆشەگیر کرد، لە ٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٦ لە بەغدا جیهان بەجی دیلی، تەرمەکەیان گواستەوەو بۆ سلیمانی و لەوێ بە خاك سپیردرا. شیخ مەحمود سەرەرای زمانی کوردی عەرەبی و تورکی و فارسی دەزانی، هەندی لە دۆست و شوناسانی وەسفی دەکەن کەوا: سەرداریکی رۆحی و دنیایی بوو، قسە خۆش و حازر بە دەست، ئەدەب دۆستو شیعرزان، شۆرە سواریکی دلیر بوو، بە ئازایی و مەردی دەچووە کۆری جەنگەوە، دکتۆر عوسمان ئەبو بەکر دەلی: (شیخ مەحمود دەچیتە پال کاروانی ئەو سەرکردە مەزنانەی کەوا لە تەك گەلەکەیان دەوەستن و لە ریزی هەرەپیشەوەیان دەبی، لە کاتی تەنگانەو نائومیدی دا جلەوی سەرکردایەتیان دەگریتە دەست، ئومید و هیوای سەرکەوتنیان پی دەبەخشی). دکتۆر سیر هاری سندرسن لە کتیبەکەیا (عشرة الاف لیلة و لیلة) کە بەدوورودریژی باسی خزمەت گوزاری خۆی لە عیراقدا دەکات، جاری داوای لیدەکری

چارەسەری شیخ مەحمود بکا، لەو کاتەی کەلە بەغدا نیشتەجی دەبیّ. سەیری دەکا دەبینیّ شوینەواری برینیکی بچوکی لە پشتی دایە، کە لیی دەپرسیّ: ئەوە چییە؟ سەرداری کورد کەوا دوای جەنگی یەکەمی مەزن بەریوەبەرایەتیەکەی بەریتانیای گیژ کرد بوو، لەوەلامدا بە دکتۆر دەلی: ئەوە شوینی گوللەیەکی بەریتانیە ئەوەش ئەی ئینگلیزینە وەکو ئیوەیە کە چوونە جیگایەك مەگەر شەیتان لاتان بدات دەنا بەری نادەن!!

خاتوو فریا ستارك لە کتیبەکەیا "غبار برثن الاسد" باس دەکا کەوا لە هاوینی سالی ١٩٤٣دا سەردانی سلیمانیو ناوچەکانی کوردستانی کردوە، چاوی بە شیخ مەحمودیش دەکەوی لەو کاتەی کەوا شیخ سەردانی گوندە ویران بووەکانی دەکا، دەلی: دیتم مرۆڤیکی بەتەمەنی بەتین، لە دەوری شیست وسی سالاندایە، هەر چەندە نیشانەی پیریەتی پیوە دیار بوو بەلام گیانی خەباتگیری هەر پیوە مابوو، جل و بەرگیکی سەوزی تاریکی پۆشیبوو، سمیلەکانی بۆیەی رەش کرابوو، دەم و چاوی خشت، لوتی بچوکی روخساری منالیکی خوین شیرینی پی بەخشی بوو، مەشرەب خۆشی نوکتە بیژ ، هەستی دۆستانەی بەرامبەر ئینگلیزی کۆنە دوژمنی هەبوو، ئەگەر چی سیاسەتەکەشیانی بە دل نەبوو، شیخ بە خاتوو ستارك دەلی: ئیوە ئاشنایان دەگرن و هەلیان دەخەلەتینن، وایان لیدەکەن ئامادەبن لە پیناوی ئیوەدا هەموو شتیك بکەن پاشان بەلایەوە دەنین، شعریکی چوار خشتەکی بۆ دەخوینیتەوە کە باسی ئەشکەنجە بینیوی شەیتان لە دۆزەخ دەکا، (پاش رۆژگاریکی دریژ خوا ریگا بە شەیتان دەدا بەرامبەر بارەگاکەی بوەستی، کەچی بیزاری دەرنابری بەلکو کرنووش بۆ خوای بەرزو مەزن دەبا، پیی دەلی: لەسەر چی نەوازشتم بۆ دەکەی؟ لە وەلاما دەلی:چونکە بە بەغدایی ئافەریدەت نەکردوم) خاتوو فریاستارك دەلی: بە فارسی لەگەل شیخ مەحمود دەدوام، دوای نان خواردنی نیوەرۆ لەگەل ئایشە خانی خیزانی ئاخاوتنم بوو[٥]. دیسان فریا ستارك لە نامەیەکی تردا کەلەکەرکوکەوە لە ئایاری ١٩٢٤ نوسیویەتی دەلی: بۆ سلیمانی پاشان بۆ پینجوین چووم، نانی نیوەرۆم لەگەل شیخ مەحمود خوارد، وەکو دەلی: هەموو سیحرو تەلیسمیك لە

شەخسیەتیدا کۆبوەتەوە وا پیدەچی تاوانبارانی ئەم جیهانە بۆ خۆیان داگیریان کردوە.

## پەراویز:

(١)شیخ سەعیدی پیران پیاویکی ئاینی و بە تواناو هۆشمەند بوو، وە بەپێی ئەو پارچە شیعرەی کە بە بۆنەی شیخ مستەفای برای داینـاوە توانـای شاعیریەتی هەبووە و، شعرەکەش بەم شیوە دەستپیدەکا:

مردنە بێ تۆ ژیانم زەلیلە بێ تۆ عیزەتم

دەردە خۆراکم بەبێ تۆ ژەهری مارە شەربەتم

تۆش وەکو من قور ئەپیوی گەر بزانی عیللەتم

ئەو هەراو فەرتەنەیەی کە لە شاری موسڵ قەوما و ئەنجامەکەی شیخ سەعیدی تیدا دەکوژرێ بەم جۆرەیە: لە دووەم رۆژی جەژنی ١٩٠٩/١/٥ خەلکی بە عادەتی جەژنان ژن و پیاو و کورو کچ و منداڵ لەسەر شەقامەکان لە هاتوچۆدا دەبن. بەهائەدین ئەفەندی ناویك وا پیدەچێ سەرخۆش بوو بیت، توانیك دەگریتە ئافرەتیك ئەویش تا تییدایە دەقیژینێ و هاوار دەکا، خەلکی لە دەوری کۆدەبنەوە، بەهائەدین بۆ خۆ دەربازکردن چەند تەقەیەك دەکاو شەرو ئاژاوە بەرپا دەبێ. گوایە شەرەف و ناموس پیشیل کراوە!! هیستر سواریش کەزۆربەیان کوردبوون جلکی سەربازی و هەندێ جلی کوردییان لەبەر بووە. رووبەرووی خەلکەکە دەبنەوە ئیتر شەر و کوشت و کوشتار تاکو نیوەی شەو بەردەوام دەبێ. بۆ رۆژی سییەم شیخ سەعید لەسەر داواکاری والی روو دەکاتە سەرا بەمەبەستی ناوبژی و هیور بونەوەی بارودۆخەکە و وەستانی شەرو خوین رژان. چەند جندرمەیەك

لەپشـت و پیشـەوەی و خـەلکیش بـەدواوەی دەبـن. کـە دەگەنـە بـەر دەرگـای سـەرا سـەیر دەکـەن داخراوە!! لەو ئانەدا کابرایەك بەردیکی زل بەسەری شیخدا دەداو دەکەویّ و گیانی خەلتانی خوین دەبیّ. بەوەش ناوەسـتن دەچنە ئەو خانوەی شیخ سەعیدی لی دابەزیوە، شیخ ئەحمەدی کوری و شیخ عەزیز دەکوژن تاقمی. شەر فرۆش شالاو دەبەنە سەر ئەو خانوەی دەست و پیوەندی شیخانی لی بووە سیزدە کەسیان لی دەکوژریّ. شەرو ئاژاوە بەردەوام دەبیّ. سەیر لەوەدا بووە کاربەدەستان لەم رووداوە خویناویـەدا دەسـتە وەسـتان بـوون. بیگومـان کـەین و بـەین و نەخشـەو پیلانیـك بـۆ ئـەم کارەساتە لە ئارادا بووە کە شیخ سەعید و چەندین کەسانی تیدا لەناوچوون. سەرجەمی کوژراو لەهەردوولا (٧٠) کەس و (١٠٠) کەسیکیش بریندار (وەرگیر).

(٢)ئەوە بیرو رای لۆنگیریك خۆیەتی(وەرگیر)

(٣ )ئەو سەرنج و رایانەش دەربارەی شیخ مەحمود هی میژوو نووسی ئینگلیزییە (وەرگیر).

(٤ )لەکاتی خۆیا کەسانیك بە شیخیان گوتووە کە هەندیّ بە نەرمی لەگەلّ ئینگلیزەکان رەفتار بکا بەلکو هەلویستیان دەگۆردریّ و بەرژەوەندی کوردی تیدا دەبیّ، شیخیش بەم شیوەیە وەلامیان دەداتەوە دەلیّ:

نامەویّ ژینی ئەسارەت بەسمە عومری گومرەهی
نایکەمە سەرخۆم بە ئەمری مودەعی تاجی شەهی
قەت بە ئەمری دوژمنانم نامەویّ فەرماندەهی

بەراستی ئەمە سـەرنجی راکیشـام ناچار ئـەم چـەند تیبینییـە سـەر پییـە بخەمـە بـەرچاوی خوینـەر: لەگـەلّ ریـزو نەوازشـتم بـۆ گشـت پیشـەواو سەرکردەو سـەردارانی کـورد کەلـە بـارودۆخ و سەردەمی جیاجیادا لەرووی دوژمنانی نەتەوەکەیان راپەریون. بەلام لەگەلّ ئەوەشا کە کار هاتە سەر نوسینی میژوو وە بۆ سودمەندی و پەند وەرگرتن لەبەسەرهاتەکان، دەبیّ لـە هـەموو روویەکـەوە هەلّ بسەنگیندریّ. نەك بە گیانی گەرم و سۆزو عاتیفەوە بنوارینە روداوە ترسناکەکانی گەلەکەمان و بیّ شومار وشەی قارەمان و پالەوان و نەبەرد و دانا و زانا بخەینە پالّ سەردارەکانمان.

(٥ )دووەم ژنی شیخ مەحمود ئایشە خانی کچی مامی بووە. ئایشە خان لە پیشدا ژنی شیخ ئەحمەدی برای شیخ مەحمود دەبیّ و شیخ جەلالی لا بووە، دوای کوشتنی شیخ ئەحمەد لە کارەساتی موسلّ شیخ مەحمود مارەی کردووە، تەنیا شیخ لەتیفی لیّ دەبیت.(وەرگیر)

# بنەماڵەی بارزانی

بنەماڵەی بارزانی دەگەڕێتەوە سەر عەبدوڵا کوڕی مەلا بەکر ناسراو بە (تاج الدین) کە دامەزرێنەری تەکیەی نەقشبەندیە لە گوندی بارزان. لە ساڵی ١٨٢٥ عەبدولسەلامی کوڕی لە ئیرشادو ڕابەریدا جێگای گرتۆتەوە. پاشی ئەو شێخ محەمەدی کوڕی شێخ عەبدولسەلام کە هەردوو دەسەڵاتەکەی ئاینی و دنیایی کۆ کردبۆوە دەست ڕۆیشتوی ناوچەکە بووە، لە دوا ڕۆژانی ژیانیدا کار بە دەستانی تورکی بە هۆی ڕوودانی فیتنەو ئاژاوەکانی نێوان عەشیرەتەکان لە موسڵ زیندانی دەکەن، پاشان بەری دەدەن و بۆ بارەگاکەی خۆی دەگەڕێتەوە، لە کوڕە دیارو ناسراوەکانی: شێخ عەبدولسەلامی دووەم کە لە ساڵی ١٩٠٨ لە دەسەڵاتداریەتی تورکی هەڵدەگەڕێتەوەو دەگیرێ‌و لە ٤ی ئەیلولی ١٩١٤ لە موسڵ لەسێدارە دەدرێ.

## شێخ ئەحمەد بارزانی

کوڕی محەمەد کوڕی عەبدولسەلامە، لە دەوروبەری ساڵی ١٨٩٢ هاتۆتە دنیا، لە ئاکامی لە سێدارەدانی شێخ عەبدول سەلامی برای لە موسڵ بەهۆی ڕاپەڕینەکەی دژ بە دەستەڵاتداریەتی تورکی–شێخ ئەحمەد سەرداریەتی عەشیرەتەکانی کوردی بارزان لە ناوچەی زێبار دەگرێتە دەست–لاپەڕەی ژیانی شێخ ئەحمەد پڕە لە شۆڕش نانەوەو ڕاپەڕین، لە سەرەتادا ساڵی ١٩١٩ دەستی بە ناردنی نوسراو کرد بۆ تورکەکان و هەڵمەت بردنە سەر کاربەدەستانی بەریتانی لە( وان )، دیسان لە ١٩٢٧ کەوتەوە ڕاپەڕین و پچڕانی کۆتی ملکەچی. دواجار لە تەموزی ١٩٣٠ و بەهاری ١٩٣٢ پەیتا پەیتا هەڵمەتی هێزی سوپایی دەچووە سەر ناوچەی بارزان.

شێخ ئەحمەد لە حوزەیرانی ١٩٣٢ ناوچەکە بەجیٚدێڵێ و ڕوو دەکاتە تورکیا، لەوێش دەدرێتەوە دەست کار بەدەستانی عێراقی و بۆ باشوری دوور دەخەنەوەو لێی نیشتەجێ دەکەن. دوای چەند ساڵێك ڕێگای پێدرا بگەڕێتەوە ناوچەکەی خۆی، بەلاٌم دوو بارە لە ١٩٤٣ لەگەڵ مەلا مستەفای برای شۆڕشی بەرپا کردەوە، لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٤ کاروبار هێورو هێمن دەبێتەو، مەلا مستەفا دەچێتە بەغدا نیاز پاکی خۆی بۆ حکومەت نیشان دەدا، شێخ ئەحمەدیش خۆی دەدات بەدەستەوە و دەکەوێتە ژیانی ئاسودەیی و ئاسایی، بەلاٌم لە تشرینی یەکەمی ١٩٤٥ ناچاردەبێ پەنا بەرێتە بەر سنوری ئێران، پاشان هاتەوە عێراق و ژێر دەست بوونی خۆی ڕاگەیاند.

لە پاش شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ ڕێی پێدرا بگەڕێتەوە بارزان، کاتێ مەلا مستەفا لە ئەیلولی ١٩٦١ شۆڕشی نایەوە شێخ ئەحمەد بێ لایەنی و بەشدار نەبوونی خۆی بۆ عەبدولکەریم قاسم ڕاگەیاند، دوانێکی دا گوتی: (شۆڕشی کورد خوێن ڕژانێکی خۆڕایی کوردەکانە).. لە ١١ی کانوونی دووەمی ١٩٦٩ لە بەغدا کۆچی دوایی کردوە.

## مەلا مستەفا بارزانی



مەلا مستەفا کوڕی شێخ محەمەدی بارزانییە، ساڵی ١٩٠٣ لە گوندی بارزان هاتۆتە جیهان بە ماوەیەکی کەم پێش لەدایك بوونی باوکی کۆچی دوایی دەکا، هێشتا تەمەنی نەگەیشتبووە سێ ساڵان کە تورکەکان لە ١٩٠٦ هەڵمەتێکی سوپایی دەهێننە سەر عەشیرەتەکانی کورد، شێخ عەبدولسەلامی برا گەورەی بەدیل دەگرن، ئەویش لەگەڵ دایکی دەخەنە بەندیخانەوە،

نۆ مانگی تیا بەسەر دەبەن، بزوتنەوە شۆڕش گێڕانەکەی لە ١٩٤٣ وە دەست پێ دەکات، دووا بەدووای خۆبەدەستەوەدانی شێخ ئەحمەدی برای، ئەو سەر لە نوێ تێ هەڵچۆوە. حکومەتی عێراقی بڕیاری دوور خستنەوەی بۆ ئێران دا. لە شوباتی ١٩٤٥ دێتە بەغدا حکومەت بەداواکارییەکەی قایل دەبێ، کە بگەڕێتەوە ناوچەکەی خۆی و چەکەکان کۆبکاتەوە، بەڵام کەوتە سەردان و گەڕان لەناو گوندەکان و هاندانی خەڵك بۆ شۆڕش نانەوە. لە شوباتی ١٩٤٥ هێزێکی سوپاییان نارده سەری، بۆ ناوچەی زێبارو بارزانیان ڕەتاند، ناچاریان کرد لە تشرینی یەکەمی ئەوساڵەدا لەگەڵ شێخ ئەحمەدی برای پەنابەرنە بەر سنوری ئێران، پاشان شێخ ئەحمەد دەگەڕێتەوە عێراق[1]، بەڵام مەلا مستەفا بەخۆی و دوو هەزار لایەنگرانی بەرەو مەهاباد دەڕوا، لە کاتێکا قازی محەمەد لە پازدەی کانونی یەکەمی ١٩٤٥ دامەزراندنی حکومەتێکی نەتەوەیی کوردی بە یارمەتی سۆڤیەت ڕاگەیاند، هاوسنور بوو لەگەڵ حکومەتی ئازربایجان کە لە تەورێز پێك هاتبوو. کاتێ حکومەتی ئێرانی لە ١٩٤٦ کۆماری مەهابادی لەناوبرد، مەلا مستەفا و جەنگاوەرانی پەنایان بردە بەر روسیا، دوازدە ساڵیان لێ بەسەر برد. لەسەرەتاوە مەلا مستەفا لە ئازربایجان و ئەزبکستان نیشتە جێ بوو، پاشان بۆ مۆسکۆ گواسترایەوە، زمانی روسی و هونەرکاریەکانی سەربازی و زانیاری ئابوری خوێندووە، لە ٢٦ی تشرینی یەکەم ١٩٥٨ گەڕایەوە عێراق. سەروەری و ڕێزو نەوازشێکی زۆری لێنرا، بەڵام کە گەڕایەوە ناوچەکەی خۆی لە ئەیلولی ١٩٦١ شۆڕشی ڕاگەیاند، لەبەگژداچوونی حکومەتی عێراقی بەردەوام بوو. هەتا لە ١١ ئازاری ١٩٧٠ لە گەڵی پێك هاتن و چەکی دانا.

مەلا مستەفا لە کۆنگرەی حیزبی دیموکراتی کوردستان وتارێکی دا ووتی: (ئێستا دەوری کاری بنیادنان و ئاوەدان کردنەوەو پیشەسازی هاتووە، تەنیا هەر بەمەش دەتوانین خزمەتی نەتەوەکەمان بکەین، هەموومان برای یەکین نابێ جیاوازی و دوبەرەکی لە نێوان ڕۆڵەکانی گەلدا بکەین، با هەوڵ بدەین هەموومان ببین بە برایەك کە یەك ئامانج و یەك دەستور پێکمان ببەستێ ئەویش بەختەوەر کردنی گەلی عێراقە بە کورد و عەرەبیەوە). لە ٢٩ی ئەیلولی ١٩٧١

**هەولی کوشتنی درا، بارەگاکەیان لە حاجی ئۆمەران هەلتەکاند، بە سەیرو سەمەر لە مەرگ رزگاری بوو.**

**حکومەتی عیراقی لە ١١ی ئازاری ١٩٧٤ حوکمی زاتی بۆ کوردستان راگەیاند، بەلام مەلا مستەفا بە شیوە حوکمە زاتیەکە قایل نەبوو کەوتەوە شۆرش نانەوە، بەلام بزوتنەوەکەی نشوستی هینا، حکومەتی عیراقی لە ناوی برد، زۆربەی لایەنگرانی خۆیان بەدەستەوە دا یان روویان کردە ئیران. پاشان ئەویش لە ٣٠ ئازار بۆ ئەوی چوو لە تەهران نیشتەجی بوو، بەر لە بەجی هیشتنی بارەگاکەی لە چۆمان دوانیکی بۆ رۆژنامە نوسان دا ووتی: ئیمە بە تەنیاو بی دۆستماینەوە چ یارمەتی و پاریزگاریمان لە ئەمەریکاوە پی نەدرا، وا دەزانم رۆژگاریکی رەشمان لە پیشە) رۆژنامەی تایمسی لەندەنی لە ٢٧ئازار١٩٧٥ نوسیویەتی دەلی: (مەلا مستەفا لەناو کوردەکاندا بۆتە کەسایەتییەکی نیمچە ئەفسانەیی، ئەوەش بەهۆی خەباتی دوورو دریژی و بەرگری کردنی لە رووی کاربەدەستانی تورکی و بەریتانی و عیراقیدا، و سەلماندویەتی کە توانای بەردەوام بوونی شەری پارتی زانی لە چیاکانی باکوری عیراقدا بۆ ماوەیەکی دیاری نەکراو هەیە، پاشان دەلی: مەلا مستەفا و هاوریکانی بریاری شەر راگرتنیاندا هەر وەك قەدەر تەلەی بۆ دانابنەوە) دوایی لە سالی ١٩٧٦ بۆ چارەسەر کردنی نەخۆشیەکەی بەرەو واشنتۆن پایتەختی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەروا. لە ٢ی ئازاری ١٩٧٩ لەوی جیهان بەجی دیلی تەرمەکەیان بۆ ئیران گواستەوە لە یەکیك لە سەنگەرەکانی چیای کوردستان لەسەر سنوری رۆژئاوای نزیك عیراق نیژرا[٢].**

**دیڤید ئەدامسن رۆژنامە نوسی ئینگلیزی سەردانی مەلا مستەفا دەکا کە پالی بە چیاکانەوە دابوو، بەگژ عەبدولکەریم قاسم دا چوو بوو، لە کتیبەکەیا (الحرب الکردیە) باسی دەکا و دەلی: بەوەی باشە ئازایەتیو دلیریەکەی لەسەر شیوازی کۆنە تا ئەوەی ئینسان تارادەیەك سەرسامی بەرزیی و سەروەریەتەکەی دەبی، بەلام پەیرەو کردنی دابوونەریتی وای لیکردووە پتر نەروانیتە بیرورای بەرفراوانتر و زۆر**

ئاڵۆزتر، سەرکردایەتی شۆڕشێکی نویٚ دەکا بە شەرەف. بەلاٌم بە شێوازێکی سەردار عەشیرەتێك بێ.

مەبەست تەنیا بۆ سەروەری و سەربەخۆیی بوونە، شەڕەکانی کەوا بەرپا دەبوون خێلە ساتی تێکەلٌ بەنیشتمانیەتی. خۆی لەمەهاباد دیتەوە کەسەرکردەی سیٚ هەزار چەکداری ئاوارەیەو دەوڵەتێکی بیٚ سوپا کە بیپارێزیٚ، بۆیە رۆژگار وای لێکرد بەگیانێکی عەشایری بیێتە سەرکردەیەك لەشەڕی نیشتمانیەتیدا، ژیانی سەراپا زنجیرەیەك بووە لەشەڕو شۆڕو تێکشکان و ئاوارە بوون، ئەوەش شێوە ژیانی زۆرەهای کوردەکانە کەوای کردوە سیفەتیکی بەهیز بەلکو ترسناك لەگیانی کوردی برسکی چارەنووسیکی ماتەمو غەمگینە[٣]. ئەو سیفەتەش لەمەلا مستەفا بەدی دەکریت. میجەر ئەدغار ئوبالانس پسپۆری سوپای ئینگلیز کەخاوەنی چەندین کتیبە لەسەر جەنگی یەمەن و هیندی و کۆریا و جەزائیر و شەری خۆبەخۆیی یۆنان و سوپای سوری سۆڤیەتی،...هتد، سیٚ جار سەردانی عیراق و ناوچە کوردیەکەی کردووە، لەکتیبەکەیا (الثورة الكردیە ١٩٦١-١٩٧٠) کە سالی ١٩٧٣ دەرچووە دەلی: (چەندین جار چومەتە دیداری، خویندەواریکی واش نەبوو بەلام جلەوی شۆرشەکەی توند لەدەست گرتبوو، کەس نەیتوانیوە لەسەرکردایەتیەکەی لایبدا، دەسەلاتی خۆی بەسەر هۆزەکانی دەوروبەری بارزان دا بلاوکردۆتەوە، بۆتە سەرداریکی دان پیدا هاتوی نەتەوەی کورد، بەشداری گەلەکەی کردوە لەزەحمەتکیشان و مەترسییەکانیدا، بالا بوو لەنەخشەکیشان و جۆش پیگرتنی گیانی خۆراگری سەربازەکانی و بەرزکردنەوەی ورەو، متمانە پیکردن و گوی دیربوونیان بۆ خودی خۆی و هاندانی ناحەزانی بۆ بەگژداچوونی یەکتر، بۆ دەرکردنی بریارەکانی پشتی بەسەلیقەو ئیلهام دەبەست، لە زۆربەی کاتا جیگایەکی دیاری کراوی بۆ خۆی نەدەکردە بارەگا، بەلکو لە شوینیك دەیگواستەوە بۆ شوینیکی تر، زۆر بە خەفەتیان و پاریز بوو، هەلپەو خۆ هەلکوتانی کەم بوو، خۆی لە چیا لاتەریك و لابەلایەکانا قایم دەکرد، چاوەریی تیکشکانی هیزەکانی حکومەتی دەکرد، لینەدەگەرا ئامیر هیزەکانی بۆ دەشتەکان شۆربینەوە، چاوگەی سستی

هێزەکانی باش دەزانی... پارێزگاری لەداب و نەریەتییە کۆنەکانی کورد کردبوو، لەگەڵ لاوەکانی شار نشین نەدەڕۆیشت کەوا چاکسازی کۆمەڵایەتی کوردەوارییان گەرەك بوو، لەگەڵ ئەوەشا توانی لەنگەر لە نێوان پیاوی عەشایرو گەنجە پێشکەوتو خوازەکان رابگرێ– لە کۆتاییدا دانەر مەلا مستەفای بە یەکێ لە سەرکردە مەزنەکانی سەدەی بیستەم داناوە– لەبەر گەشی و درەوشانەوەی عەزیمەتی و خەباتی لە پێناو سەربەخۆیی و حوکمی زاتی بۆ کورد و هەست کردنی بەوەی کە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد عەناسیری ژیانی ئابووری لێنایەتە جێ. توانی کۆنتڕۆڵ بەسەر هەوڵ و تەقەلای شیوعییەکاندا بکا کە دەیانویست جڵەوی سەرکردایەتی لێ وەربگرن و شۆڕشی کورد بۆ لایەکی تر ئاراستە بکەن کە زۆربەی زۆری گەلی کورد پێی قایل نەدەبوو، هەروەها یازدە ساڵ مانەوەی مەلا مستەفا لە یەکێتی سۆڤیەتدا پاڵی پێوە نەنا بیرو باوەڕی شوعیەت وەربگرێ.

محەمەد مەهدی جەواهیری ڕوو لە ئەحمەد حەسەن بەکر سەرۆك کۆماری عێراق دەکات و دەڵێ:

| | |
|---|---|
| جاذبت من صقر الشمال وإنه | بالعز أمنع من مطار عقاب |
| ومسحت غضبة قسور عن وجهه | ولقطت من فمه مرارة صاب |
| مستشرقا كبد السماء جبينه | للنيرات و رجله في الزاب |
| وسط الجبال طأن صم صخورها | من بعض ما استصفى من الحجاب |

پێش ئەوەش پارچە هەڵبەستێکی لە کۆنگرەی خوێندکارانی کورد ساڵی ١٩٦٢ لە میونخ خوێندویەتیەوە و دەڵێ:

| | |
|---|---|
| قلبي لكردستان يهدي و الفم | ولقد يجود بأصغريه المعدم |
| يا ابن الشمال وليس تبرح كربة | بالبشر تؤذن عندما تتأزم |
| سر في جهادك فالجهاد مفازة | يهدي الضليل بها وينجده الدم |
| من بعد الف من سلالة ضالم | من قبل الف يثأر المتظلم |

وەك دەزانرێ لـە كورانـی مـەلا مســتەفا دووانيـان ناويـان دەركـردووە، ئيدريـس بارزانی كە لـە سـالی ١٩٤٤ لـەدايك بـووە و لـە سـالی ١٩٨٧ كۆچی دوايـی كـردووە و مەسعود بارزانی كە لـە سـالی ١٩٤٦ لـە دايك بـووە[٤]، دوای سـاليك لـە بـەرپابوونی جەنگ لەگەڵ عيراقدا هاوكاری لەگەڵ ئيران كرد.

## دكتۆر عەبدورەحمان قاسملۆ

سەرداری كوردی ئيران عەبدورەحمان قاسملۆ لـە مـانگی كـانونی يەكـەمی ١٩٣٠ لە دۆلی قاسملۆ نزيك شاری (رەزائيە) ئورميای ئيستا هاتۆتە دنيا، باوكی پياويكی مولكداری حال خۆش بووە، لـە سـەردەمی خويندكاريدا لەگەل بزوتنەوەكەی قـازی محەمـەد دەرۆيشت كـەوا لەسـەرەتای سالی١٩٤٦ كۆمـاری مـهابادی كـوردی لـە ژيـر سايەو سيبەری سۆڤيەتی راگەياند. پاشـان بـە ماوەيـەكی كـەم ئـەم كۆمـارە روخـا سەرۆكەكەشـی لـە سيدارە درا. دوای ئەوە روی كردە عيراق لەويشەوە بۆ ئـەوروپا، لـەوی خويندن تـەواو دەكات، لـە سالانی شيست و حەفتاكانا هـەولی دا رابـەری لـە راپەرينەكانی كوردی ئيران بكا، بەلام سەركەوتنی بە دەست نـەهينا لـە سـالی ١٩٧٣ كەلـە زانكۆی بـراخ دەيخوينـد هـەلبژيردرا بـە سـكرتيری گشـتی حزبـی ديموكراتـی كوردسـتانی ئـيران. دوای ئـەوە روی كـردە پـاريس سـێ سـالی لێ دەمينيتـــەوە، لــە سۆربۆن موحازەرەی لەسەر زمانی كوردی دەدا،لە كۆتـايی سـالی ١٩٧٨ گەرايـەوە كوردسـتان. شـانەو لقەكانی حزبەكـەی دامـەزراند، كـەئاژاوە سەرانســەری ولاتەكـەی گرتـەوە لايـەنگرانی دەستيان بەسـەر چـەكی سـوپاو پۆليسدا گـرت. لـە كاتيكـا كـە (رەزا شـا) چـووە دەرەوە (روح اللــە خومينــی) جلــەوی كاروبــاری فــەرمانرەوايی گرتە دەست.

قــاسملۆ ســودمەند نـــەبوو لەيارمـــەتی دانـــی عـــيراق و جـــەنگ لەگـــەل ئـيراندا هەلگيرسـا، كەوتـە بەرهەلسـتيكردنی عـيراق سـەبارەت بـە داپلۆسـينی نەتەوەكـــەی و بـــەكارهينانی غـــازی كيميـــاوی بـــۆ لـــەناوبردنی شۆرشـــەكەيان،

ئیتر گەڕایەوە بۆ پاریس، پاشان بۆ بەردەوام بوون لە خەبات و هەوڵ و کۆششی سیاسی، ڕوو دەکاتە شاری (ڤیەنا) پایتەختی نەمسا، لەوی لە ١٣ی حوزەیرانی ١٩٨٩ دەکوژری.

قاسملۆ سەرداریکی ڕۆشنبیر بوو بە چەندین زمانی ئەوروپی و ڕۆژهەلاتی دەدووا[٥]، سیاسیەکی مامناوەندی بوو، داوای بەریوەبەرایەتی ناوخۆیی بۆ سی ملیۆن کوردی ئیران دەکرد، بەلام لە شەرە ناوخۆیەکەدا ناهومید بوو، پاش خەبات و تیکۆشانیکی دوورو دریژ گیانی خۆشی لە پیناو بیرو بڕواکەیا بەخت کرد. لە کوشتنەکەیدا ئیران تاونبار کرا، ئەگەر چی کار بەدەستانیان ئەوەیان نەسەلماند.

## پەراویز:

(١)لە کاتیکا شیخ ئەحمەد دەگەڕیتەوە عیراق کە کۆماری مهاباد لەناودەبرێ و مەلا مستەفا ڕوو لە یەکیتی سۆڤیەت دەکات، نەك وەك دانەر نوسیویەتی. "وەرگیر"

(٢)لە ١٩٩٣/١٠/١٦ بەرێ و ڕەسمیکی شکۆدار ەوە تەرمی سەرەك بارزانی و ئیدریسی کوریان هینایەوە کوردستان و لە بارزان بە خاك سپیردرانەوە. "وەرگیر"

(٣)ئەمانە بیروراو بۆچوونی ڕۆژنامە نوسەکەیە، بۆ ئەمانەتی وەرگیران نەمان ویست دەستکاری بکەین. "وەرگیر"

(٤)ئیستا کاك مەسعود سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانە، وە لە ئاکامی هەلبژاردنە ئازادەکەی سالی ١٩٩٢ بە هاوبەشی لەگەڵ یەکیتی نیشتمانی کوردستان بە سەرۆکایەتی مام جەلال تالەبانی بۆ یەکەم جار لە میژووی کورددا حکومەتیکی تایبەتمەند بە کوردستانی باشور پیکهات، دامەزرینەر و سەرەك وەزیرانی ئەو حکومەتە ش دکتۆر فوئاد مەعسوم بوو.

(٥)بەپیی سەرچاوەی ئاگادار تاکو ئیستا هیچ کوردیك بەقەدەر قاسملۆ زمانزان نەبووە (ئینگلیزی، فەرەنسی، ڕوسی، چیکی، ئاسوری، فارسی، تورکی، عەرەبی و کوردی بە هەموو شیوە و زارەکانی‌یەوە) زانیوە، جگە لەوەش ڕۆشنبیریکی بە توانا و سەرکردەیەکی بەهرەوەر بوو. نەمانی لە کۆڕی خەباتی کوردایەتیدا خەسارەتیکی گەورە بوو، کەلەبەریکی فراوانی خستەڕیزی تیکۆشەرانی کوردی ئیرانەوە "وەرگیر".

# تەسەوف و زانیاری ئاینی لە کوردستانا

زانیاری ئاینی لە گوندەکانی کوردستانی عیراقدا گەشەی کرد، تەسەوف زەمینەیەکی بەپیتی لەم ولاتەدا دۆزیەوە، محەمەد ئەمین زەکی بەگ (لە میژووی سلیمانی و دەورووبەریدا) دەلی: ئەوانەی ئاگاداری حال و باری کوردستانن دەزانن کەوا دلی زۆربەی دانیشتوانەکەی بەندو گیرۆدەی ئەو دوو ریبازەیە: قادری و نەقشبەندی، بەند بوونیکی گیانی و مەعنەوی، ئەگەر چی لەناو خەلکەکەدا هەندی کۆمەلی نائاسایی هەیە وەك بابەتی (عەلی خواهی) یە توند رەوەکان، بەشیکیش پەیرەوی مەزهەبی یەزیدی دەکەن.

*١-ریبازی قادری:* دامەزرینەری ئەم ریبازە شیخ عەبدولقادری گەیلانیە (١٠٧٧-١١٦٦). لە بنەمالەی خانەدانەکانە، باپیری لە نەقیبەکانی ئەشرافی بەغدایە، مەزارەکەی لە گەرەکی (باب الشیخ) لە بەغدا بە سەروەری و نەوازشتەوە زیارەت دەکری، لە خواناسە مەزنەکانی تەسەوف بوو، بە گەنجیەتی دەچیتە بەغدا پاشان لەوی دەبیتە سەردەستەی مامۆستایان و فتوادەر،پایەو ریزیکی ئەوتۆی لینراوە، بۆ کەم کەس ئەو دەرفەتە دەرەخسی، لە سۆفیەتیدا بالا دەبی و (خرقە*)ی پیدراوە و نازناوی (باز الاشهب) وەردەگری، موریدەکانی چ لەژیانیدا چ دوای مردنی گەلی زۆر بوون، ریبازەکەی لە دوور و نزیکی ولاتانی ئیسلامی دا هەر لەهیندوپاکستانەوە تا دەگاتە ناوچەکانی رۆژئاوای ئەفریقا بلاو بۆوە.

*٢-ریبازی نەقشبەندی:* دامەزرینەرەکەی شیخ محەمەد کوری محەمەد بەهائەدین ی بوخاریە، بە نەقشبەندی ناسراوە (١٣١٧-١٣٨٩ز) لە نزیك گوندیکی

* خرقە: جۆرە لیباس و جلیکی ئاینداری و سۆفیەتیە. "وەرگیر"

بوخارا هاتۆتە جیهان، بۆ مەبەستی خوێندنی دەستوری تەسەوف رودەکاتە دێی (سلماس) لەسەر دەستی بابە سلماسی فێری زیکرو تەهلیلە دەبێ. دوای ئەوە لە سەمەرقەند لای سولتان خەلیل دەمێنێتەوە، پاشان وەك لێی دەگێرنەوە دەچێتە چەند گوندێك بە نیازی خزمەتگوزاری مرۆڤایەتی و بایەخ بە ئاژەڵ بەخێوکردن و چاك کردنی ریگاو بان و لابردنی ئازارو مەینەتی لەسەر بینەوایان دەدا، هەر لەو دێیەی کە چاوی لە ژیاندا پێ هەڵدێنێ کۆچی دوایی دەکات. مەزارو گۆرەکەی لە (باوەدین)ی بوخارایە. لە هەموو لایەکەوە خەلك بۆ بەجێ هێنانی دەستوری زیارەت دێنە سەری. هەردوو رێبازەکە لەسەردەمی ئیمارەتی بابان لە هەموو ناوچەکانی کوردستان بلاوبوونەوە، رابەرو مورێدیان زۆر بوو، شیخ مارفی نۆدێ (١٧٥٣–١٨٨٧). بە بلاوکردنەوەی رێبازی قادری لە ناوچەی سلیمانی هەلساوە، شیخ خالید ضیاء الدین کور حوسێن (١٧٧٦–١٨٢٧) رێبازی نەقشبەندی بلاوکردۆتەوە.

## شیخ مارفی نۆدێ

لە شارباژێر هاتۆتە دنیا لەلای بەناوبانگترین زانایانی سەردەمی خۆی دەخوێنێ–شارەزایی لە زانیاری ئایینی و ئەدەبی پەیدا دەکات. محمد ئەمین زەکی دەلێ: بەشی هەرە زۆری ئەو کتێبانەی کە داینـاون بەشێوەی هەلبەستە و بە تێکرایی شەیدابوونی چاکە و بروای بە تین و هێزی ئایین پەروەری و فرە ئەدەبی و دڵ لە جۆشی (الوجد) دەگەیەنێ. ئەو کتێبانەی داینـاون (عقائد، فرائض، اصول، منطق، بلاغ و معاني) یە جگە لە بابەتی سۆفیەتی و ستایشی پێغەمبەر و سەلەواتی خواهی. بەرهەمەکانی ئەم باسانەشی بەخۆیەوە گرتووە (بیان، بدیع، علم التجوید و عروض)... ئەم زاتە دەچێتەوە سەر بەرەبابی سەید عیسای بەرزەنجی حوسنی و لە شاری سلیمانی کۆچی دوایی کردووە. کاکە ئەحمەدی کوری ناوبانگی دەرکرد (١٧٩٣–١٨٨٧)، لە شاری سلیمانی هاتۆتە دنیا، لای باوکی زانیاری (تفسیر و حدیث وفقە) دەخوێنێ، پیاوێکی یەکجار خواناس و ئایین پەروەر بووە، ناوبانگی بە

هـــەموو لايـــەك دا بلاوبـــۆوە، محمـــد ئـــەمين زەكـــى دەلـــێ: دلنەواكـــەرى خـــەلك و خزمـــەتكاريكى ســـەروەرى مرۆڤايـــەتى و پشـــتيوانى كەســـاس و بێنـــەوايان بـــوو، ناوبـانگى گەيشـتە بارەگـاى سـەلتەنەتى عوسمـــانى، سـولتان عەبدولحـــەميد دووەم ئارەزووى ديدەنى كردووە، بەلام لەبەر پيريـەتى و بيتاقـەتى نـەيتوانيوە روو بكاتـە ئاستانە، كاتێ جەنگ لەگەڵ روسيا بەرپا بوو (١٨٧٧)، كۆمەليكى گەورەى لە موريد و هۆگرانـــى بەســـەركردايەتى شـــيخ ســـەعيدى كـورى بـۆ جيـهاد لـــە تـــەك ســـوپاى عوسمانيدا هەنارد.

## شيخ خاليد نەقشبەندى

ئەم زاتە لە هۆزى ميكائيلى عەشيرەتى جافە، لە ديى قەرەداغ هاتۆتە دنياوە. لە لاى باوكى و زانايانى سەردەمەكەى دەخوينـێ، ئيجازەى زانستى لاى شيخ محەمـەد قەسيم سەرەك زانايانى شارى (سنە) وەردەگرێ، دەگەريتەوە سليمانى دەست دەكات بە دەرس وتنـەوە، پاشان بـەرەو حـەج بـەرێ دەكـەوێ، سـالى ١٨٠٧ لەگـەڵ يـەك لـە دەرويشـەكانى روو دەكاتـە هيند، پـەيوەندى بـە سـۆفيەكانى ئـەويوە دەكـا، ريبـاز و سونەت و رابەرايـەتى ئـەوانى پـەيرەو كـردووە، سـەبارەت بـەتوندو تيـژى و ركەبـەرى نيوان هەردوو ريبازە سۆفيەكە بۆ بـەغدا كۆچ دەكا، لـە تەكيـەى خاليدى نيشـتەجێ دەبێ، لە سـالى ١٨١٣ بـەرەو ديمەشق دەروا، زيـارەتى (بيت المقدس) دەكا، پاشـان دەگەريتەوە شام لەوێ توشى نەخۆشى تاعون دەبێ و كۆچى دوايـى دەكا. رابـەريكى رۆحـى و گيـانى و شـاعيريكىرەوانبيژ بـوو، نامـە و هەلبەسـتى زۆرى بـە كـوردى و عـەرەبى و فارسـى هەيـە، لـە شيعرە سۆفيەتەكەى كـەوا (محەمـەد جـەميل رۆژبـەيانى) وەريگيـراوە، لەسـەرەتاكەيدا دەلێ: ليـس لاحـد عشـيق كعشـيق، رفيـع المقـام، بـهي الطلعة، ايسل الخد وضـاء المحيـا كـالبدر.. شـيخ عوسمـان تەويلـەيى. ناسـراو بـە سـەراجەدين (١٧٧٥-١٨٦٧) لـە بـەناوبانگترين خەليفـەكانى شـيخ خـاليد بـووە، دوو كورەكـەى شيخ محەمـەد بەهائـەدين (١٨٢٠-١٨٧٢) شيخ عومـەر زيائـەدين (١٨٣٩-

١٩٠٠) دەچیتە گوندی بیارە، تەکیەو خەلوەتخانەیەکی بۆ مەبەستی رابەری کردنی خەلك لی دروست دەکات. ئیتر هەر بەهۆی ئەوانەوە ریبازی نەقشبەندی لە تەویلە و بیارە و شوینانیتر بلاوبۆتەوە. شاعیری ناودار شیخ رەزای تالەبانی لە شیخەکانی ریبازی قادری بووە، شیخ عەبدوللای کوری جیگای دەگریتەوە، ئەو شیخ عەبدوللایە باوکی حەسەن تالەبانییە کە سالی ١٩١٣ لە دایك بووە، لە حکومەتی عەبدولقاسم بووە بە وەزیری ریگاوبان، تەکیەکەی شیخ عەبدوللا لە بەغدا لە گەرەکی مەیدان لە بەرامبەر وەزارەتی بەرگری هەلکەوتبوو،هەموو شەوانی هەینی ئەلقەی زیکری دادەبەست، دیتەوە یادم جاری لەگەل مەحمود فەهمی دەرویش و چەند برادەریکی تر چوینە سەردانی، شەکری قەندو چاو قاوەمان بە دیاری بۆ برد، سەر لە ئیوارە بوو گەیشتینە لای، هەیوانی تەکیەکە فەرش و مافوری لێ راخرا بوو، جیگایان لەتەنیشت شیخ لەسەر سەرینی نەرم و توکن بۆ چۆل کردین، فنجانی قاوە گیردرا، پاشان شیخ ئیشارەتی بۆ دەرویشەکانی کرد، هەموو ورووژانە گۆرەپانە والاکەی بەردەممان، لەژیر ئاواز و دەنگی دەف لیدان کەوتنە هەلپەرین، هاواریان دەکرد –لا اله الا الله، یاهو یاهو، لا اله الا هو، زۆری پینەچوو جۆشیان خوارد و گەرم داهاتن وەك گەردەلول کەوتنە سوران، تا ئەوەی بینەر جگە لەوەی کە شەپۆلی لەش بوو دەسورا چیتری نەدەدیت،هەر رمبەی قاچ بوو بەرزو نزم دەبوو، هاواری بەسامیان لی هەلدەستا، هەر چاوە سور هەلگەراوەکان بوو زەق زەق دەینواری، وەك سەیر و سەمەری غەیبی ببینی، لا اله الا الله–یاهو یاهو لااله الاهو، دوای ماوەیەکی کەم چا دانرا، جا شیر بەدەستان دابەزینە مەیدانەکە، ئەلقەی زکریان پیکهینا، کەوتنە گیژەن و جولەو سورانی بەردەوام، پاشان هەندیکیان خۆیان لا بە لا کرد کەوتنە زەرگ و شیر لە خۆدان چەندین سەعاتی شەو بەسەر چوو، پەردەی دوایی لەسەر زیکر دا درایەوە، جا هەلسان ساجیکی پرلە رەژوی گەش کراوەی سور هەلگەراویان هینا، هەندی سۆفی دابەزینە گۆرەپانەکە و کەوتنە گیژەن و سوران و هەلپەرین، بەدەم هاوار هاواری لااله الا هو، هەتا تەواو جۆشیان خواردو گەرم داهاتن، ئینجا بەپی خاوسی و قاچی رووت بە هەلپەو داپەرینی

شیوە سۆفیەتەکەیان بەسەر پشکۆ ئاگرەکاندا کەوتنە هاتوو چوونی بەردەوام، نیوەی شەو ئاهەنگ کۆتایی پیهات ئیتر سوپاسی شیخمان کردو بەسەر سورماوی لەوەی دیمان هاتینە دەر.

## شیخ عەبدوللای بیتوشی

عەبدوللا کوری محەمەد بیتوشی‌یە لە پیاو چاکانی کوردە، ١٧٤٨ لە (بیتوش)ی سەر بە ناوچەی (سەردەشتی) ئیران هاتۆتە دنیا، لەوی پیدەگا: زانیارییەکانی ئایینی دەخوینی،پاشان بەرەوبەغدا دەروا، سالی ١٨٠٦ لە (الاحسا) جیهان بەجی دیلی. گەلی کتیبی داناوە لەوانە -شرح الفاکهی-لەسەر قەتەر کوری هشام و هەلبەستی "کفایە المعانی" لەسەر "نحو" تا دوایی، شیعری بەزمانی عەرەبی هەیە، یەك لە هەلبەستەکانی ئەو پارچە هۆنراوەیە کە بۆ شیخ عەبدوللای کوری سیفەتوللا حەیدەری نوسیوە، سۆز و یادی بۆ عیراق تیدا دەربریوە، دەلیٚ:

إنی أحن العراق ولم اكن، لا من رصافته ولا من كرخته

لكن فی بغداد لی من قربه، واسهی الی من الشباب و شرخه

## نامی عەبدوللا ئەفەندی

لە زانایانی شاری هەولیرە، سالی ١٧٧٥ لەوی هاتۆتە دنیا هەر لەویش دەبیتە قازی، بەلاٚم لەگەلٚ "متسلم" حاکمی هەولیر تیك دەچیٚ. لەسەردەمی والی داود پاشا رودەکاتە بەغدا، هاموشۆی والی دەکات، دەرس بە خویندکاران دەلیتەوە، پاشان والی دەیکاتە قازی بەسرە، سالیك بە قازیەتی لەوی بەسەر دەبا، بەلام سەبارەت بەناسازی ئاو و هەواکەی واز دەهینیٚ و دەگەریتەوە بەغدا، لەویٚ ١٨٢٥ کۆچی دوایی دەکات، سەر بوردەکەی بەکورتی لە "تذكرة الشعرا"دا هاتووە کە دانەرەکەی عەبدولقادر خەتیب شەهرە بانیە، ئەب ئەنستاسی کەرملی لە ١٩٣٦ بلاویکردۆتەوە.

## حاجی ئەسعەد ئەفەندی حەیدەری:

ئەسعەد کوری سیفەتوللا حەیدەری گەورەیە، سالی ١٧٦٢ لە بەغدا هاتۆتە دنیا، لەلای ئەحمەد تەبەقچەلی سوختەی باوکی دەخوینی، پاشان دەکەویتە دەرس وتنەوە پەراویزی لەسەر هەندیك لە زانیارییەکان داناوە .

گەلی خویندکاری بەهرەوەر لەسەر دەستی پیگەیشتن ، لەپیش هەموویانەوە داود پاشای والییە و ئیجازەی زانستیشی هەر لەو وەرگرتووە، پاشان داود پاشا دەیکاتە موفتی بەغدا، بە ئەرکی ئەو پایە هەلدەستێ تا لە ١٨٣٩ بەنەخۆشی تاعون کۆچی دوایی دەکات .

## سەعید پاشا



سیاسەت مەداری دەولەتان (کورد سەعید پاشا کوری حوسین پاشا لە بنەمالەی خەندان ناسراو بە (کوردی) سالی ١٨٣٤ لە سلیمانی هاتۆتە جیهان، باوکی نوینەری ئەحمەد پاشا دوا میری بابان بووە، لە سالی ١٨٤٧دا داوادەکری بۆ ئاستانە، پاشان ئیمارەتەکەی لەناودەبرێ (١٨٥١)، واپیدەچی کە حوسین بەگ دەچیتە پایتەختی عوسمانی، سەعید پاشای کوری لەگەل خۆی دەبا، لە خویندنگاکانی تورکی دەخوینێ، فیری زمانی فەرەنسی، عەرەبی، فارسی و ئەلمانی دەبیت. بەپایەی ملازم لە نوسینگەی وەرگیران لە (باب العالی) دادەمەزرێ، پاشان دەیکەنە موتەسەریفی لیوای بانیە (١٨٦٧)، دوایی لە (مەدلی) لە دورگەی قبرس، سەعید پاشا لە پایەکانی پیشدەکەوێ، تا ئەوەی سالی ١٨٨٢ دەبیتە وەزیری دەرەوەی تورکیا، لە سالی

ئاینده‌دا ده‌یکه‌نه بالویز له به‌رلین، ده‌گه‌ریته‌وه به‌وه‌زیرایه‌تی ده‌ره‌وه (١٨٨٥)، پاشان بریکاری سه‌ره‌ك ئه‌نجومه‌نی شورای ده‌وله‌ت، ئینجا سه‌رۆکایه‌تییه‌که‌ی (١٨٩٣) هه‌تا پایانی ژیانی له‌م پایه‌دا به‌رده‌وام ده‌بی، له ٢٩ تشرینی یه‌که‌می ١٩٠٧ له ئاستانه مالئاوایی له ژیاندا ده‌کات.

سه‌عید پاشا برای وه‌زیری ده‌وله‌تی تورکی عیزه‌ت به‌گ و مامی دبلۆماسی عیراقی سیف الله به‌گه، محمد ئه‌مین زه‌کی له میژووی سلیمانی‌دا ده‌لێ: سه‌عید پاشا پیاویکی به‌رزو زانا بوو،شاره‌زایی ته‌واوی له‌سه‌ر نه‌ریتو داب و ده‌ستووری رۆژئاوادا هه‌بووه،چه‌ند زمانیکیانی ده‌زانی، نیشتمانه‌که‌ی لا خۆشه‌ویست بوو، به رۆله‌ی ولاته‌که‌ی خۆی ده‌نازی، چین و تویژی هه‌ژاری لا به‌قه‌در بوو،ریزی لێ ده‌نا، به راستی نابێ ئینکاری خزمه‌تگوزارییه مه‌زنه‌کانی که بۆ شاری سلیمانی و خانه‌دانه‌کانی نواندوه بکری، به‌سایه‌و هیمه‌تی ئه‌و پیاوه مه‌ردو دلیره بوو که قوتابخانه‌ی روشدیه‌ی سه‌ربازی له شاری سلیمانی کرایه‌وه.

کوره هه‌ره گه‌وره‌که‌ی، محه‌مه‌د شه‌ریف پاشا ناوبانگی به‌هۆی هه‌وڵ و کۆششه‌کانی که‌له‌لای ئه‌نجومه‌نی بالای سویند خۆران له پاریس دوای جه‌نگی یه‌که‌می مه‌زن بۆ بریاردان له‌سه‌ر مافی سه‌ربه‌خۆبوونی کورده‌کان ده‌رکرد.

## سه‌عید پاشای کورد

ئه‌وه سه‌عید پاشایه‌کی تره، له (١٨٣٨-١٩١٤) له سه‌رده‌می حه‌میدی ده‌بیته سه‌ره‌ك وه‌زیران (صدر الاعظم) دوای ئه‌وه سی جاری تر له‌سه‌رده‌می ده‌ستووره‌که‌دا هه‌مان پایه‌ی پێ سپیردراوه.

## ئه‌حمه‌د سوریيا

کوری ئه‌بی به‌کر کوری عه‌بدول قادره، له شاری هه‌ولیر هاتۆته دنیا، روو ده‌کاته ئاستانه، له به‌ریوه‌به‌رایه‌تی په‌روه‌رده ده‌بیته پشکنینه‌ر، له سالی ١٩٠٧ له پایته‌ختی تورکی جیهان به‌جی دیلی.

"الاسما الحسنه"ی هۆنیوەتەوە، لیکدانەوەی لەسەر "الروض الاعلی"دا هەیە.

## رەسول مستی

رەسول ئەفەندی نازناو بە گەورەی دانایان(شیخ الحکماء)، کوری مەحمود بەگە کە دەکا باپیری وەزیری زانا تۆفیق وەهبی، خەلکی شارەزورە، سالی ۱۸۲۳ لە گوندیکی سەربە هەلەبجە هاتۆتە دنیا، لەلای زانایانی هەورامان و سنە و رەواندوز خویندویەتی، لەو ماوەی کە لە رەواندوز دەمینیتەوە، نامیلکەیەکی لەسەر (تسریح الافلاك) و کتیبی (اثبات واجب الوجود)ی داناوە، پاشان بەرەو ئاستانە بەریدەکەوێ،لە خویندنگاکانی خویندوە (علم الطبیعة) ی داناوە، دەبیتە مامۆستا لە قوتابخانەی روشدیە لە موسڵ و کەرکوك و بەسرە، دەگەریتەوە ئاستانە دەیکەنە پشکینەری پەروەردە لە (وان)، دوایی بەریوەبەری خانەی مامۆستایان لە موسڵ، پاش ئەوە بەریوەبەری پەروەردە، دوای بەسەر بردنی حەفت سال لەم فەرمانەیدا رووەکاتە میسر، زمانی فەرەنسی فیر دەبیت، گەشتیك بە ئەوروپادا دەکات، دەچیتەوە ئاستانە، هەرلەوی دوای جاردانی دەستورەکە لە ۱۹۰۸ جیهان بەجێ دەیلێ.

## یوسف ظیاء پاشا

لە زاناکانی کورد و شاعیرانی سۆڤیەتیە، لەدەوروبەری سالی ۱۸۳۹ لە سلیمانی هاتۆتە دنیا، لەوی پیدەگاو لە پەیمانگاکانی خویندووە، لە هەرەتی لاویەتیدا هاتۆتە بەغدا، دەبیتە کارمەند لە دەزگای پۆستەدا کەوا بۆیەکەم جار لە ۱۸٦۱ ـ ۱۸٦٦ تەلی لە عیرلق بۆ راکیشراوە .

یوسف ظیاء لە فەرمانەکەیدا پیش دەکەوی، تائەوەی دەبیتە بەریوەبەری تەلەگراف (برق). دوای ئەوە دەگوازریتەوە بۆ بەریوەبەرایەتی (ئەملاکی سنیە) کە مولك و سامانەکانی سولتان عبدولحمیدی دووەم بووە، بەریوەبەرایەتی یەکەی لە بەسرە و تەرابلوسی رۆژئاوا و حەلەب وموسل و دواییەکەی لە بەغدا پیدراوە، هەرلەم

شارەدا مال ئاوایی لەژیان دەکا (١٩٠٩). عەلی عەلائەدین ئالوسی لە کتیبەکەیا باسی دەکا و دەلیّ: پیاویك بوو لەسەر ویرد و سلاوات و خواناسی خۆی بەردەوام بوو، زانا و سۆفیەکانی لا خۆشەویست بوو. چوار زمانی بە باشی دەزانی: کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی.

## یوسف ظیاء

ئەمەیان یوسف ظیایەکی ترە ( ١٨٤٢ـ ١٩٠٦)، خاوەنی "الهدیه الحمیدیه فی اللغه الکردیه" لەقودس لەدایك بووە، هەرلەویش کۆچی دوایی دەکات، دەرسی عەرەبی لە قوتابخانەی زمانە رۆژهەلاتیەکاندا لە ڤیەنای پایتەختی نەمسا گوتۆتەوە، سالی ١٨٧٦ ئەندامی ئەنجومەنی نوینەرانی عوسمانی بووە.

محەمەد ئەمین زەکی لە کتیبەکەیا (میژووی سلیمانی) بەناوی یوسف ظیاء ئەفەندی باسی دەکاو دەلیّ: ئەوە لەنەوەی شیخ خالید نەقشبەندیە، لە دیمەشقی شام نیشتەجیبووە. بەنازناوی (المقدس) ناسراوە، "عکاز الادب" و "التحفه الحمیدیه"ی داناوە.

## ئەحمەد فائیز

کوری سەید مەحمودی کوری ئەحمەد کوری عبدولسەمەد (فظل الدین) کوری حەسەن گلە زەردەییە سەعدانی لە سەیدەکانی بەرزنجەیە، سالی ١٨٤٢ لە گلە زەردەی نزیك سلیمانی هاتۆتە جیهان، لەلای باوکی و حاجی کاك ئەحمەدی خالی و زانایانی تر دەخوینی، لە ١٨٦١دەبیتە مامۆستا پاشان دەیکەنە قازی و، پایەکەی لەکۆیە قەرەداغ، کوت، ناسریە، کەربەلا، دەرسیم و ئورفە بینیوە، لەسالی ١٨٩٠ روو دەکاتە ئاستانە سالیکی لی دەمینیتەوە، دوایی بە قازیەتی دەنیردریتە ویلایەتی قسطة موونی.

ئینجا بۆ موسل ١٨٩٥ چەند سالیك لەو فەرمانەیدا دەمینیتەوە، دەگەریتەوە ئاستانە دەبیتە ئەندام لەئەنجومەنی"مەعاریف" دواجار لە سالی ١٩١٨ لە پایتەختی عوسمانی كۆچی دوایی دەكات، كتیبی بە عەرەبی و كوردی و توركی و فارسی داناوە: خلاصه العقیده فی شرح الدره الفریده، (فی العقائد) تحفه الاخوان، فی المعانی و البیان، خیر الاثر فی مدح ال سید البشر، جلاء الطرف فی اختصار الصرف، انفس الفوائد (فی علم الكلام) السیف المسلول ـ الدر المنظوم ارشاد العباد الی صحیح الاعتقاد، السحر الحلال فی تعریفات العلوم، كنز اللسن المكنوز ـ ...هتد.

## عیزەت بەگ خەندان

عیزەت بەگ كوری حوسین پاشای خانەوادەی خەندانە، برای سەعید پاشای وەزیری دەرەوەو سەرۆكی ئەنجومەنی شورای دەولەتی عوسمانییە، سالی ١٨٧٠ لە ئاستانە هاتۆتە دنیا، لەوی خویندویەتی، سالی ١٨٨٦ دەچیتە كاری فەرمانبەرایەتی وەزارەتی دەرەوە، لەپلەو پایەكانیدا پیش دەكەوی، كاتی دەستوری عوسمانی لە ١٩٠٨ راگەیەندرا نزیكەی نۆ مانگ لە فەرمان لادەدری، پاشان دەیگەریننەوە بە بەریوەبەری فەرمانگەی رەگەز ناسی (جنسیه)، پاشان لەسەردەمی وەزارەتی غازی ئەحمەد موختار دەیكەنە والی وان ١٩١٢، بەلام دوای ماوەیەك لەپایەكەی دەخەن، لەسەر ئەنجامی ئاگر بەستندا، لەوەزارەتی ئەحمەد تۆفیق پاشا دەیكەنە وەزیری ئەوقاف ١٩١٨، دوای ئەوە بریكاری وەزیری (تەموین) و ناوخۆیی، لە وەزارەتی داماد فەرید پاشا پلەی وەزیری ناوخۆیان پیداوە بەلاّم نەیكردووە، دامەزرا بە والی ئیزمیر، كە سوپای یۆنانی ئەو شارە داگیر دەكات، سوكایەتی و ئازار و ئەشكەنجەیەكی زۆری پێ دەگەیەنن. هەر لەو پایەدا سەر دەنیتەوە (كانونی دووەم ١٩٢٠).

## سلیمان بەگ خەندان

سلیمان بەگ خەندان برای عیزەت بەگ و بچوکترین کورانی حوسین پاشایە، سالی ١٨٧٩ لە ئەستەنبول هاتۆتە دنیا، کەباوکی دەمری تەمەنی نۆ ساڵان دەبیت، خویندن تەواو دەکا، لە خویندنگەی جەنگی دەردەچیت دەیکەنە یاوەری (مرافق) سولتان عبدولحمیدی دووەم، دەگاتە پلەی میر ئالآی (زەعیم یا عەمید) لە ئاکامی راگەیاندنی دەستوردا لە خزمەتگوزاری سوپایدا دەست بەردار دەبیت، خووی داوەتە لێ تویژینەوەی میژوویی.

بەئەندامی کۆری زانیاری میژووی تورکی هەلدەبژیردری، دەبیتە مفەوەزی سنور لە (یانە)ی سەر ئاقاری رۆمانی ١٩١٢، دوای ئەوە دەیکەنە قایمقامی دهۆك، دەگەریتەوە ئەستەنبول، سەبارەت بەچوونە ناو حیزبی هەمە لایەنەی بەرهەلستکارەوە دەگیری، دوای بەردانی دەیکەنە یاریدەدەری بەریوەبەری گشتی ئاسایش. کەعیزەت بەگی برای دەبیتە والی ئیزمیر ئەویش لەگەلی دەچیت. پاش مردنی بەهەفتەیەك براکەشی کۆچی دوایی دەکات ١٩٢٠.

## ئیسماعیل پاشای بابان

ئیسماعیل پاشای بابان ناسراوە بە بەغدادی کوری محەمەد ئەمین پاشا کوری سەلیم پاشای بابانە، لەبەغدا هاتۆتە دنیا. لە قوتابخانەی سوپایی لەئەستەنبول دەخوینی، پیبەپی لەپایەکانی سوپادا بالا دەبیت تادەگاتە پایەی میرلیوا (عمید)، بۆتە پشکنینەری پۆلیس. واز لە خزمەتگوزاری دینی و خۆی خەریکی لیکۆلینەوەو دانان دەکات، دوو کتیبی داناوە کە هەردووکیان لەدوو بەش پیکهاتوون، (هدیە العارفین فی اسماء المؤلفین واثار المصنفین) و ئەوەی تریان (ایضاح المکنون فی الذیل علی کشف الظنون)، سالی ١٩٢٠ لە ئەستەنبول جیهان بەجی دیلی.

## مستەفا زهنی پاشای بابان

مستەفا زهنی پاشا کوری حسین بەگ کوری محەمەد پاشا کوری خالید پاشایە، لە میرەکانی بنەمالەی بابانە، لە دەورو بەری سالی ١٨٥٠ لە سلیمانی هاتۆتە

دنیاوە، لەتەمەنی نۆزدە سالیدا لە ویلایەتی بغداد لە سەردەمی مەدحەت پاشا دەبیتە فەرمانبەر ، لەپایەکانیدا پیش دەکەویت تا ئەوەی دەبیتە (موتەسەریف)ی تەرابلوس و کەربەلا و والی لە ئەدەنە و بانیە وحیجازدا.

پاش جاردانی دەستور لە ١٩٠٨، وەزیری ناوخۆیی ویلایەتی بغدای پێ دەسپێرن، بەلام نەیکردووە، فەرەنسی و زمانی تری باش زانیوە، کتێبی بەزمانی تورکی داناوە، سالی ١٩٢٦ لە ئەستەنبول کۆچی دوایی دەکات.

## ئیسماعیل حەقی بەگ بابان

کوری مستەفا زهنی پاشای بابانە، ناوبانگی بەنوینەری و نووسەرو مامۆستای حقوق دەرکرد، سالی ١٨٧٦ لە بەغدا هاتۆتە دنیا، دەچیتە ئەستەنبول، لەوی لە حقوق دەخوینیو بروانامەکەی لی وەردەگریت (١٩٠٢)، بیروڕای ئازادیخوازانی تورکی کاری تیدەکا، هەر لەهەرەتی لاویەتییەوە لایەنگری ئازادی و حوکمی دەستووری بووە،لە دەزگای چاپەمەنی دەبیتە کارمەند، کە دەستور لە ١٩٠٨ راگەیەندرا لە فەرمان دەست بەردار دەبێ. دیتە مەیدانی رۆژنامەگەری، مژدەی بیروڕای نوی رادەگەیەنی، داواکاری چاك سازی بووە، کاری نووسەری لە رۆژنامەی (طنین) کە خاوەنەکەی حوسین جاهید یالچین بوو کردووە، پیکەوە لەگەل عەلی رەشاد بەگ کتیبیك لەسەر (بسمارك) دادەنین، دەرسی مافەکانی بنچینەیی لە حقوق پی دەسپیرن. بە نوینەری بەغدا بۆ ئەنجومەنی نوینەران هەلدەبژیردری (المبعوثین) کانونی یەکەم (١٩٠٨)، ئینجا نوینەری دیوانیە لە دەورەی دووەمدا (نیسان ١٩١٢)، خەیری عومەر دەلی: دوو دەورە نوینەرایەتیەکەی ئیسماعیل حەقی ئەوەی سەلماند کە چەند سەرگەرمی نیشتیمان پەروەری بووە. هەر لە سەرەتادا بەرهەلستی پرۆژەی هیلی ئاسنینی شەمەندەفەری بەغدای کردووە، کە ئەلمانیا بە نیاز بووە پیی هەلبەستێ. هەستی قولی بەرپرسیاربوونی بە ئەرکی نوینەرایەتیەکەی وای لیکردووە کە بچیتە ناوچە هەلبژیردراوەکەی خۆی و دیراسەتیکی وردی لەسەر گیروگرفت و پیداویستی و چۆنیەتی چارەسەرکردنی کردووە، رۆژنامەی (الطنین) بە

**زنجیره وتاریك لە ژێر ناوی (رسائل الوان) بۆی بلاوكردۆتەوە، پاشان لە كتێبیكی بچووك كۆكرایەوە و بە چاپ گەیاندرا (١٩١٣)، سالی ١٩١٣ كردیانە وەزیری "مەعاریف" ی توركی، كەچی كتوپر لە كاتی دەرس وتنەوە لە كۆلیجی شاهانەدا دلە مەزنەكەی لە لیدان دەوەستێ (٢٥ كانونی یەكەم ١٩١٣)، موحازەرەكانی یاسایی بە زمانی توركی لە كتێبێك دا بە ناوی (الحقوق الاساسیە) كۆكراوەتەوە.**

**پەیوەندییەكی دۆستایەتی بە تینی لەگەل شاعیری ناوداری كورد جەمیل سدقی زەهاوی هەبووە. بە پارچە هەلبەستیكی پر سۆز شیوەنی بۆ دەكاو دەلێ:**

جاءت الصحف حاملات نعیا اكبرته الاسماع فی بغداد

فبكت في بغداد حقي عیون كان حقي منها مكان السواد

كان مندوبها و كانت تباهی برجاحاتة جمیع البلاد

فبكینا شبابة وبكینا جلدا فیة راسخ الاوتاد

بابی انت من ادیب شجاع نام فی اللحد بعد طول الجهاد

## سلیمان نەزیف بەگ

**والی بەغدا شاعیری گەورەی تورك وندكار سلیمان نەزیف بەگ كوری سەعید پاشای والی ئەدیب و دانەری "میزان الادب"و"مرات عبر" لە نەژادی كوردی دیاربەكره، سلیمان نەزیف لە سالی ١٨٦٨ هاتۆتە جیهان. لەسەردەمی سولتان عەبدولحەمیدی دووەمدا لە ئەوروپا ژیاوە، بە بیروڕای ئازاد و دەستور پەروەری ناسراوە. دەیكەنە بەریوەبەری (تەحریر) لە بروسە و جەدە، پاشان دەبیتە والی بەسرە (تشرینی یەكەم ١٩٠٩)، لە سالی داهاتوودا واز دەهێنی (تشرینی یەكەم ١٩١٠)، دەبیتە والی قسطمونی ئینجا موسل (تشرینی دووەم ١٩١٣) و بەغدا (٥ كانونی دووەم ١٩١٥)، ئاهەنگی بوونە والیەتی بۆ دەگیردری (٦ ئازار ١٩١٥)، دوانیكی دا ئاواتە خوازی خۆی تیدا دەربری كەوا بتوانی لەم ناوە پیرۆزەدا خزمەت بكا كە پیشتر لە ویلایەتی بەسرەو موسل كارمەند بووە. ئیستاش وا هاتۆتە بەغدا لە كاتیكا هەوری رەشی شەر بەری ئاسمانی داگرتووە، بەسرەش لە جەستەی دەولەتی**

عوسمانی دابراوە، داوای کارگوزاری و هۆشیاربونی لیکـردن. هیـوای سـەرکەوتن و بلاوکردنەوەی ئاوەدانی و خۆش گوزەرانی خواست، بەلام سەردەمەکەی لە بەغدا زۆر خایەن نەبوو.

حکومـەتی تورکـی بریـاری یـەکبونی هـەردوو بەریوەبەرایەتیەکـەی سـوپایی و شارستانیەتیدا، میر ئالای (عەمید) نورەدین بەگ بەوالیەتی و سەرکردەیی دانـدرا. سلیمان نەزیف لە پینجی تەمموز لە پایەکەی لادرا، بەرەو ئەستەنبۆل دەگەریتەوە، مەحمود سوبحی دەفتەری وەزیری دادو وەزیری دەرەوەی عیراقی بۆی باس کـردم گوتی: (سالی ١٩١٧ پیکەوە لەگەل سلیمان نەزیف لە هەیوانەکانی کۆشك و تەلاری (باب العالی) لە ئەستەنبۆل دەرۆیشتین، تەلعەت پاشای (صدر الاعظم) یان پیدەگا زۆر بەریزو نەوازشتەوە سلاو لە والی پیشو دەکات، بەلام ئەو واتـا –سـلیمان نـەزیف– رووی خۆی لی وەردەگیری و وەلامی ناداتـەوە، چونکە تەلعەت لـە والیـەتی بـەغدای خستبوو.. پەیوەندی بەتینی دەفتەری لەگـەل سـلیمان نـەزیف ئـەدیب لـە بـەغداوە دەست پیدەکات و لە ئاسـتانەش پـتر دەبـی، تـا ئەوپەیوەندیـە بۆتـە دۆسـتایەتی و ئاشـنایەتیەکی خۆشەویسـتانە. سـلیمان نـەزیف لـەکاتی جـەنگا دیتەبـەغداو، بـۆ مەبەستی ناسین و شوناسی پیشوازی لەفەرمانبەر و مامۆستایان دەکـا، لـەناویاندا مامۆستای ئەدەبی تورکی لاو محمود سوبحی دەفتەری سەرنجی رادەکیشی و لەلای خۆی دەیهیلیتەوە، دەربارەی کارو باری ئەدەبی دەیدوینی. والی هـەموو سـبەینانی هەینی بۆ چاو پیکەوتنی خەلکەکە لە دیوان دادەنیشت.

ناودار و زاناو پیاو چاکانی بەغدا دەهاتنـەلای، لـە پیـش هەموویانـەوە جمیـل سدقی زەهاوی، قونسلی دەولەتەکان و هیتر، رۆژیکی هەینی دیوەخانەکەی پر میـوان دەبـی، لـەناکاو سـکرتیرەکەی دیتــە ژوورەوە، لـەبن گویـی والی دەچرپینـی کـەوا پیاوەکەیان هینـاوە. سلیمان نەزیف بەگ یەکسـەر هەلدەستی و دەچیتە ژوورەکـەی ترەوە فەرمان دەدا کابرا دارکاری بکـەن، دارکاریـەکی شلکوت، کەدەگەریتـەوە کـۆری مەجلیسـەکە هـەموو چـاوی پرسـیاری تـی دەبـرن، دەلـیَ: دەسـەلاتداریەتی سـوپا فەرمانی دەرکردووە کە دەبیت ئاگادار بکریَ لەو گەنم و دانەویلەیەی خەلك بۆ خۆیان

داكردووه. بۆئەوەی بیبەن و بیکەنە ئازوقەی سوپا. ئەو پیاوەش وەك زانیم پیشەی چاوتیبرینی هەژا رو بیوەژنو پەیوەست مەندەکان بووە، خەبەریان لی بدا لەو گەنم و برنجە کەمەی کەبۆ گوزەرانی ژیانی خۆیان هیشتویانەتەوە، ناچار تەمبیی بکەم بەو شیوەیەی کەدیتان.... دکتۆر محمد سدیق جەلیلی بۆی باس کردم و گوتی: سلیمان نەزیف سیزدە مانگ بەوالیەتی لە موسڵ دەمینیتەوە. (لە تشرینی ١٩١٣ هەتا کۆتایی کانونی یەکەمی ١٩١٤)، لەویوە لە سەرەتای ١٩١٥ بە (کەلەك) لەزیی دیجلەوە دەگاتە بەغدا. کە هەندی جادەو شەقامی نوی لە موسڵ دەکاتەوە خەلکەکە پییان ناخۆش دەبیت. عەبدول مەجید متەوەلی دەلی:

| | |
|---|---|
| ما للرجاله ساكتين أراهم | لزموا عن الحق المبين سكوتهم |
| قوم بأيديهم وايدى غيرهم | اضحوا فأرخ يخربون بيوتهم |

میژووەکەش بە حیسابی (الجمل) دەکا (١٣٣١ك. ١٩١٣ز). سلیمان نەزیف بەگ گەلی کتیبی داناوە لەوانە: نامیق کەمال، فضولی، فراق عیراق، جالمش أوکلە، (مولکە دزراوەکان لەزەوی و زاری سنیە) کە سولتان عەبدول حەمید لەگەل مولکەکانی خۆی داوە. الشاە ناصر الدین و البابیة ــ بطاریەت ایلە ایتش (تۆپەکان وئاگر ١٩١٧) ...هتد، گەلی وتاریشی لە گۆڤاری (ثروت فنون )، (تصویر افكار) دا بلاو کردۆتەوە ، سلیمان نەزیف لە شاعیرە بەرزەکانی کورد بووە . عەباس عەزاوی دەلی: شەیدای خۆشەویستی عیراق بوو (باشترین نیازو ئاواتی پیرۆزی بۆ لەدلدا بوو، پەرۆشی دابرین بوو لە جەستەی دەولەتی عوسمانی، ئەمەش بەچاکی لەبەر هەمە دووابیەکانیدا دەردەکەویت، دەلی: وەك بزانم داکی یەزیدی بووە مەلیك تاوسی بۆ یەزیدیەکان گەراندۆتەوە).

لە کانوونی دووەمی ١٩٢٧ لە ئەستەنبۆل جیهان بەجی دیلی: سلیمان نەزیف پارچە هەلبەستیکی داناوە کەداخی دەرچونی بەغدای لەباوەش ئالی عوسمانی تیدا دەربریوە، مەعروف رەسافی کە ئەوسا نوینەر بووە لە پایتەختی تورکی بە هەلبەستیك (نواح دجلە) وەلامی داوەتەوە دەلی:

هي عيني ودمعها نضاح – كل حزن لمائها يمتاح
كيف لا اذرف الدموع وعزى – بيد الذل هالك مجتاح

**سلیمان نەزیف عەرەبی خۆش دەویست و داوای برایەتی تورك و عەرەبی دەکرد، کە تورکە توندرەوەکان دوای راگەیاندنی دەستوور و ئالاّ و بەیداخی تۆرانیەتیان بەرز کردەوە، گیانی شیتگریەتی نەتەوایەتییان بلاودەکردەوە و بانگەوازی پاك سازکردنی زمانی تورکی لە وشەکانی عەرەبییاندا، چەند کەسایەتیەکی ئازادی خواز لییان راست بوونەوە، لەوانە: سلیمان نەزیف و ئەبو ضیاء تۆفیق بەگ خاوەنی رۆژنامەی "تصویر افکار" و عەلی کەمال بەگ، دژیان وەستان، درۆو دەلەسەکانیان پووچەڵ دەکردنەوە. داوای لیبووردن و تەبایی و یەکگرتنیان لەگەڵ میللەتەکەیان دەکرد، هەروەك ئەحمەد عیزەت ئەعزەمی لە بەشی یەکەمی کتیبەکەیا (القضیة العربیة) باسی کردووە، مەحمود سوبحی دەفتەری ئەدیبیکی زمانی تورکی بوو، لە رۆژنامەکانی ئەستەنبوڵ وتارەکانی لەبەرگری کردنی عەرەب و رەتکردنەوەی ئەو تاوان و تۆمەتانەی کە بەناحەق و خۆڕایی خراونەتە پالیان بلاو دەکردەوە، غۆستاف غۆترو لە کتیبەکەیا (فەرەنسا لە سوریاو کلیکیا) کە لەسالی ١٩٢٠دا چاپکراوە دەلیّ: لە ئاکامی تیکشکانی تورکیا لە جەنگی گشتی دا (١٩١٨) و داگیرکردنی ناوچەی کلیکیا وبنکەی "ئەتەنە" لەلایەن فەرەنساو بەریتانیاوە، تورکەکان کەوتنە جموجۆلی هاندانی سەردارانی کورد لە ناوچەی ماردین و دیاربەکر، بۆ خواستی سەربەخۆبوونی کوردستان، سلیمان نەزیف لەگەڵ عەبدولا جەودەت و هیتر لەپیشەوەی هەموو داواکارانی ئەم بیرورایەدا بوو.**

## فایەق عەلی بەگ

**شاعیری رۆمانسی برای سلیمان نەزیف ناوبانگی دەرکرد، سالی ١٨٧٥ لەدیاربەکر هاتۆتە دنیاوە. لە قوتابخانەی (الملکی الشاهانی) لە ئاستانە دەرچووە. فەرمانی بەریوەبەرایەتی گرنگی وەرگرتووە، لە کاتی جەنگی یەکەمی مەزندا**

موتەسەریفی ئاستانە دەبیّ دوای ئەوە دەبیتە والی، کتیبەکانی کە دایناون: الحان وطن، مەدحەت پاشا، کۆمەلە شیعریك.

ئە



مستەفا شەوقی کوری عەزیز یاملکی کوری مەلا مستەفای کوری مەلا عەزیز کوری مەلا حەیدەر لە عەشیرەتی بلباسە، سالی ١٨٦٦ لە سلیمانی هاتۆتە جیهان. دەچیتە بەغدا لەویّ خویندنی ئامادەیی تەواو دەکات. پاشان بۆ ئاستانە دەروات، لە خویندنگای سوپایی و قوتابخانەی ئەرکان دەخوینیّ، سالی ١٨٨٨ بە پایەی رەئیس روکن دەردەچیت، سالیك لە وەزارەتی جەنگ خزمەت دەکات، پاشان دەگوازریتەوە بە

ئەفسەر روکن لە تیپی حیجازدا و ئەندازیار لە مەکەدا. دوای ئەوە سالی ١٨٩٣ دەیکەنە قونسل لە (خوی و سلماس)- لە سالی داهاتوودا دەگوازریتەوە بۆ (سنە) دوایی بۆ قارس (١٨٩٧). دەگەریتەوە سوپا و دەکریتە بریکاری سوپاسالاری لەشکری شەشەم لە بەغدا (١٩١٠)، لە سالی ئایندەدا دەیگوازنەوە بۆ (سیواس)، ئەرکی ریکەوتنیتخوب و سنوری ئیرانیان پێ سپاردووە، پاشان دەبیتە سەرەك ئەرکانی تیپی سوپا لە ئەنقەرە (١٩٠٨)، بۆ پایەی ئەمیر لیوا بالا دەکرێ. دەیکەنە سەرکردەی تیپی بیست ویەك لە بەغدا، پاشان سالی ١٩١٠ دەگوازریتەوە بۆ تیپی سییەم لە ئازربایجان، لەوێ دەبیتە سەرکردەی (فەیلەق)ی دەیەم. سالی ١٩١١ شەری تورکی و ئیتالی بەرپا دەبێ، سەرکردایەتی تیپی پینجەمی پێ دەسپیرن، بە ئەرکی بەرگری و خۆسەپاندن لە "مضیق دەردنیل" هەلدەستێ، بەسەرکردایەتی تیپی بیست و حەوتەم بەشداری لە شەری بلقان دەکات. تووشی جەنگی غالیبولی و بولایرو سەندنەوەی ئەدرنە هاتووە. سالی ١٩١٤ لەسەر فەرمانی وەرزیری جەنگ ئەنوەر پاشا تەقاعود دەکرێ. لە ١٩١٨ جەنگ وەستینرا. کردیانە ئەندام لە مەحکەمەی عورفی سوپایی، دوایی بووە والی بروسە.. داماد فەرید پاشای (صدر الاعظم) فەرمانی پیك هینانی ئەنجومەنیکی سوپایی بەسەرۆکایەتی مستەفا پاشا دەرکرد بۆ مەحکەمەکردنی مستەفا کەمال پاشا (ئەتاتورك) و هاوریکانی لەسەردارانی نیشتمانی، کە لە رووی دەسەلاتداریەتی حکومەتی ئاستانە لە ئەنازۆل راوەستاون، لە ٢٠ ئایاری سالی ١٩٢٠ فەرمانی خنکانی پاشملەی بەسەر مستەفا کەمال و ئەمیر لیوا فوئاد پاشا و فەریق مستەفا پاشا (چقماق) وحوسین رەئووف بەگ هیتردا، بە پیی ئەوەی ئەوانە یاخی گەرن.

کاتێ بزوتنەوەکەی مستەفا کەمال کەوتە برەو و سەرکەوتنی تەواوی وەدەست هینا، لە ئاکامەکەی ترسا. لە ١٩٢١ پایتەختی تورکی بەجێ هیشت و گەرایەوە عیراق. بە وەزیرایەتی (مەعاریف) بەشداری لە حکومەتی کوردی کرد، کەوا شیخ مەحمودی حەفید لە سلیمانی پیکی هینابوو (تشرینی یەکەم ١٩٢٢). رۆژنامەیەکی لەوێ بە ناوی "بانگی کوردستان" بە زمانی کوردی و فارسی و تورکی دەردەچوواند

(٢ئاب ١٩٢٢)، دووباره ئەم ڕۆژنامەیەی بە کوردی لە بەغدا دەرکردووه (٢٨کانونی دووەم ١٩٢٦).. لە بەغدا لە ٢٥ی کانونی دووەم جیهانی بەجێ هیشت.

هاوسەرەکەی سەفیە خانم کچی حوسین پاشای خەندانە، خوشکی سەعید پاشا وەزیری تورکی بەناوبانگ بوو، مستەفا زۆر بەنەتەوەکەی خۆی دەنازێ، گوتوویەتی: "گەلی کورد بەبێ سیاسەت و زانست ژیانی نابێ"، دەلین لەکاتی سەرەمەرگا گوتوویەتی: "ئامادەبووم لە پیناوی هەتیویکی بێ کەسی کورد بە رووی پاشایەکدا بچم". مستەفا پاشا لە دوا ڕۆژانی ژیانیدا شیعری هۆنیوەتەوە لەوەی کەوا نوسیویەتی: "ئەترسم بمرم ئەی وەتەن نەبینم بەختیاری تۆ - بابنوسن لەسەر گۆرم وەتەن غەمگین و من غەمگین". بویرو دلیرانە نەفرەتی خۆی دژ بە توند ڕەوی رەگەز پەرستی‌یەتی ڕاگەیاندووه، هاندەرو لایەنگری بزووتنەوەکانی کورد بووه. لەسەر وەسیەتی خۆی لە سلیمانی لە گردی سەیوان نیژراوه، هەروەك لە پارچە شیعریکدا گوتوویەتی:

دەترسم ئەی وەتەن بمرم لە داخ هیجری تۆ
بە ئاواتم لە باوەشتا بکەم ڕۆحم سپردەی تۆ
لەوەختی غەرغەرە توخوا دوو قەترە ئاوی کانیسکان
فەقەت تابوتەکەم دانین لە بەرزی گردەکەی سەیوان

"وەرگیر"

## ئەمیر لیوا ئەمین پاشا ڕواندوزی

ئەمین ڕواندوزی لە دەوروبەری سالی ١٨٦٥ هاتۆتە جیهان. لە خویندنگای سوپای تورکی و قوتابخانەی (ئەرکانی جەنگ) دەخوینێ، بە ئەفسەری تۆپ دەچیتە ناو سوپای عوسمانی‌یەوە. لەپلەو پایەکانی پیش دەکەوێ تا بە پایەی لیوا دەگات. لە ماوەی جەنگە مەزنەکەدا سەرکردە دەبێ، پاش کۆتایی جەنگ دەگەریتەوە عیراق، بە نوینەری هەولیر هەلدەبژیردرێ (ئاب ١٩٣٥). دەیکەنە سەرەك لیژنەی کاروباری سوپایی. لە سالی ١٩٤٣ لە بەغدا کۆچی دوایی دەکات.. خۆم دیتبووم کەوا پیاویکی

پیری بە سالا چووبوو، هاموشۆی کۆڕ و مەجلیسە کۆمەلایەتییەکانی دەکرد، لەکاتی جەنگی دووەمی جیهانی دا راکانی خۆی لەسەر رووداو و بەسەرهاتەکان دەردەبری. شیوەی رووچوونی شەرەکەی لیك دەدایەوە. سامی خوندە بۆی باس کردم گوتی: سالی ١٩٣٥ بۆ مەبەستی پشکنینی دارایی دەچیتە (رمادی) لەکاتیکا لە هۆلی ئوتیلەکە دادەنیشن، لەولاشەوە لیوا بەکر سدقی سەرکردەی تیپی دووەمی لێ دەبێ لەناکاو پیاویکی لیوەشاوەی بە هەیبەت دیتە ژوورەوە، لەلایەکی سالۆنەکە دادەنیشێ، بەکر سدقی گوتی: ئەوە لیوا ئەمین پاشای رەواندوزییە.. هەستا چوو بەسلاویکی سوپایی بەخیرهاتنی لیکرد. بەریزەوە بە زمانی تورکی پیی گوت: گەورەم پاشا دەمناسییەوە؟ ئەمن بەکر سدقیم، لەکاتی جەنگی گشتی دا من (رائد) بووم لەلات!! ئەمین پاشا گوتی: بەداخەوە تۆم نایەتەوە بیر. تۆ دەزانی ئەفسەران سەرکردەکانیان لەیاد ناکەن. بەلام چۆن سەرکردەکان هەموو ئەفسەرانی ژیر فەرماندەی خۆیان لەبیر دەمینێ!!

ئەمین رەواندوزی یەکی تر هەیە کە ئیمە لە نزیکەوە دەیناسین (١٨٩٨-١٩٥٥)، نازناوی پاشایەتی نەبووە، یەکیك بوو لە ئەفسەرە کورد پەروەرەکان، دلیرانە لە پیناو ئامانجە پیرۆزەکانی نەتەوەکەی تیکۆشاوە، چۆتە ریزی ریخراوە کوردیەکانی سەردەمی خۆی، هەلویست و رۆلی بە جەرگ و بویرانەی نواندووە، دوای دابرانی لە سوپادا، سەردەمیك سەرەك شارەوانی شاری رەواندوز بووە، هەر لەویش سەری ناوەتەوە. کورەکانی د.وریا لە ڤیەنا دادەنیشێ، د.زۆزك لە ئیماراتە، چەتۆ سالی ١٩٩٤ لە نیوان بەغداد و کوت کوژرا، کچەکانی هیدی خیزانی تەیموری سالح زەکی بەگ بوو لە لەندەن کۆچی دوایی کرد، پیرۆزە لە بەغدایە.

بەهەر بارو نیازیك بووبێ کوردەکان بۆ میسر ڕەویان کردووە، جگە لە قارەمانی (حطین) و ڕزگارکەری قودس سولتانی مرۆڤ پەروەری سەروەر سەلاحەدینی ئەیوبی (١١٣٧-١١٩٣) کەوا لە تکریت، لە عیراق دەچیتە دەر، دەبیتە خاوەنی میسر و شام و ولاتی جەزیرەو موسڵ. سەردەستە و میری شاعیران ئەحمەد شەوقی بەگ (١٨٦٨-١٩٣٢) کورد نەژادە.. وەك لە باوکی گوێ بیستبووە.

## عەباس بازارلی

عەباس بازارلی ناسراو بە (سەربان): ئەفسەریکی کوردە، دەست بەکاردەبێ لە خزمەت محەمەد عەلی پاشا والی میسر، بەشداری لەشەری سودان دەکات، لەدەوروبەری سالی ١٨٠٢ هاتۆتە دنیا. لە سالەکانی ١٨٣٢-١٨٣٥، ١٨٣٦-١٨٣٨ بەریوەبەری (بەربەرە) دەبیت و هەر لەوێ سالی ١٨٣٩ کۆچی دوایی دەکات. هەروەها سلیمان بازارلی برای لە ئەفسەرانی سوپای محەمەد عەلی پاشا دەبێ، بۆ مەبەستی هینانەوەی ماڵ و خیزانی براکەی دیتە (بەربەرە)، کەچی لەوێ لە هەمان سالدا دەکوژرێ.

## عەلی ڕەزا بەگی کورد

عەلی ڕەزا بەگی کورد ناسراو بە (کوردی)، دەلین هاتنە دنیای سالی ١٨١٤ بووە، لەو هەلمەت و بەرەنگاربوونەی میسر بە سەرکردایەتی ئیسماعیل کامیل پاشا، کوری سێیەمی والی محەمەد عەلی پاشا لە سالی ١٨٢٠ لەگەڵ باوکی دیتە سودان. لە هەرەتی نەوجەوانیدا دەچیتە ناو سوپا، زۆر ناخایەنێ دەبیتە "بلوك باشی" واتە ئەفسەر لە هیزی "غەیرە نیزامی"، باج و خەراجی لە ناوچەی ڕۆژهەلاتی نیلی شین

پێ دەسپێرن، چەند سالیك بەو ئەركە هەلدەستێ، سالی ١٨٦٥ بۆ پایەی (سنجق) كە بەرانبەر – میر لیوا– یە بالا دەكرێ. لە ژێر فەرماندەی موسا حەمەدی پاشا، حاكمی گشتی سودان بە چەند بزووتنەوەیەكی سوپایی لە "سوق ابو سن"دا هەلدەستێ و پاشان بۆ قایمقام دەگۆردرێ، سالی ١٨٦٦ دەیكەنە حاكمی ناوچەی نیلی سپی، تا سالی ١٨٧١ لەو پایەی دەمینیتەوە.

حوكم دەدریت بە تۆمەتی خراپەكاری دەسەلاتدارییەكەی، پاشان بێ تاوانی لێ دەردەكەویت، بەری دەدەن و دەیگەرێننەوە بۆ فەرمانی حاكمییەتی نیلی سپی (١٨٧٥)، یاخی بوونەكەی "الشلوك"دا دەمركینیتەوە.

كە شۆرشی مەهدی لە جەزیرە بەرپا دەبێ بەشداری لە قەلاچۆكردنیدا دەكات، سالی ١٨٨٤ لە (خرطوم) گەمارۆی دەدەن، بەلام توانی لەگەلٚ ئەوانەی كە بەهۆی ئەو كەشتیانەی لە ژێر فەرماندەی (محمد نصحی) پاشاوە چوونەدەر ئەویش خۆی دەرباز بكات.

لەكاتی شۆرشەكەی سودان ئامیریەتی هێزی (غەیرە نیزامی) بۆ پاراستنی سنوری باشوری میسر وەردەگرێ، ئیتر لە ١٨٩٠ لە فەرمان دەست بەردار دەبێ و پاشان لە قاهیرە كۆچی دوایی دەكات.

## فەریق ئیسماعیل حەقی پاشا - ئەبو جبل

ئیسماعیل حەقی كوری ئەبی بەكر عەلەمدار سولتان مەحمود خانە، لە خیزانیكی كورد نەژادە، لە ویلایەتی (معموره العزیز) لە ئەنازول نیشتەجێ بوون، باوكی قایمقامی شارەكە دەبێ، ئیسماعیل حەقی لە سالی ١٨١٨ هاتۆتە دنیا، باوكی لە سالی ١٨٣٣ دەینیریتە میسر دەچیتە قوتابخانەی (القلعه الحربیه) بەدوو سالٚ تەواوی دەكات، تیكەلٚ بە سلكی سوپا دەبێ، بەشداری لە شالاوبردنەكەی ئیبراهیم پاشا دژی وەهابییەكان دەكات، ئازایەتی و نەبەردیتی ئەوتۆی نواندووە نازناوی (ابو جبل) یان بەسەردا بریوە، دەگەریتەوە میسر، چەند فەرمانیكی بینیوە، سالی ١٨٥٠

لە جیی رۆستەم پاشا دەبیتە حاکمی گشتی سودان، دوای سالیك داوا دەکریتەوە بۆ میسر، لەسەر هەندێ تۆمەت کە دەخریتە پالی حوکم دەدرێ، پاشان بەهۆی بێ تاوان بوونی بەردەدرێ. سالی ١٨٥٤ لە قرم بەرامبەر سباستوبول بەسەرکردەیی لیوایەکی میسری دەجەنگێ، پاشان سەرکردایەتی گشتی هەلمەت بردنی میسری پێ دەسپیرن، سالی ١٨٥٧ دەگەریتەوە میسر. دەیکەنە سەرەك ئەنجومەنی (طنطا) دوایی سەرکردەی پیادە (مشاە)، دەست بەرداری دەکەن لە فەرمان، بەلام پاش ماوەیەکی کەم دەیگەریننەوە بە ئەندام لە ئەنجومەنی ئەحکام، دوای ئەوە ئەرکی دامرکاندنەوەی ئاژاوەی عەرەبی (فیوم واحات)ی پێ دەسپیرن، بە بەریوەبەری (قناو أسنا) دەگەریتەوە، ئینجا سەرەك ئەنجومەنی سوپایی لە میسر (١٨٦٣)، دوایی بەریوەبەری (غەربیە) و بۆ پایەی (فەریق) بالا دەکرێ، دەیکەنە ئەندامی ئەنجومەنی ئەحکام دوایی بەرپرسیاری گشتی بەندەرەکان (١٨٦٧) ئینجا پاریزگاری قاهیرە. دەیگەریننەوە بە ئەندام لە ئەنجومەنی ئەحکام (١٨٧٤) و لە سالی ئایندەدا دەبیتە بریکاری ئەنجومەنەکە. پاشان ئەمینداری گشتی (بیت المال) (١٨٧٦)، دوایی سەرۆکی ئەنجومەنی ئەحکام (نیسان ١٨٧٩) تا لە ئەیلولی ١٨٧٩ تەقاعود دەکرێ. لایەنگری خدیو تۆفیق بووە. ئامادەی ئەو ئەنجومەنەش دەبێ کە لە کۆشکی شاهانەی (رأس التنین) کە لە ١٨٨٢ لە ئەسکەندەریە دەبەسترێ بۆ مەبەستی چارەسەرکردنی شۆرشی عورابی. پیش ئەوەی ئوستۆلی بەریتانی تۆپ بارانی قولغەکان بکات. لە ٢٥ی نیسان ١٨٨٣ کۆچی دویی کردووە.

## مشیر شاهین پاشا

شاهین کوری عەلی ئاغای کورد نەژادە بە نازناوی (گەنج) ناسراوە، باوکی لەسەردەمی محەمەد عەلی پاشا والی لەگەڵ خۆی دەیباتە میسر، لە قوتابخانەی سوپایی (سان سیر) لە پاریس دەخوینێ، لە سوپا دەست بەکار دەبێ، لەسەردەمی والی عەباس پاشای یەکەم دا بۆ پایەی قایمقام بالا دەکرێ، بەشداری لە شەری قرم

دەكات (١٨٥٣-١٨٥٥)، سالی ١٨٥٥ بۆ پایەی (میر ئالا) بالا دەكرێ، لە سالی ١٨٦٦ دەبیتە پاریزگاری قاهیرە، هەرلەو سالەدا خدیو ئیسماعیل لەگەڵ وەفدیكی سوپایی بۆ دەیراسەت و لیكۆلینەوە و هۆكاری بەرزكردنەوەی ئاستی سوپا دەینیریتە فەرەنسا، بۆ پایەی فەریق بالا دەكرێ، ئامادەی ئەو نمایشە سوپاییە دەبیت كە ئیمپراتۆر ناپلیۆنی سییەم لە پاریس سازی دابوو، ئەمەش بە بۆنەی گەرانەوەی بەتالیۆنی سودانی كە لەگەڵ سوپای فەرەنسی بۆ مەكسیك ناردرا بوو ١٨٦٧. هەر لەم سالەشدا بەوەفد دەنیردریتە سودان بۆ مەبەستی لیكۆلینەوەی یاخی بوونەكەی سەربازانی سودانی(كسلا و سواكن). لە سالی ١٨٦٩ دەبیتە وەزیری جەنگ، بە مەبەستی پشكنین سەردانی سودانی رۆژهەلات دەكات ١٨٧١، پاشان بەریوەبەرایەتی هیلی شەمەندەفەری سودانی پیدەسپیرن كە بریار بووە لە دۆلی (حلفا) و (نقلا) رابكیشرێ. لە پایەكانی سوپا پیش دەكەوێ تا دەگاتە پایەی (مشیر)، لە وەزارەتی محەمەد شەریف پاشا دەبیتە وەزیری جەنگ (نیسان تەمموزی ١٨٩٧) لەو سالەدا خدیو لی دەخریت ئەویش لەگەلی دەچیتە ناپۆلی، ئیتر لەو شارە ئیتالیەدا جیهان بەجێ دیلێ.

## بنەماڵەی تەیموری

محەمەد کاشف کوری ئیسماعیل کوری عەلی ساڵی ١٨٠١ لەگەل سەربازانی عوسمانی دیتە میسر، لەرەچەلەکدا کوردی باکوری عیراقە، دەچیتە ناو سوپای محەمەد عەلی پاشای والی، دەبیتە یەکیك لە دەست و پیوەندە تایبەتیەکانی، پایەی (کاشفی)ی پیدەدریٚ، دەبیتە پاریزگاری مەدینەی مونەوەرە (١٨٣٧)، دوایی بەریوەبەری (شەرقیە) لە دەوروبەری ساڵی ١٧٦٥ لە دایك بووە، لە ١٨٤٨ کۆچی دوایی دەکات.

کورەکەی ئیسماعیل رشدی پاشا لە پایەکانی دەولەت لەسەردەمی هەردوو والیەکەدا عەباسی یەکەم و محەمەد سەعید پاشا و خدیو ئیسماعیل پیش دەکەویٚ، بەریوەبەری هەندیٚ بەریوەبەرایەتیەکان و سەرەك دیوانی خدیو بووە، مردنەکەی لە ریکەوتی ساڵی ١٨٧٢ دەبیٚ، کچەکەی عائشەی تەیموری شاعیر و ئەحمەد تەیموری پاشای کوری ناوبانگیان دەرکرد، دوایی ئەوان دوو کورەکەی ئەحمەد: محەمەدی شاعیرو مەحمودی چیرۆك نوس ناوداربوون.

### عائیشە خانی تەیموری

عائیشە عیسمەت ساڵی ١٨٤٠ لە قاهیرە هاتۆتە دنیا، باوکی لە ماڵەوە مامۆستای تایبەتی بۆ دەگریٚ،تورکی و عەرەبی و فارسی فیر دەبیٚ و چیژی لە

ئەدەبەکـەیان وەرگرتـووە (نحـو، عـروظ، خـط) دەخوینـێ، دیوانـی شـیعر و کتیبـە ئەدەبیەکان دەخوینیتەوە، بەهەرسێ زمانەکە شیعری هۆنیوەتەوە، لە تەمەنی پانزدە سالیدا شو بە محەمەد تۆفیق بەگ ئەلئسلامبولی دەکات، کچ و کوری لیدەبێ، بەلام هاوسەرەکەی سالی ١٨٧٦ کۆچی دوایی دەکات، کارەساتی کۆستی کچە گـەنج و جوانەکەشی (تەوحیدە)ی دیتە سەر، بە کوڵ بۆی دەگری و ئەشکی گەرمی پر غـەمی بۆ دەرژینێ، شیوەنی بە پارچە شیعریکی پر سۆز و غـەمگین بۆ دەکات، سەرەتاکەی بەم شیوە دەست پێ دەکات:

ان سال من غرب العيون بحور — فالدهر باغ و الزمان غدور
طافت بشهر الصوم كاسات الردى — سحرا واكواب الدموع تدور
فتناولت منها ابنتى فتغيرت — وجنات خد شانها التغيير
فذوت ازاهير الحياة بروضها — وانقد منها مائس ونضير

خۆی لە خۆیدا بەسەرهاتیکی ناسۆرو کارەساتیکی دل تەزینە، هەستی پر ئازاری دەروونی بە شیوەیەك دەربریوە کە ناهومیدی و لە بەرچاوکەوتنی شادیو رنگینی ژیان دەبەخشیت، رەش بینیو خۆ بەدەستەوەدان بۆ ژیانی ئەوسەری سەرمەدی دەگەیەنی، ئەو دایکە جەرگ سوتاوە هۆگری خەم و پەژارە دەبێ، تائەوەی وەك گولیکی لە چڵ پچراوی فریدراو چاوە جوانەکانی کزو لیل لەژیر باری غـەما دەبێ، بەژن و بالای شەنگ و شۆخی سیس و لاواز دەبی. هەلسا شیعرە تورکیەکانی لە دیوانیکدا کۆکردۆتەوە لە ژیر ناوی "شکۆفە" دا بە چاپی گەیاند،پیشتر دیوانە عەرەبییەکەی (حليه الطراز) لە سالی ١٨٨٦ چاپ کردووە، جگە لەمانەش گەلێ شیعری هەمە جۆری تریشی هەیە سەرجەمی کتیبەکانی کە داینـاون: (نتائج الاطوال ١٨٨٨) و(مرأة التامل فى الامور). بەراستی پیشەوای راپەرینی ئەدەبیاتی ئافرەتانە لەسەردەمی نوییدا. سالی ١٩٠٢ لە قاهیرە جیهان بەجی دیلێ.

## ئەحمەد تەیمور پاشا

**لە قاهیرە لە ٧ تشرینی دووەم ١٨٧١ هاتۆتە دنیا، ناوی بە ئەحمەد تۆفیق دەبرا، کە ئیسماعیل پاشای باوکی کۆچی دوایی دەکات کۆرپەکەی سێ مانگان دەبێ، عائیشەی خوشکی بەخێوی دەکات. لە قوتابخانەیەکی فەرەنسی دەخوێنی پاشان مامۆستای تایبەتی بۆ دێنیتە مالەوە، سەرەرای زمانی فەرەنسی فێری زمانی عەرەبی، تورکی و فارسی دەبێ. خوشکە گەورەکەی عائیشەی شاعیر زۆر کاری لەسەر هەست و دەروونی هەبووە. هەر لەوەوە ئەدەب پەروەری و زمان پاراوی و بەردەوام بوون لە توێژینەوە و پێکەوتن، نەفس بەرزیو رەوشت پاکی بۆ بەجێ دەمێنی، مالەکەی ببوە یانەیەکی ئەدەبی پیاو چاك و ئەدیبانی میری و عەرەبی روویان تێدەکرد، بەهەزاران کتێب و دەستنووسی کۆ کردۆتەوە و بە "گەنجینەی تەیموری" ناونرا، دوایی مردنی درایە کتێبخانەی میسری.**

**هەلبژێردرا بە ئەندام لە کۆری زانیاری عەرەبی لە دیمەشق، لە ١٩٢٢ بووە ئەندامی ئەنجومەنی پیران (مجلس الشیوخ)، لە کۆتایی سالی ١٩٣٠ لەبەر نادروستی باری تەندروستی واز دەهێنی، لە ٢٦ نیسان ١٩٣٠ لە مەلبەندی هاتنە دنیای جیهان بەجێ دیلی، لە بەغدا کۆری ماتەمینی بۆ دەبەستری، ئەحمەد حەسەن زەییات بەشداری تێدا دەکات، مەمەد بەهجەت ئەسەری هەلبەستێکی شیوەنی تێدا دەخوێنیتەوە، سەرەتاکەی بەم شیوەیە دەست پێ دەکات:**

دنیا تجیش مأتما و ذحولا          هل انت فیها بالغ مأمولا؟

**لەو شاعیر و ئەدیبە عیراقیانەی شیوەنیان بۆ کردووە؛ جەمیل سدقی زەهاوی، مەعروف رەسافی و دکتۆر مستەفا جواد، هەروەها شاعیرانی میسرو سوریاو لوبنان و فەلەستین. لە کتێبەکانی ئەحمەد تەیمور کە چاپ کراون: التصویر عند العرب، نظرة تاریخیە فی حدوث المذاهب الاربعە، تصحیح لسان العرب، تصحیح قاموس المحیط، الیزیدیە ومنشا نحلتهم، تاریخ علم العثمانی، ظبط الاعلام، لعب العرب، ابوالعلاء المعری وعقیدتە، الاتعاب والرتب، الاثار النبویە، اعیان القرن الرابع عشر، الامثال العامیە، الکتابات العامیە، تراجم المهندسین العرب، التذکرة**

التيموريه" دووبەش "، اوهام شعراء العرب فى المعانى. جگە لەمانە کتیبی دەستخەتیشی هەیە لەوانە: الالفاظ العامیە المصریە، قاموس الکلمات العامیە "شەش بەش "...هتد.

ئەحمەد تەیمور پەیوەندیەکی بەتینی لەگەڵ (الاب انستاس ماری کرملی) زانای زمانەوانی عیراقی هەبووە، نامەیان لە بارەی ئەدەب و زمانەوانی و میژو ودەستنوسەکان ئالوگۆر کردووە.گورگیس میخائیل عەواد نامەکانی ئەحمەد تەیموری بۆ (الاب انستاس) کۆکردووەتەوە و سالی ١٩٤٧ بە چاپیان گەیاندووە، بەلام نامەکانی (الاب انستاس) بۆ ئەحمەد تەیمور، جەلیل ئیبراهیم (عطیة) پیدا هاتووەتەوە و بۆ بلاوکردنەوەی ئامادەکردووە، مەعروف رەسافی پیش مردنی قەسیدەیەکی لە سالی ١٩٤٥ لەسەر بنەمالەی تەیموری داناوە، سەرەتاکەی بەم شیوەیە:

| | |
|---|---|
| لاحمد تيمور ماثر لم تزل | تشير بتعظيم اليها الانامل |
| شوامخ كالاطواد عالية الذرى | ولكنها لا تعتريها الزلازل |
| تزيد على الجديدين جدة | وتبلى الدواهى دونها والغوائل |

## محەمەد تەیمور

شاعیر و ئەکتەر و دانەری شانۆگەری محەمەد کوری ئەحمەد تەیمور سالی ١٨٩٢ لە قاهیرە هاتۆتە دنیا، بۆ خویندنی پزیشکی رووەکاتە بەرلین، بەلام بۆ پاریس دەگوازیتەوە، ئەدەبی فەرەنسی لی خۆش هاتووە، دوای سی سال دەگەریتەوە میسر (١٩١٤)، تیپیکی شانۆگەری خیزانی پیک دینی، گەلی شانۆگەری داناوە، بە هۆی پیشنیار و وتارە رەخنەگریەکانی کە پشتی بە دیراسەت و لیکۆلینەوەکانی شانۆگەری فەرەنسی بەستوە، ئاستی شانۆگەری میسری پی بەرز کردۆتەوە. شاعیریکی ویجدان ناسک بووە، لە هەرەتی نەوجەوانیدا هەست بە نزیک بونەوەی مردنیدەکات و دەلێ:

هیئوا لی فی باطن الارض قبرا          ودعونی انام تحت التراب

فی ظلام القبور راحة نفسی          ومن النور شقوتی وعزابی

**له ٢٤ شوباتی ١٩٢١ له مەلبەندی له دایك بوونیدا مال ئاوایی له ژیان دەكات. له پاش مەرگی كتیبەكانی، له سێ بەشدا بلاوكرایەوە، ومیض الروح: دیوانی شیعر و نوسینه ئەدەبیەكان و هەندێ چیرۆك و بیرەوەریەكان. حیاتنا التمثیلیة: میژووی شانۆگەری و رەخنه له ئەكتەرەكان و داستانی ئارەزوو مەندان دەگریتەوە. المسرح المصری: عەبدولستار ئەفەندی، چۆلەكەی ناو قەفەس.**

## مەحمود تەیمور

**ئەدیبی چیرۆك نووس مەحمود كوری ئەحمەد تەیمور له ١٦ حوزەیران سالی ١٨٩٤ هاتۆته جیهان. دەچیته خویندنگای بالای كشتوكال له جیزە، بەلام نەخۆشی پەكی بەردەوام بوونی له خویندن دەخا، هەوادار و ئارەزو مەندی ئەدەب دەبێ، له پیشەوای كورته چیرۆك نووسان بووە، له سەرەتاوە چیرۆكەكانی به زمانی رەشۆكی میسری (عامه) نووسیوه، پاشان زمانی رەوانی ریزمانی به باشی فیر دەبێ، دەیكاته كەرەستەی نووسینەكانی و تییدا بالا دەست دەبێ. له سەردەمی لاویتیدا شعری پەخشانی هۆنیوەتەوە،چەندین پارچەی ئەدەبی و لیكۆلینەوەی له فەرەنسییەوە وەرگیراوەته سەر زمانی عەرەبی.**

**مەحود تەیمور له كانونی یەكەم ١٩٤٩ هەلبژیردرا به ئەندامی كۆری زمانەوانی عەرەبی له میسر، هەروەها ئەندامی پەیامنیر له كۆری زانیاریعیراقدا (١٩٦١). لەسالی١٩٤٧ خەڵاتی كۆری زانیاری زمانی عەرەبی و هی مەلیك فوئادی یەكەم (١٩٥٠) و خەلاتی واسف پاشا (١٩٥١) و خەلاتی پەسەندكاری دەولەت لەئەدەبی گشتی دا له ١٩٦٣ پیی بەخشراوە.**

**هونەركاری چیرۆك نووسانی فەرەنسی كاریان تیكرد بوو، لەسەر ریبازی ئەوانیش دەرۆیی، بەلام چۆته ناخی ژیانی واقیعی گەلی میسری و دەربرینی هەیت و ئازارەكانی، و لایەنی خیر و چاك سازی گرتووە، هەولی بەرچاوخستنی كەم و كوریه**

کۆمەلایەتیەکانی داوە. دکتۆر شەقی زەیف ی رەخنە گر بە دامەزرینەری کورتە چیرۆکی ئەدەبی نویی عەرەبی داناوە.

لەم سالانەی دواییدا لیکۆلینەوە و دیراسەتی زمانەوانی نووسیوە، بەلام ناوی نەمری بە هۆی چیرۆکەکانیەتی کە هەموو لایەنە ئەدەبیەکانی گرتۆتەوە. سەرجەم بەرهەمەکانی لەچل کتیبی ئەدەبی و کۆمەلە چیرۆك تیپەری کردووە. مەحمود تەیمور لە ٢٥ نیسان ١٩٧٣ لە کاتی گەشت و گوزاردا لە لۆزان کۆچی دوایی دەکات.

## شیخ محەمەد عەبدە

رابەر و چاکسازی خواز شیخ محەمەد عەبدە کورد نەژادە، ئەگەر چی خەیرەدین زەرکەلی لە ئیعلامەکەیا بنەچەکەی بە پال تورکمان داوە، بەلام میژوو نووس محەمەد ئەمین زەکی بەگ لە کتیبەکەیدا (ناودارانی کورد و کوردستان) بە کوردی داناوە کە ئەوەش راستیەکەیەتی.

محەمەد کوری عەبدە کوری حەسەن خیروللایە سالی١٨٤٩ لە گەرەکی (نەسر)ی سەر بە مەلبەندی شبراخیت لە بەریوبەرایەتی (بحیرە) لە میسر هاتۆتە جیهان، لەوی پیدەگا، لە سەرەتای ژیانی منداڵیدا گویی نەداوەتە خویندن، ئارەزوی مەلەوانی و سوارچاکی و تیرهاویژی دەکات، پاشان داویانەتە دەست (المودب) قورئانی لەبەر کردوە، دوای ئەوە لە مزگەوتی ئەحمەدی لە (طنطا) دەخوینی، پاشان لە ١٨٦٦ دەگوازیتەوە بۆ قاهیرە و دەچیتە ئەزهەر. لە سالی١٨٧٧ بروانامەی جیهانی وەردەگریّ. کە جەمالەدین ئەفغانی لە١٨٧١ دیتە میسر، محەمەد عەبدە پەیوەندی پیوە دەکات و هۆگری دەبی، دانایی و رەوانبیژی لیوەردەگریت، مەستی بیر و را ئازاد و چاك سازییەکانی دەبی. پوختەی موحازەرەکانی لە رۆژنامەی (میسر)دا بلاوکردۆتەوە. کە جەمالەدینی ئەفغانی فەرمانی چوونە دەرەوەی لە ١٨٧٩ پی دەدریت و لە میسر نامینی گوتویەتی: خیر و بیریکی زۆرم لە زانستی شیخ محەمەد عەبدە لە میسر بەجی هیشتووە.

محەمەد عەبدە دوای دەرچوونی لە ئەزهەر کردیانە مامۆستای ئەدەب و میژووی ئیسلامی لە (دار العلوم) و خویندنگای (الالسن) (١٨٧٨)، لە سالی ئایندەدا کە مامۆستاکەیان لە میسر دەرپەراند – واتا جەمالەدینی ئەفغانی – فەرمانی پیدرا بچیتەوە شارەکەی خۆی ئەوەش بە هۆی قەلس و پەست بوونیان لە بیرورای ئازاد و نیازە چاك سازەکەی، بەلام مستەفا ریاز پاشا سالی١٨٨٠ دەرچواندنی (الوقائع المصریە)ی پی دەسپیری زمانەکەی پاراو کرد وای لیکرد ببیتە مینبەریکی نووسەرانی هۆشیار و بەهرەوەر، لەوانە سەعد زەغلولی نەوجەوان بوو، کە شۆرشی عورابی سالی ١٨٨٢ بەرپا دەبی تۆمەتی لایەنگریەتی خراوەتە پال، داوای چوونە دەری ولاتەکەی لی دەکەن، بەرەو بەیروت بەری دەکەوی. دەبیتە مامۆستا لە کۆلیجی ئیسلامی کە شیخ ئەحمەد عەباس دایمەزراند بوو، زۆری لی نەمایەوە، لەگەل ئەفغانی لە پاریس پیك دەگەنەوە، رۆژنامەی (العروە الوثقی) دادەمەزرینی، داواکاری بیرورای ئازاد و دژ بە ئیستیعمار و لایەنگیری چاکسازیەتی بووە، لەو ماوەیەشدا سەردانی بەریتانیا و تونس دەکات، دووبارە دەگەریتەوە بەیروت بەئەرکی مامۆستایەتی لە خویندنگای سولتانیە هەلدەستی، ئەوساش (رساله التوحید) ی داناوە (١٨٨٥)، شەرحی مەقاماتی "بدیع الزمان" ی هەمەدانی "نهج البلاغە"ی کردوە، نامەکانی ئەفغانی لەبەر پەرچدانەوەی "الدهرین" وەرگیراوەتە سەر عەرەبی. بە درەنگەوە لە تەمەنی گەورەییدا فیری زمانی فەرەنسی دەبی. بەهۆی ئەوەشەوە رۆشنبیریەتەکەی سەردەم تەواو وەردەگری، ئاسۆی هۆشمەندیەتی بەر فراوانتر دەبی، لە ١٨٨٨ ریگای پیدرا بگەریتەوە میسر خدیو محەمەد تۆفیق پاشا بە قازیەتی لە مەحکەمەی ئەهلی دایدەمەزرینی، موحازەرەی لە بارەی بەیان و تەفسیر لە ئەزهەر پی دەسپیرن، پاشان لە١٨٩١ بالا دەکری و دەبیتە راویژکار لە مەحکەمەی ئیستیناف، دەیکەنە ئەندام لە ئەنجومەنی بەریوەبەرایەتی ئەزهەر، لە ١٨٩٩ دەبیتە موفتی ولاتی میسر، ئەم پایەی وایلیکرد ببیتە شوینیکی بەرز و بایەخ دار، بووە پشتیوانی پیاو چاك و ئەدیبان لەوانە: عبدالمحسن الکاضمی و محەمەد حافز ئیبراهیم، لە هەمان کاتیشدا کردیانە ئەندامی هەمیشەیی ئەنجومەنی شورای یاساکان، لە هەر بار و بابەتیکەوە کیشەو

**گرفتيك هاتبيتە پيش هەر گوى بيستى ئەو دەبوون، بە سەرۆكى ئەنجومەنى خێرخوازى ئيسلامى هەلبژيردرا، هەوليكى دلسۆزانەى زۆرى لە بوارى چاكەوخيرخوازيدا نواند، لە سالەكانى دواييدا نيوانى خديوعەباس حيلمى دووەم و سەردارى نيشتيمانى مستەفا كاميل پاشا تيكدەچێ، ناچار دەبى واز لە موفتىيەتى بينى،نەخۆش دەكەويت و دەردو بيمارييەكەشى هەر گرانتر دەبى تالە ١١ تەموزى ١٩٠٥ لە ئسكەندەريە مەرگ گيانى ليدەستينى، بە ريورەسميكى شكۆدارو پر ريزەوە لە قاهيرە دەنيژرى. لە كاتى بيماريدا گوتويەتى:**

ولست أبالى أن يقال محمد	أبل أو اكتضت علية المآتم

ولكن دينا قد اردت صلاحة	احاذر أن تقضى علية العمائم

**عبد المحسن كاضمى لە ستايش كردنيدا دەلێ:**

يا عالم الدنيا الوحيد اليكها	من شاعر الدنيا العليم الاوحد

**دواى مردنى شيوەنى بۆ دەكات و دەلى:**

أقسمت لا أسلو الأمام	وذاك جهد المقسم

اصبحت بعدك يا محمد	بين شدقي أرقم

**محەمەد حافيز ئيبراهيم لە شيوەنى دا دەلێ:**

سلام على الاسلام بعد محمد	سلام على ايامة النضرات

على الدين و الدنيا على العلم و الحجي	على البر و التقوى على الحسنات

**محەمەد عەبدە داواكارى ئەوە بووە كە دەبێ پشت بە قورئان و دەستورەكانى ببەستێ، دەرگاى بۆ چوون و ليكدانەوە بكريتەوە، دەبێ لەنگەر لە نيوان هۆش و وەحى دا رابگيرێ. لە شوين هەلگرانى ئيمامى غەزالى بووە، ريبازەكانى ئيبن تميە و ئيبن قيم الجوزيەش كاريان تێ كردبوو، بەرهەلستكەرى فرو فيلّ و خەرافات بووە، رايگەياندووە كە دەبێ رەوشت لە سەرەوەى هەموو دروشمەكانى بيروباوەر بێ،**

پێویسته دابونەریتی مەحکەمە بکرێ، کویرانە بە دوای نەکەوین، داوای نوێ کردنەوەی زمانی عەرەبی کردوە، دان بە مافەکانی گەل و میللەت بنرێ، شارستانیەتی بسەلمیندرێ بە پیی ئەوەی لەگەڵ ئامۆژگاریەکانی ئاین جیانەبێ، دژی ئیستعماری ئەوروپی بووە، بە گژ جەورو ستەمدا چووە کە لە ولاتی ئیسلامیدا هەبووە، چەندی لە توانای دا بوبێ بۆ چاکسازی کردنی ئەزهەر کردویەتی، بۆ چەسپاندنی شیرازەی خیزانی و چارەو گەشەپیدانی، داواکاری لیک بوردن و هاوکاری و تیک گەیشتن لە نیوان میللەتان و پتەوکردنی پەیوەندی ئەدەبی و کۆمەلایەتی بووە، لە شیتگیری و توند رەویدا گەلی دوور بووە، لەو موسولمانانە بووە کە گوتویانە: ئاین دەبێ زۆر بەرفراوان بێ، نیشتمان پەروەریە بێ گەردو بێ خۆپەرستی یەکەی وای کردبوو دۆست و برادەرە سەرگەرمەکانیشی لە خوتبەکانی بیزارنەبن. عورابی پاشای ئاشنای جاریك گوتویەتی: (راکانی عەبدە بۆ شەبقە لە سەریك گونجاوترە لەوەی بۆ عەمامە لە سەریك) ئەو کتیب و نوسینانەی کە لە دوای بە جیماون: "تفسیر القران الكريم" تەواوی نەکردووە. شیکردنەوەی لەسەر مەقاماتی (بديع الزمان) و لیکدانەوەی (نهج البلاغه) و (رساله التوحيد ١٨٩٧). بەرپەرچ دانەوەی لەسەر -هانوتو- (ئەوە جبرائیل هانوتو ئەدیب و میژوونوس و وەزیری دەرەوەی فەرەنسیە) وتارەکانی کەلەم بارەیەوە نووسیویەتی لە سالی ١٩٠٠ لە "المويد" بلاوی کردۆتەوەو بونەتە بنەمای کتیبەکەی "الاسلام و النصرانيه مع العلم و المدنيه" و (رساله الواردات) لەسەر فەلسەفە و تەسەوفدا، و "الاسلام و الرد على منتقديه و الرد على الدهرين" لە بنچینەدا هی ئەفغانیە وەریگیراوە..هتد. هەتا دوایی ئەوەی شایانی باسە محەمەد عەبدە لە کاتیکا واز لە موفتیەتی دەهینێ کە (عەبدول رەحمان شربینی) دەکرێ بە شیخی ئەزهەر، خدیو عەباس حیلمی لە خوتبەکەیدا کەبەو بۆنەیەوە داویەتی هیرشی هیناوەتە سەری.. ئیتر دوای ئەوە زۆری پێ ناچێ نەخۆش دەکەوێ بەرەو لای هاوریی بەرز و مەزنی خۆی دەروا.

**قاسم ئەمین**

پشتیوان و پیشەوای راپەرینی ئافرەتان قاسم بەگ ئەمین، محەمەد ئەمینی باوکی کوری میریکی کورد بووە، دەیکاتە بارمتە لە ئاستانە، پاشان لەسەردەمی خدیو ئیسماعیل هاتۆتە میسر، تیکەڵ بە سوپای میسری دەبێ تا ئەوەی دەگاتە پایەی (میر ئەلای)، کچی ئەحمەد بەگ خەتاب دەهینێ، مندالی لی دەبێ گەورەترینیان قاسم بووە سالی ١٨٦٣ لە شاری (طره)ی میسری هاتۆتە دنیا، باوکی دەیباتە ئەسکەندەریە، پاشان بۆ قاهیرەو لەوێ دەخوینێ، دوایی لە فەرەنسە لە جامیعەی مۆنبلییە حقوق تەواو دەکات، سالی ١٨٨٥ دەگەریتەوە میسر، دەبیتە بریکاری جیگری گشتی مەحکەمەی میسری تیکەلاو، پێ بە پێ لە پلەو پایەکانی "قضاء" بالا دەبێ تا دەبیتە راویژکار لە مەحکەمەی ئیستیناف دا، لە ٢١ نیسان ١٩٠٨ لە قاهیرە جیهان بەجێ دیلێ.. هەر لە هەرەتی لاویەتیدا بایەخی بە چاکسازی کۆمەلایەتی داوە، لە سالی ١٨٩٨ کتیبەکەی "اسباب و نتائج واخلاق و مواعض" دەرچواند، بۆ سالی ئایندە کتیبیکی تری بە پاڵ دا (تحرير المرأة) ئەمەش هاتووهەرای لی پەیدا بوو، محەمەد تەلعەت عەرەب بەرپەرچی بە (فصل الخطاب في المرأه و الحجاب) داوەتەوە، محەمەد فەرید وەجدی بە (المرأة المسلمة)، دوای ئەمانە قاسم ئەمین کتیبیکی تری سالی ١٩٠١ دانا، ئەمەشیان لە وەلامدانەوەی رەخنەگرەکانیەتی. بەلام پێ لیهەلبرین و توندرەوەکەی کە لە کتیبەکەی پیشودا دەری خستبو ئەم جارەیان کەمی کردبۆوە. لەو شاعیرانەی شیوەنیان بۆ کردووە: محەمەد حافز ئیبراهیم، خەلیل مەتران، عەلی جارم، عەبدولرەحمان شوکری. بانگەوازەکەی قاسم ئەمین لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بۆ رۆشنبیرکردنی ئافرەت و سەرفراز و دەرباز بونی لە گۆشەگیریدا کە بەسەری سەپابوو هیشتا زوو بوو کاتی نەهاتبوو، دەتوانین بلیین بەروبومەکەی دوای جەنگی یەکەمی مەزن لیی پەیدا بوو، ئالەو کاتەی کە ئافرەتانی میسری سالی ١٩١٩ بە خۆپیشاندانیك دژ بە داگیر کردنی سوپای بەریتانی هەلسان، حافز ئیبراهیم لە هەلبەستە بەناوبانگەکەیدا:

خرج الغواني يحتججن          ورحت أرقب جمعهنة

**له قه‌سیده‌كه‌ی تری دا ده‌لێ:**

اليكن يهدي النيل الف تحية

**هودا شه‌عراوی (١٨٧٩-١٩٤٧) راده‌په‌ڕێ و سه‌رۆكایه‌تی بزوتنه‌وه‌ی ئافره‌تان ده‌كا، به‌ سفوری بێ په‌چه‌و عه‌با پێش خۆپیشانده‌ران ده‌كه‌وێ، هه‌ر وه‌ك خاوه‌نی (ئه‌علام) ده‌لێ: هودا شه‌عراوی یه‌كه‌مین ئافره‌تی موسلمانی میسری بوو كه‌ په‌چه‌ی فریدا.**

**بانگه‌وازه‌كه‌ی قاسم ئه‌مین دره‌نگ له‌ عیراق ده‌نگی دایه‌وه‌، جه‌میل سدقی زه‌هاوی سالی ١٩١٠ وتاریكی له‌ رۆژنامه‌ی (المؤيد)ی قاهیره‌دا بلاوكرده‌وه‌ به‌رگری له‌ ئافره‌تان كردبوو، هیشتا رۆژنامه‌كه‌ نه‌گه‌یشتبوه‌ عیراق كۆكه‌و قیامه‌ت له‌ شیخه‌ شیت گیره‌كان هه‌لسا، خۆپیشاندانی خه‌لكی توره‌ی دژ به‌ شاعیر هاته‌ ئاراوه‌، خواستی كوشتن و خوین رژانیانی ده‌كرد، له‌ مامۆستایه‌تی خویندنگای حقوق یان خست، ناچار له‌ ترسی گیانی نه‌یده‌ویرا بیته‌ ده‌ر خۆی له‌ ماله‌وه‌ گۆشه‌گیر كرد، روو له‌ ژنه‌كه‌ی ده‌كاو ده‌لێ:**

ابثين ان اودي جميلك خابطا    بدم لة اهريق فوق رغام

فتذرعي للخطب صبرا و امسحي    من ادمع فوق الخدود سجام

**له‌و مه‌ینه‌تی و لی قه‌ومانه‌یدا شاعیری ئازادی خوازی میسری (ولی الدين يكن) به‌ هانای دیت و سه‌رفرازی ده‌كات. بزووتنه‌وه‌ی رزگاری ئازادی ئافره‌تان و لادانی په‌چه‌و سه‌رپۆش له‌ده‌وروبه‌ری سالی ١٩٢٤-١٩٢٥ له‌ عیراقدا سه‌ری هه‌لداو كه‌وته‌ جموجۆل و كۆمه‌لیكی ئافره‌تان دامه‌زرا، مشتومرو ململانێ به‌ شیعرو په‌خشان له‌ نیوان لایه‌نگرانی په‌چه‌و سه‌رپۆش و ناحه‌زانی به‌رده‌وام بوو. قاسم ئه‌مین ده‌لێ: هه‌رچه‌نده‌ بیر له‌ به‌خته‌وه‌ری ده‌كه‌مه‌وه‌ ئافره‌تیكم دیته‌ به‌رچاو كه‌ جوانی و شۆخی ژن و ئه‌قل و هۆشی پیاوی هه‌یه‌. قاسم ئه‌مین حه‌زی به‌ هونه‌ر ده‌كرد، برِوای وابوو ژیان خۆی له‌ خۆیدا خۆشه‌ویستی و میهره‌بانی و لیبورده‌یی و ئاشتیه‌ و نیشتمان په‌روه‌ری راسته‌قینه‌ ده‌بێ كه‌مدووبێ خۆهه‌لكیش نه‌بێ.**

**ئەحمەد شەوقی شیوەنی قاسم ئەمین دەکا: سەرەتاکەی بەم شیوەیە دەست پێ دەکا دەڵێ:**

ان المصيبة في الامين عظيمة          محمولة لمشيئة الاقدار

**محەمەد حافز ئیبراهیم دەڵێ:**

لله درك كنت من رجل          لو أمهلك غوائل الأجل[1]

**دکتۆر شوقی ضیف دەڵێ: قاسم ئەمین ئاڵای چاکسازی کۆمەلایەتی هەلگرتبوو، رای وابوو گرنگترین هۆی دواکەوتنی میسر لە چاو رۆژئاوادا سەرپۆشیی و نەخویندەواری ئافرەتە، دەستەوەستان کردنی بە شیکی زیندوی کۆمەڵ، پێ شیل کردنی مافەکانیەتی لە شوکردن بەلکو لە ژیاندا، وتارەکانی لەو بارەیەوە لە رۆژنامەی "المؤيد" سالی ۱۹۰۰ بلاوکردۆتەوە، پاشان لە کتیبەکەیدا (تحرير المرأه) کۆی کردۆتەوە[2].**

## عوسمان ئەبوبەکر دقنە

**"أميرا الامراء" لە سوپای محەمەد ئەحمەد مەهدی سەرداری ئایینی سودانی کەوا لە سالی (۱۸۸۲-۱۸۸۵) لەگەڵ لەشکری میسری و بەریتانی بەشەر هاتووە بەسەریاندا زاڵ دەبێ و دەست بەسەر (خرطوم)دا دەگرێ. پاش ماوەیەکی کەم مەرگ لە ۱۸۸۵ یەخەگیری دەبێ. عوسمان سالی ۱۸۳۷ هاتۆتە دنیا، وای رادەگەیاند گوایە لە رەچەلەکی خەلیفەکانی بەنی عەباسە، بەلام دەلین باپیرانی لە بابرا کوردی دیاربەکرن، بەشداری لەو هەلمەتەی سوپاییە دەکەن کە سولتان سەلیمی یەکەمی عوسمانی سالی ۱۵۱۸ بۆ سەر سەواکنی ناردووە، لەوێ لەگەڵ عەشیرەتی بیجای خۆمالی نیشتەجێ دەبن، عوسمان سەرەتای ژیانی بە بازرگانی دەریایی لەگەڵ کەنارەکانی عەرەبی دەست پێ دەکات. ئینگلیزەکان ۱۸۷۷ سەبارەت بە هینانی**

کۆیله بۆ سودان دەیگرن و دەیدەنە دەست کاربەدەستانی میسری و بەندی دەکەن و دەگەریتەوە (سواکن).

لەسەردەمی شۆرشی عورابی لە میسر هەولی دا خەلکی جۆش خواردو هانبدا، بەلام لەوەدا سەرناکەویٚ، ناچاری دەکەن شارەکە بەجیبیلیٚ، روو دەکاتە بەربەرە، پاشان لە سالی ١٨٨٣ دەچیتە پاڵ مەهدی، بەرەو (ابیض) بەریٚ دەکەویت، دەیکەنە ئەمیر. دەگەریتەوە گردو تەپۆلکەکانی دەریای سور، خەلك و حەشاماتی عەشیرەتی بیجا کۆدەکاتەوەو بەگژ میسری و بەریتانیەکاندا دادەچیٚ. لە چەندین شەری جیاجیادا بەسەریاندا زاڵ دەبیٚ هیزەکانیان تەفرو تونا دەکا، دوایی سەرگەرمی و ورەی جەنگاوەرەکانی عەشیرەتەکەی دادەبەزی، داوای لیدەکریٚ بگەریتەوە (ام درمان). لە ١٩٠٠ پاش ئەوەی سودان داگیر دەکریتەوە بزوتنەوەکەی مەهدی لەناودەبریٚ. دەیگرن دەیخەنە بەندیخانەی "رشید طره" دوایی لە ١٩٠٨ لە دۆلی (حلفا) بەند دەکریٚ، لە تەمەنی پیریەتی دا روو دەکاتە تەسەوف، لە ١٩٢٤ دەچیتە حەج، پاشان دەگەریتەوە دۆلی (حلفا) لەویٚ لە سالی ١٩٢٦ کۆچی دوایی دەکات، ناوبانگی زۆر بەهۆی ئازایەتی و نەبەردی لە شەرەکاندا پەیدا کرد.

پەراویز:

(١)شیعرەکەی ئەحمەد شەوقی و محەمەد حافیز ئیبراهیم، زیاتره لەوەی بەرچاو خران، بە پیویست نەزاندرا هەمووی بنوسین. "وەرگیر"

(٢)محەمەد حوسین هەیکەل پاشا، لەسەر قاسم ئەمینی نوسیووە، زۆر لایەنی کەسایەتی و ڕەوشتی بەرز و هەلویستی  نیشتمانی و دلسۆزی وچاکسازی کۆمەڵایەتی دەرخستووە.

# کوردەکانی حیجاز

## شیخ محەمەدی کورد

زانای شافیعی لە ولاتیحیجازدا شیخ محەمەد کوری سلیمان کورد سالی ١٧١٥ لە دیمەشق هاتۆتە دنیا، لە مەدینە پیگەیشتووە، لەوی دەبیتە موفتی شافیعی هەتالە سالی ١٧٨٠ کۆچی دوایی دەکات، زۆر کتیبی داناوە لەوانە: الفتاوی، الحواشی المدنیە علی، شرح ابن حجر للمقدمة الحضرمیة (فی جزاین)، شرح فرائص التحفة، عقود الدرر، فتح الفتاح (فی الحج)، زهر الربی فی بیان احکام الربا، الفوائد المدنیە فیمن یفتی بقولە من أئمە الشافعیە، الثغر البسام ...هتد.

## عەلی زوهری شیروانی

عەلی کوری محەمەد کوری عەلی زوهری شیروانی لە سالی ١٧٢٢ لە مەدینە هاتۆتە جیهان. هەر لەویش سالی ١٧٨٥ کۆچی دوایی دەکات، لەوێ سەرۆکی زانایانی حەنەفی دەبێ. پەراویزی لەسەر "فقە"داناوە و بەرهەمی هەلبەستی هەبووە.

## محەمەد ماجدی کورد

محەمەد ماجد کوری محەمەد سالح کوری شیخ فەیزوللایە، باپیری لە ولاتی کوردەوارییەوە ڕوودەکاتە (مەکە) لەوی لە ١٨٧٥ هاتۆتە دنیا. هەر لە سەرەتای پیگەیشتنیەوە شەیداو هۆگری کتیب دەبێ، چاپخانەیەك دادەمەزرینێ، زۆر کتیبی بلاکردۆتەوە، بازرگانیەتی کتیبی کردۆتە پیشەی خۆی، لەسەردەمی شەریف حوسین دا توشی ئەشکەنجە دەبێ، کاتێ ولاتەکە دەکەویتە ژیر دەسەلاتداریتی مەلیك عەبدولعەزیز ئال سعود، لەگۆشە گیری دەردەچێ. دەیکەنە ئەندامی ئەنجومەنی شورا، پاشان بریکاری بەریوەبەری (مەعاریف)، دوایی بەریوەبەری ئەوقاف، سالی

١٩٣١ له مه‌لبه‌ندی له دایك بونیدا جیهان به‌جیدیلیٚ. و گه‌لیٚ ده‌ست خه‌تی له پاش به‌جیٚ ماوه له‌وانه : معجم كنز العمال، معجم التخامس، المنتخبات الماجدیه، و پیرست دانان بۆ كتیبخانه تایبه‌ته‌كه‌ی كه زۆر بایه‌خی به كۆكردنه‌وه‌ی دابوو.

# كورده‌كانی سوریا

## هۆلۆ پاشا و بنەماڵەکەی

محی الدین ئەبول هۆل بە ناوی هۆلۆ پاشا ناسراوە، کوری عەبدولقادر عابدی کوردە، لە پیاوە ماقولەکانی دەولەتی عوسمانی بووە، پەیوەندی بە سولتانەکانەوە دەبێ، پلەو پایەکانیان وەردەگرێ. ساڵی ١٨٧٧ دەبیتە ئەمیری حەج، لە ١٨٩٥ جیهان بەجێ دیلێ.

کورەکەی ئەحمەد عیزەت پاشا راویژکاری سولتان عەبدولحەمیدی دووەم ناوبانگی دەرکرد. لە ساڵی ١٨٥٥ هاتۆتە دنیا، لە بەیروت دەخوینێ، لە دادگەری سوریا بە پشکنینەر دادەمەزرێ، بەلایەنگرانی ئازادی خوازو چاکسازان ناسراوە، رۆژنامەیەکی حەفتانەی بە زمانی عەرەبی و تورکی بە ناوی (دیمەشق) دەرچواندوە (١٨٧٨)، پاشان بەسەفەر دەچیتە ئاستانە لە ریگای "ابی الهدی الصیادی الدفاعی" پەیوەندی بە سولتان عەبدولحەمیدی دووەمەوە دەکات، دەبیتە نووسەری دووەمی سولتان (١٨٩٥). لە پیاوە سیاسەتمەدارە هۆشمەندەکان بووە، هەولی داوە پەیوەندی تورکیا بە دەولەتە ئەورپیەکانەوە ببەستێ و هیلی ئاسنینی شەمەندەفەری حیجاز دابمەزرینێ، دوای کودەتاکەی ساڵی ١٩٠٨تورکیا بەجێ دیلێ روودەکاتە لەندەن، لە هاتوچوونی نیوان ئینگلتەرەو سویسراو فەرەنسەدا دەبێ، لە ئاکاما لە میسر نیشتەجێ بووە.

لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٣ جیهان بەجێ دیلێ. لە تورکیەوە کتیبی (حقوق الدول) و (تأریخ جودت) وەردەگیرێ.

پاشی ئەو محەمەد عەلی بەگ عابد کوری ئەحمەد عیزەت پاشا سەرەك كۆماری سوریا ناوبانگی دەرکرد. ساڵی ١٨٧٢ لە دیمەشق هاتۆتە دنیا، لە خویندنگای (غلطة سرای) لە پایتەختی تورکیا خویندویەتی، پاشان روو لە پاریس دەکاو حقوق دەخوینێ، دەگەریتەوە ئەستەنبوڵ، لە فەرمانگەی راویژکاری حقوقی وەزارەتی

دەرەوە دادەمەزرێ. پێ بە پێ لە پایەکانی وەزارەتدا تێ هەلدەچێ، تا ئەوەی لە سالی ١٩٠٥ دەیکەنە وەزیری مفەوەزی تورکی لە واشنتۆن، لەو پایەی دا دەمینیتەوە هەتا دەرچوونی دەستور (تەموزی ١٩٠٨) ژیانی لە نیوان سویسرە، فەرەنسە، ئینگلتەرە و میسر بەسەر دەبا، کە شەرە مەزنەکە کۆتایی پێ دێ لە هەریمی میسر نیشتەجێ دەبێ، لە هاوینی ١٩٢٠ دەگەریتەوە دیمەشق، بە نوینەر هەلدەبژیردرێ (١٩٢٢)، لە ئەنجومەنی یەکیتی سوری دەبیتە وەزیری دارایی کەوا دەولەتی فەرەنسی دایمەزراندبوو (١٩٢٢-١٩٢٣)، لە کۆتایی نیسانی ١٩٣٢ دەبیتە سەرەك کۆماری سوریا، لە٢٢ تشرینی ١٩٣٩ لە پاریس کۆچی دوایی دەکات، تەرمەکەی دەهیننەوە دیمەشق و لەوێ دەنیژرێ.

## ئیبراهیم بەگ هنانۆ

سەرداری نیشتیمان پەروەری سوری ئیبراهیم کوری سلیمان ئاغای هنانۆ لە سالی ١٨٦٩ لە کفر حارم رۆژئاوای حەلەب هاتۆتە دنیا، لە خیزانیکی دیرینی حەلەبی کورد نەژادە. لە خویندنگای (الملکی الشاهانی) ئەستەنبۆل دەخوینی، لە سەردەمی عوسمانیەکانا پایەی جیاجیای بەریوەبەرایەتی بینیوە، لە چەندین قەزا قایمقام دەبی، سالی ١٩٠٨ دەگەریتەوە شارەکەی خۆی، هەلدەبژیردری بە ئەندام لە ئەنجومەنی گشتی حەلەبدا، پاشان سەرقالی جیبەجێ کردنی پرۆژە کشتوکالیەکانی دەبیت. کە سوپای عەرەبی سالی ١٩١٨ دیتە ناو شاری حەلەب، دەگەریتەوە و هەلدەبژیردری بە ئەندام لە کۆنگرەی سوری لە دیمەشق، کەفەرەنسا سوریا داگیر دەکاو ئینتیدابی بەسەر دا دەسەپینن، لە باکوری حەلەب بە گژیاندا دەچێ و تووشی دەردە سەرییان دەکا، پاشان روو دەکاتە عمان، سەردانی فەلەستین دەکا، کاربەدەستانی بەریتانی لە قودس دەیگرن دەیدەنە دەست فەرەنسییەکان لە حەلەب، حوکمی دەدەن، بە پیی ئەوەی بزوتنەوەکەی سیاسی بووە، بەری دەدەن، تەکان دەدا بۆ مەیدانی سیاسی، دەکەویتە بەرهەلستی دەولەتی داگیرکەر، تا لە تشرینی دووەم ١٩٣٥ لە حەلەب جیهان بەجێ دیلێ.

**میژوونوسی لوبنانی یوسف ئیبراهیم یزبك دەڵێ: لینین سەرداری سۆڤیەتی چوار نامەی بە دەست خەتی خۆی بۆ هنانۆ نووسیوە داوای لیکردوە هاریکاری لەگەڵ بزوتنەوەکانی رزگاری خوازی نیشتیمانی لە ناوچەکەدا بکا، لە خەبات و ململانیی عەرەب دژ بە ئیستعمار، پشت بە یارمەتیدانی سۆڤیەتی ببەستێ.**

**لە کاتی مردنیا شاعیران شیوەنیان بۆ کردووە. شاعیری شام شەفیق جەبری لە سەرەتای پارچە شیعرەکەیا دەڵێ:**

لمن النعش مائجا بمصابة　　زاجفا بالحمى و زهو شبابه

**محەمەد سلیمان ئەحمەد بە دەوی دەڵێ:**

أنزة ألامي عن الدمع و الاسى　　فتونسها مني الطلاقة والبشر

**شاعیری عیراقی ئەنوەر شائول گوتویەتی:**

صرخة كالرعد في قصفته　　ليملا الافاق رعدا ودويا

**عومەر ئەبو ریشە شیوەنی بۆ دەکا دەڵێ:**

هنانو أي صاعقة اقضت　　على صرح من العليا مشير؟

**شیخ فوئاد خەتیب گوتویەتی:**

سل الفلك الدوار ما للكوكب　　شواحب في الابراج غير ثواقب؟(١)

## محەمەد کورد عەلی

**لە ناودارانی نوێ خوازی ئەدەبی عەرەبی محەمەد فەرید کوری عەبدول رەزاق کوری محەمەد کوری عەلی، لە ئازاری ١٨٧٦ لە دیمەشق لە دایك بووە، بنەچەکەی دەچیتەوە سەر خیزانیکی سلیمانی، پیش سەدەو نیویك روو دەکەنە شام. دایکی**

چەرکەس و باوکی بازرگان و کشتیاربووە، لە ساواییەوە باوکی بایەخی بەفیربوون و خویندنی داوە ، زمانی عەرەبی، تورکی، فەرەنسی، فارسی دەخوینی. سالەهای لە خویندنگای ناوەندی (رشدیه)و قوتابخانەی (الاباء اللعازرین) بەسەر بردووە، پاشان دەچیتە لای شیخ تاهیری جەزائیری سوودی زۆری پیدەگەیەنی. باشترین کتیب دەخوینیتەوە، بژاردەی شیعرومەقاماتی ئەدەبی لەبەر دەکات، تا لە نوسین وبەیان بەهرەوەر دەبی، لە تەمەنی بیست سالی دا رۆژنامەیەکی رەسمی لە دیمەشق بەناوی (شام) دەردەچوینێ سێ سال لیی کارمەند دەبی، ئالوگوری نامە لەگەل گۆڤاری (المقتطف)ی ناودار دەکا، سالی ١٩٠١ بەسەردان دەچیتە میسر، ماوەی ١٠ مانگ رۆژنامەی (الرائد المصری) دەرچواندوە، دەگەریتەوە دیمەشق بەلام کار بەدەستانی تورکی بەتۆمەتی بیروڕای ئازاد و سەربەستی تەنگی پیهەلدەچنن. دیسان دووبارە روو دەکاتەوە میسر، پەیوەندی بە شیخ محەمەد عەبدەو پیاوچاکانی تریانەوە دەکا. لە کانونی دووەمی ١٩٠٦ گۆڤاری (المقتبس) دادەمەزرینی، لە هەمان کاتیشدا رۆژنامەی (الظاهر) و (المؤید) دەگریتە دەست. کە دەستوری تورکی لە ١٩٠٨ راگەیەندرا رۆژنامەگەری ئازادو بیرورا بەرەلا دەبی، محەمەد عەلی کورد دەگەریتەوە دیمەشق، لە دەرچواندنی گۆڤاری (المقتبس) دا بەردەوام دەبی.

لە نۆزدەی کانونی یەکەم دا رۆژنامەیەکی تریشی بەهەمان ناو خستە پالی، دەبیتە مەیدانیك بۆ خامەی گەورەترین نووسەران و ئامرازیکی دژ بەسیاسەتەکەی تەتریکی عوسمانی. بۆیە کاربەدەستانی تورکی تەنگەتاوی دەکەن، بەرەو میسر دەرواتەوە، سەردانی ئەورویا دەکا، پاشان دەگەریتەوە رۆژنامە رۆژنانەیەکەی بۆ ئەحمەد کورد عەلی برای بەجی دیلێ و خۆی بۆ گۆڤارەکە تەرخان دەکات. شەری گشتی بەرپا دەبێ (١٩١٤) خەریك بوو خۆی و ئازادی خوازانی تری هاوریی بدرینە دیوانی جەنگی عورفی، بەلام جەمال پاشای والی قەناعەتی هینا کە لەبنەرەتا ناحەز بە فەرمانداریتی تورکی نەبووە، داوای لی دەکا رۆژنامەکەی دەربچوینیتەوە، دەرهینانی رۆژنامەی (الشرق)ی پێ دەسپیرێ کەوا لە سالی ١٩١٦ دەری دەچواند، خامەی ناودارترین ئەدیب و نووسەرانی بۆ دەخاتە کار، وەك عەبدول قادر مەغریبی،

شەکیب ئەرسەلان، تاجەدین حوسنی و محەمەد حەبیب عوبیدی موسلاوی، بە مەبەستی بانگەواز بۆ تورکیا و سوپاکەی. خەیرەدین زرکلی دەلێ: لە ماوەی شەرەکەدا بە نابەدلی زمان و خامەکەی بۆ بانگەوازەکەی بەکارهیناوە، دوای بەسەر چوونی شەرەکەش ترسی جەمالی هەر هەبوو. لە ئاکامی دەرچوونی تورکەکان لە شامدا کورد محەمەد عەلی بۆ ئاستانە دەروا، پاشان زۆری پێ ناچێ لە سی تەمموزی ١٩١٩ بە دامەزراندنی کۆری زانیاری عەرەبی هەلدەستێ، هەتا پایانی ژیانی بە سەرۆکایەتییەکەی دەمینیتەوە[٢].

پەراویز:

(١ )ئیمە تەنیا سەرەتای شیعرەکانمان خستە بەرچاو. "وەرگیر"

(٢ )ناوی بە کۆری زانیاری و گۆ ڤارو کتیبخانەکەیەوە بەند بوو، بە پەرۆشەوە سەرپەرشتی ئەو دەزگایانەی کردووە تا بتوانن پەیامی رۆشنبیری خۆیان بەتەواوی بەجێ بینن.

لە وەزارەتی جەمیل ئەلشی دەبیتە وەزیری مەعاریف (ئەیلول ١٩٢٠)، دووبارە ئەم وەزارەتە لە ژیر سایەی ئینتیدابی فەرەنسی وەردەگریتەوە (شوبات ١٩٢٠).

جارەها گەشت و گوزاری بۆ ولاتانی ئەوروپا کردووە، لە کۆری زمانەوانی عەرەبی دەبیتە ئەندام لە کاتی دامەزراندنی دا(١٩٢٤). خوی داوەتە لیکۆلینەوەو نووسین، بە دەیان کتیبی داناوە جگە لە سەدان لیکدانەوە و لیتۆژینەوە لەوانە: خطط الشام (٦ مجلدات)، الرحله الانوریه الی الاصقاع الحجازیه و الشامیه (١٩١٦)، غرائب الغرب (جزان ١٩١٠)، غابر الاندلس و حاضرها (١٩٢٣)، الحکومه المصریه فی الشام (١٩٢٥)، دیمەشق مدینه السحر و الشعر (١٩٤٤)، القدیم و الحدیث

(١٩٢٥)، تاريخ الحضارة لە فەرەنسییەوە وەرگیردراوە، دانەرەکەی شارڵ سنیۆبۆس، الادارە الاسلامیە في عز العرب (١٩٣٤)، الاسلام و الحضارة العربیە (مجلدان ١٩٣٤)، امراء البیان (مجلدان ١٩٣٧)، اقوالنا وافعالنا (١٩٤٦) دانانی چەندین کتیبی ترو لیکۆلینەوەو بەرهەمی تر... لە دووی نیسانی ١٩٥٣ لە دیمەشق ماڵ ئاوایی لە ژیان کردووە.

# پیاوانی ئاینی و ئەدەبی

# بنەماڵەی حەیدەری

بنەماڵـەی حـەیدەری ناوبانگیـان بـەوە دەرکـردووە کـە زانـای ئاینیـان زۆر لـێ هەلکەوتووە، لەوانە: سوبغەتوللا حەیدەری دووەم، موفتی شافیعی لە بەغداو دانەری "المسائل الایقانیه فی الاجوبه علی الاسئله الایرانیه" لە سالی ١٨٦٣ کۆچی دوایی کردووە.. ئیبراهیم فەسیحی کوری زانای میژوونووس کـۆچ کـردوی سـالی ١٨٨٢، لەوان: محەمەد ئەمین کوری عەبدوللا حەیدەری لە ١٨٦٣ مردووە، هەروەها لەو زانا کوردانەی کە ناودار بوون شیخ محەمەد مارانی[1] مامۆستای عەبدولوەهاب نائیب و گەورە زانایانی تر، شیخ محەمەد سالح سەهرەوەردی لە کتیبەکەیدا (لب الالباب) دەلێ: لە عیلم الکلام، بالا دەست و لە هونەری (معقول) بەهرەداربوو، لە دەمەتەقە و وتوویـژدا بە تایبەتی لەگەڵ مادی یەکەم بڕواکاندا بە توانا بـوو، کـۆڕو مەجلیسی دەرس وتنەوەی لە قوتابخانەی سلیمانی و بەغدا هەردەم پڕ موریدو سوختەو قوتابی بوو، سالی ١٨٩١ لە تەمەنی نزیکەی حەفتا سالی دا جیهان بەجێ دیلـێ. لـەوانی تریان: شیخ ئەبو هودا عیسا سەفائەدین بەندەنیجی کوری موسا جەلالەدین قادری نەقشبەندییە، بە ناوی شارەکەی خۆی ناودەبرێ، (بەندەنیجن)ی پشان شارەکە بە (مەندەلی) ناسرا کە دەکەویتە رۆژهەلاتی بەغدا نزیك سنوری ئیران، لە دەوروبەری سـالی ١٧٨٩ هاتۆتـە دنیـا، لەسەردەسـتی چاکـترین زانایـانی سـەردەمی خۆیـا دەخوینێ، دەستیکی بالای لە عەرەبی و ئەدەبیاتی هەردوو زمانەکە تورکی و فارسی

دا هەبووە، دەرسی لە قوتابخانەی داود پاشا لە بەغدا گوتووەتەوە، کتێبێکی لەسەر بەغدا و دەوروبەرەکەی داناوە، هەلبەستی ناسکی هۆنیوەتەوە، مردنەکەی لە بەغدا ریکەوتی سالی ١٨٦٧ دەبێ، کتێبی (اولیاء بغداد) لە تورکییەوە وەرگێراوە کە دانەرەکەی مورتەزال ئال نەزمی‌یە، دەست خەتەکەی لەلای مێژوو نووس عەباس عەزاوی دۆزراوەتەوە، هەروەها لە زانایانی تریان مەحمود رۆژبەیانی کۆچ کردووی سالی ١٨٥٣ و عەبدولرەحمانی کوری کەوا لە هەمان سالدا دوای مردنی باوکی بە چەند مانگێك ئەویش جیهان بەجێ دیلێ، یەکێتر لەوان حاجی رەسولی کورد کۆچ کردووی سالی ١٨٦٠.

## ئیبراهیم فەسیح حەیدەری

ئیبراهیم فەسیح کوری سوبغەتوللا کوری محەمەد ئەسحەد سەدرەدین موفتی حەنەفی کوری عوبەیدوللا حەیدەری شافیعییە، سالی ١٨٢٠ لە بەغدا هاتۆتە دنیا، لەوێ لای زاناکان دەخوێنێ، زانا و ئەدیب و مێژوو نوس بوو، لە بەغدا (نیابە القظاء) وەردەگرێ. گەلێ کتێبی داناوە لەوانە: المجد التالد فی مناقب الشیخ خالد (لە ئاستانە چاپکراوە ١٨٧٥). (تطبیق الهیە الجدیدە، الاثار علی بعض الآیات الشریفە، وبعض الاخبار استانە١٨٧٥) احوال البصرە (بغداد ١٩٦١)، عنوان المجد فی بیان احوال بغداد والبصرە و النجد (١٩٦٢)، فصیح البیان فی تفسیر القرأن. هەروەها دیوانی ئەبی تەمام و مەقاماتی حەریری شیکردۆتەوە، لەگەڵ دانانی پەراویز لەسەر (نحو صرف). لە ٢٦ کانونی یەکەم ١٨٨٢ لە بەغدا جیهان بەجێ دیلێ.

ئیبراهیم فەسیح لە کتێبەکەیدا (المجد) لەسەر عەشیرەتەکانی کوردی عیراق دواوە لەوانە: باسی عەشیرەتی سرچی و خۆشناو دەکا و دەلێ: ئەوانە ژمارەیان زۆرن و ئازان، ناکۆکی و شەر لە نیوانیاندا بەردەوامە، زانای بلیمەتیان تیا هەلکەوتوە لەوانە: زانای پایە بەرز محەمەد خەتێی بالەکییە، لە زیبارییەکانیش

(وەلی ئەحمەد گەلالی) لە مزورییەکان: (گەورە شیخانی عیراق شیخ یەحیای مزوری ئامیدییە).

عەشیرەتی بلباس بێ شومارن، ئازاو نەبەرد و خۆراگرن، زانای بلیمەتی پایە بەرز (مەولانا زیائەدین خالید عوسمان نەقشبەند) یان لی پەیدا بووە. باسی عەشیرەتەکانی تریش دەکات لەوانە: شوان، زەند، زکمە.

## محەمەد ئەمین زەند

محەمەد ئەمین زەند ناسراو بە (الكهيه) کوری ئەحمەد زەندی زانای مودەریسە، لەلای زانایانی سەردەمەکەی دەخوێنێ، خەریکی دەرس وتنەوە دەبێ، دوایی لە جیگای ئەبی سەنا و مەحمود شەهابئەدین ئالوسی دەیکەنە موفتی بەغدا (١٨٥١)، تاکو سالی ١٨٥٤ لە پایەکەی بەردەوام دەبێ. دوای ئەوە دەیکەنە (کەهییە) واتا یاریدەدەری والی بەغدا، پاشان رووەکاتە ئاستانە، دەبیتە ئەندام لە ئەنجومەنی شورای دەولەت. لە پینجی حوزەیرانی ١٨٦٨ لە پایتەختی تورکی مالئاوایی لە ژیان دەکا، یاداشتەکانی خۆی لەسەر رووداوەکانی بەغدا نووسیوە. میژوونووسی تورکی ئەحمەد لوتفی کۆچ کردووی ١٩٠٧ پشتی بە نووسینەکانی ئەو بەستووە لە بارەی بەسەرهاتەکانی سالی ١٨٢٥ هەتا دوای سەردەمی مەمالیك، عەباس عەزاوی دەنگوباسی ئەوی لە میژووەکەیدا (تأريخ العراق بين احتلالين) راگەیاندووە. کامیل بەگی کوری خانوەکەی دەکاتە (وەقف) کە بە (جامع کهییە) دەناسرێ، کتیبخانە بەهادارەکەشی دەبیتە بەشیك لە پەرتوکخانەی ئەوقاف.

## موفتی زەهاوی

شاعیری عیراقی عەبدول باقی عومەری دەلێ:

| | |
|---|---|
| قد قيل لى اذ رحت انشد عندما | شاهدت دين محمد يتجدد |
| فى مذهب النعمان بالزوراء قد | افتى الامام الشافعى محمد |

محەمەد ئەمین فەیزی کوری میر ئەحمەد بەگ کوری حەسەن بەگ کوری رۆستەم بەگ کوری کەیخەسرەو بەگ کوری میر بابا سلیمانی باپیرە گەورەی بنەماڵەی بابانە، لە ساڵی ۱۷۹۷ لە گوندی زەهاو (یان زەهاب) هاتۆتە دنیا، هەر بەم شوینەوەش دەناسریّ. لەسەر دەستی شیخ مەعروفی نۆدیّ لە سلیمانی دەخوینی، پاشان هەر بۆ مەبەستی خویندنی زانست روو دەکاتە سنە (سنندج) لای عەلی شیخ محەمەد قەسیم. دوایی لەلای محەمەد کوری رەسول لە ساوجبلاق (سابلاغ) دەخوینی. کاتی ئیجازەی لی وەردەگری تەمەنی بیست سالان، دەبیّ دەگەریتەوە سلیمانی دەبیتە مەلای مزگەوتی عەبدولرەحمان پاشا، خۆی بۆ دەرس وتنەوەو سود بەخەلك گەیاندن تەرخان دەکات. پاشان بەرەو کەرکوك دەروات ماوەیەکیش لەوی دەرس دەلیتەوە. دوایی لە ۱۸۵۰ روو دەکاتە بەغدا پیش چونەکەی ناوبانگی دەگاتە ئەوی، دەیکەنە سەرۆکی مامۆستایان، دوای چوار سال لە ۱۸٥٤ والی محەمەد رەشید پاشا کۆزلکی لە جیگای محەمەد ئەمین زەند دەیکاتە موفتی بەغدا، هەتا پایانی ژیانی لە پایەکەیدا دەمینیتەوە (۱۵ کانونی یەکەم ۱۸۹۰). نزیکەی حەفتا سالی بەدەرس وتنەوەو وەعزو فتوا بەسەر بردوە.

عەبدول غەفار ئەفرەس دەلیّ:

اری فی لفظ هذا الشهم حسنا — ینبئی عن مدی علم عظیم[٢]

ومهما زدتة نظرا بفکری — رایت نهاة قطاس العلوم

لە هەلبەست و پەخشاندا بالا دەست بووە، زانیارییەکی بەرفراوانی لە ئەدەبی فارسیو عەرەبی دا هەبووە لە شوینیکدا دەلیّ:

لاتدع فی حاجة بازا ولا اسدا — اللة ربك لا تشرك بة احدا

محەمەد ئەمین زەکی بەگ لە لیکدانەوەی ئەم بەیتەدا دەلی: مەبەستی لە (باز) شیخ عەبدولقادری گەیلانییە و لە (شیر) ئیمامی عەلی کوری ئەبی تالیبە، دەیەوی لە خەلك بگەیینی کە بۆ نزاو دوعا چ پیویست بە واسیتە لە نیوان

خـواو ئـادەمیزاد ناکـا. موفتـی زەهـاوی دوازدە کـوری هـەبووە، زۆریـــان لــە کــور و نـــەوەکانی نـــاودار بـــوون، بـــەناوبانگترینیان شـــاعیری گـــەورە جـــەمیل ســـدقیيە (١٨٦٣-١٩٣٦) و محەمـەد رەشـید پاشـا (١٨٤٨-١٩١١) کـە لــە هــەندی قــەزاکانی عـیراق و سـوریا و قایمقـام دەبـیو ئـەندامی مەحکەمــەی ئیســتیئناف لــە بــەغدا و جیکاری موتەسەریفی کەربەلا بووە.

## شیخ رەزای تالەبانی

لـە شـاعیرە ناودارەکـانی عیراقـە، بـە زمـانی کـوردی و فارســی و تورکـی شـیعری داناوە، لە بنەماڵەیەکی ناوداری کەرکوکە، دەچیتەوە سەر عەشیرەتی زەنگەنە، زیـاتر بە گوندی تالەبانی سەر بە قەزای چەمچەمال کە تییدا نیشتەجیٚ بووە ناسراوە، بـاب و باپیرانی لە شیخەکانی ریبازی سۆفیەتی قادری بوون، باوکی شیخ رەزا ناوی شـیخ عـەبدولرەحمان خـالیس کـوری ئەحمـەد کـوری مـەحمودە ، شـاعیرو شـیخی تەریقـەت بووە لە کەرکوك، لە سالی ١٨٥٩ مال ئاوایی لـە ژیانـدا کـردووە، دیوانـی شـیعری بـە زمانی تورکی و فارسی لە ١٨٦٨ چاپکراوە.

شیخ رەزا سالی ١٨٣٧ لە گوندی قرخ قەزای چەمچەماڵ هاتۆتە دنیا، لە کەرکوك پیدەگـا، لـەلای بـاوکی و زانایـانی تـر: عـەلی محەمـەد بـلاغ، سـەعید حیلمـی و مـەلا عەبدوللای جەلی زادە لە کۆیە دەخوینیٚ، هەر لە تافی لاویەتییەوە بە چاکە ناسراوە، لـە سالی ١٨٦٠ هـەوار دەباتـە ئەسـتەنبوڵ، دوای دوو ساڵ دەگەریتـەوە کـەرکوك، بـۆ جـاری دووەم گـوزەر دەکاتــەوە بـۆ پایتــەختی تورکـی، پاشـان بـە مەبەسـتی بــەجیٚ هینـانی حـەج روودەکاتـە حیجـاز، لـە ریگـاوە بـە میسـردا تیدەپــەری، دەگەریتــەوە ئەستەنبوڵ، لەویٚ شوناسی لەگەڵ شاعیرانی تورك پەیدا دەکا، لە پیش هەموویانـەوە نـامیق کـەمال (١٨٤٠-١٨٨٠)، لـە لایـەن وەزیـری تـورك کـامیل پاشـاو ئەحمـەد پاشـا کوری سلیمان پاشای میری بابان چاودیری تایبەتی دەکریت، دەلین لە ئانی مانەوەی لـە میسـردا دەرسـی فارسـی بـە کورەکـانی خدیـو ئیسـماعیل گوتـوە، بـۆ دوواجـار دەچیتـەوە حـەج، لـە ١٨٧٤ دەگەریتـەوە کـەرکوك، پاشـان روو دەکاتـە بـەغداو لی ی نیشتە جیٚ دەبیٚ، لە ٢٠ی کانونی دووەم ١٩١٠ جیهان بەجیٚ دیلیٚ.. دیوانی شیعری

بۆ یەکەم جار بە زمانی کوردیو تورکی و فارسی لە سالی ١٩٣٥ لە بەغدا چاپکراوە. دووبارە عەلی کوری عەبدوللای تالەبانی نەوەی شیخ رەزا چاپی کردۆتەوە، شیعرەکانی بە هەجوو زەنب و تانەی ناشرین ناسراوە، تا ئەوەی هەندێ لە رەخنە گران بە (حطیئە)ی کوردیان ناوناوە، شەرە شیعری هەجوو دەمەتەقەی لەگەڵ جەمیل سدقی زەهاوی و ئەدیبانی سەردەمی خۆیدا کردووە، هەروەها شیعری غەزەل و ستایش و شیوەنی هۆنیوەتەوە، ستایشی ناسرەدینی شای ئیران و هەردوو سولتانەکان عەبدول عەزیز و عەبدول حەمید، و میر مستەفا فازل، بنەمالەی بابان، نەقیب و جەمیل و هیتر دەکات، لە هەندێ شیعرەکانیدا چەند بەیتیکی عەرەبی بۆ رازاندنەوە کردۆتە تیکهەلکیش، کە لە تازیە نامەکەی بۆ مستەفا زهنی پاشای بابانی بە بۆنەی مردنی قادر بەگی برای ناردووە سەرەتاکەی بەم شیوەیە دەست پێ دەکات:

لقد اصيب حبيب القلب وا أسفا وصار بدر سماء المجد منخسفا

شیعرەکەش خۆی بە زمانی فارسیە، لە هەجوی پیش نویژ و ئیمامی مزگەوتی "الامام الأعظم" کەوا نەزان و لە زانست و لە چاکە بەدەر بووە دەلێ:

لو كان يعلم انت من جيرانه من قبره فر الامام الاعظم

عەباس عەزاوی لە بەشی هەشتەمی میژووەکەیدا دوو دیری ئەوی لە هەجوی والی بەغدا عطاء الله پاشا هیناوە کە دەلێ: والی تەمەنی گەیشتۆتە پیریەتی سەر گۆر، لەسەد سالی تیپەراندووە، بیگومان دانانی بە والیەتی دەبیتە پشیوی باری ولات، بە بیردا نایێ چاکسازی و بووژانەوەی هەریم بەیەکێ لە مردوان بکرێ!! هەربژی هیزی هۆشمەندیەتی بابی عالی بۆ هەلسورانی کاروباری دەولەت!!.

پیشتر هەجوی سری پاشای والی بەغداو قازیەکەی حەقی ئەفەندی کردووە، ماناکەی کە لە دوو بەیتە تورکیەکەدا هاتووە دەلێ: ئەگەر سری والی و حەقی قازی بێ دەك خاك بەسەری رەعیەبێ، هاوار لە خۆتان خەلکینە!! لە پارچە هەلبەستیکدا باسی باب و باپیرانی دەکات تاکو دیتە سەر خودی خۆی و دەلێ:

مەلا مەحمودی زەنگەنە یەعنی قوتبی دائیرەی ئیرشاد

له دەوری مەرقەدی هەردەنگی یاهو دیت و یامەعبود

**پاشان دەڵێ:**

رەزاش لەو نەسلەیە ببەخشە یارەب چونکە قەت نابێ

گولی بێ خارو بەحری بێ بوخار و ئاگری بێ دوود

## محەمەدی مەحوی

**شاعیری تەسەوف شیخ محەمەد مەحوی کوری شیخ عوسمانی بالخییە، دەچیتەوە سەر گوندی بالخی سەر بە شارباژیر. سالی ١٨٣٦ لە سلیمانی هاتۆتە جیهان، زانیاری ئاینی و بیروباوەری سۆفیەتی لەسەر دەستی باوکی خویندوە، دوای ئەوە بووەتە سوختە و قوتابی موفتی محەمەد فەیزی زەهاوی، بۆ بەجێ هینانی دەستوری حەج دەروا، لە ریگای گەرانەوەیدا لا دەداتە ئاستانە، لەسەرفەرمانی سولتان عەبدولحەمیدی دووەم، تەکیەیەکی لە سلیمانی بۆ دروست دەکریت، خوی داوەتە دەرس وتنەوە و رابەری و ئیرشاد کردن، هەتا مەرگ لەو شارەدا لە ئەیلولی ١٩٠٩ یەخەگیری دەبێ. وەزیری میژوو نوس محەمەد ئەمین زەکی بەگ لە کتیبەکەیا (میژووی سلیمانی) باس دەکا و دەڵێ: دەستیکی بالای لە زمانی کوردی، فارسی و عەرەبی دا هەبووە. عەلی کەمال دیوانی شیعرەکەی سالی ١٩٢٠ لە سلیمانی چاپ کردووە[٣]، زۆرترین قەسیدەو غەزەلەکانی پەیوەندی دارن بە ئاین و فەلسەفەکەیەوە.**

## سالح حەریق

**شاعیری کورد مەلا سالح حەریق کوری مەلا نەسروللایە، لە گوندی (زیوێ)ی سەر بە سلیمانی سالی ١٨٦٦ هاتۆتە دنیا، بۆ مەبەستی خویندن و زانست بە دەست هینان هەموو ناوچەکانی کوردستان گەراوە. زۆر شارەزایی لە زمانی فارسی پەیدا دەکا، ماوەیەکی زۆر لە سلیمانی نیشتەجێ دەبێ، پاشان دەگوازریتەوە بۆ ناوچەی**

سابلاغ. ریبازی نەقشبەندی لەسەر دەستی شیخ عوسمانی تەویلەیی وەرگرتووە. هەموو کاتی خۆی بەدەرس وتنەوەو خویندنەوە بەسەر بردووە، سالی ۱۹۰۹ لە سنە مالٚ ئاوایی لە ژیان دەکات. وەزیری میژوونووس محەمەد ئەمین زەکی لە کتیبەکەیدا (میژووی سلیمانی) دەلیٚ: گەلی شیعری نایاب و ناسکی هەیە. دیوانە شیعرەکەی سالی ۱۹۳۸ لە بەغدا چاپکراوە.

## ئەحمەد مەلا قادر

شاعیری کورد مەلا ئەحمەد کوری مەلا قادر ناسراو بە (سائیب) سالی ۱۸٥٤ لە سلیمانی هاتۆتە جیهان، سەرەتای زانستەکان و زمانی فارسی لای باوکی فیردەبیٚ و زانیاری ئاینی لای شیخەکانی شارەکەیان دەخوینی. لە زاخۆ بە نیاباتی شەرعییە دادەمەزریٚ. ئینجا ئەندام لە مەحکەمەی بیدائەی سلیمانی. دوایی دەبیتە جیگری قازی هەلەبجە، بەئەرکی مامۆستایەتی لە قوتابخانە تایبەتیەکەی خۆیدا هەلساوە. سالی ۱۹۱۰ کۆچی دوایی کردووە. شیعری بە عەرەبی و کوردی و فارسی هۆنیوەتەوە.

## محەمەد ئەمینی کورد

واعیزو دانەری متەسەویف شیخ محەمەد ئەمینی کورد کوری شیخ فەتحوللایە لە هەولیر هاتۆتە دنیا، هەر لەویش خویندویەتی، ریبازی نەقشبەندی لەسەر دەستی شیخ عوسمانی تەویلە وەرگرتوە، بە مەبەستی حەج چۆتە مەککە، پاشان روو دەکاتە مەدینە. دەرس لە مزگەوتی نەبەوی دەلیتەوە. دە سالٚ لە حیجاز بەریٚ دەکا دوایی بەرەو میسر دەکەویتە ریٚ، لە مزگەوتی ئەزهەر تیکەلٚ بە (رواق الاکراد) دەبیٚ، دەبیتە جیکاری بەریوەبەرایەتیەکەی. کتیبی لەسەر: فقە و تەسەوف و رەوشت داناوە. پوختەی تەسنیفەکانی ئیمامی غەزالی لە فارسییەوە وەرگیراوە، ریبازی نەقشبەندی بلاوکردۆتەوە خەلکیکی زۆری

کەوتۆتـە گـەڵ. لـە ۹ شـوبات ۱۹۱٤ لـە قاهـیرە لــە تەمــەنیکی پــیری پــەك کەوتــەدا سەری ناوەتەوە.

کتیبـەکانی کـە دایناون: تنوبر القلـوب (۱۹٤۰)، سعادة المبتدئین في علـم الدیـن (۱۹۱۲)، ضوء السراج (۱۹۰۹) فتاح المسالك في ایظاح المناسك، مرشد العوام لأحكام الصیام (۱۹۱۳)، هدایـة الطـالبین لأحكـام الدیـن (۱۹۱۲)، ارشـاد المحتـاج الی حقـوق الأزواج (۱۹۱٤)...هتد.

جگـە لـەو شـیخ محەمـەد ئـەمین کوردیـە یـەکی تـر هەیـە کـە ناسـراوە بـە مـەلا مەعنەوی، ئیبراهیم دەروبی لە کتیبەکەیدا (البغدادیون: اخبـارهم و مجالسـهم) باسـی دەکا بە پیاو چاك، مەشرەب خۆش، توند رەو، دەمەتەقە پـەروەر، بەزەیی هـاتن بـە گیانداراندا، ئارەزوداری کیمیاگەری و سیحرو ئەفسون.

لەلای موفتی محەمەد فەیزی زەهاوی و شیخ عەبدولسـەلام مامۆستای تەکیـەی گەیلانی و عەبدولوەهاب نائیب خویندویەتی. لە تشرینی یەکەم ۱۹۱٤ لە بـەغدا ژیـان بەجێ دیلێ.

## عەبدولرەحمان قەرەداغی

باوکی شیخ عـەبدولرەحمان قەرەداخی لـە پیـاوە ئاینیـە بـەرزەکانی کوردسـتان بووە. شیخ عـەبدولرەحمان لـە دوانزدەی کانونی دووەم ۱۸۳۸ لـە قـەرەداغ سـەر بـە سلیمانی هاتۆتـە جیـهان، لـەلای بـاوکی دەخوینـێ پاشـان لـە ۱۸۵۹ دەگویزریتـەوە بــەغدا، خــۆی گەیاندۆتــە موفتــی زەهــاوی و لای ئــەو دەخوینــێ، دوای ســالیك دەگەریتـەوە کۆنـە هەوارەکـەی، خـەریکی دەرس وتنـەوەو کتیـب دانـان دەبـێ، چۆتـە ریزی موریدانی ریبازی نەقشبەندی، سالی ۱۸۱۲ دەچیتە کـەرکوك، پاشان بۆ سـالی ئـایندە روو دەکاتـەوە بـەغدا، دەرس وتنـەوەی لـە تەکیـەی (بەکتاشـیە) ناسـراو بــە مزگەوتی بابەگورگور و لە خویندنگـای ئـەبی یوسـف لـە (کاظمیـە)ی پـێ سـپیردراوە، بژاردەیەك لە زانای لیهاتوو، لەسـەر دەسـتی پـێ گەیشـتن وەك( عـەبدولوەهاب نـائیب، مەحمود شوکری ئالوسی، عەبدول مەلیك شەواف).لە ۲۲ئایار ۱۹۱۷ لەبەغداد جیهان

بەجیدیلیت. گەلێ تەسنیفی داناوە لەوانە: دقائق الحقائق، الایقاظ في شرح الألفاظ أسنی المطالب في بیان علم الواجب، تحفة اللبیب في المنطق، الاجوبة البهیة في الأسئلة الهندیة، سعادة الدارین، التباین في بیان الناسخ و المنسوخ، مواهب الرحمان في علم البیان، تنبیه الاصدقاء في بیان التقلید و الأجتهاد، و لأفتاء و الأستیفتاء...هتد، محەمەد سالح سەهرەوەردی لە "لب الألباب"دا باسی دەکا و دەلێ: گەلێ زیرەك و بیر تیژ و بەلگە بە هیزە لە وتوویژدا. بالاّ دەست لە "علم الاصول، فقه، حدیث، کلام، حکمە، بلاغە و منطق" خواناس و پاك رەوشت بوو، مەحمود شوکری باسی دەکا دەلێ: هەرگیر و گرفتیکی ئالۆز بووایە بەرای خۆی چارەی دەکرد، شیخ عەلی: لە کورە ناسراوەکانی بووکە جیگای ئەوی لە دەرس وتنەوەو خویندنگای ئیمام ئەبی یوسف دا گرتۆتەوە، کە شیخ مەحمود ئیمارەتەکەی لە ١٩٢٢ لە سلیمانی راگەیاند کردیە وەزیری داد، بەلام شیخ عەلی ئەو پایەی لە ترسی دووبەرەکی و فیتنە گەریدا رەت کردۆتەوە.

هەروەها شیخ مستەفا مەحمود قەرەداغی برازای ناودار دەبێ، لە سالی ١٨٩٢ هاتۆتە دنیا، زانستەکانی شەرع دەخوینێ، لە خویندنگای "قضاة" لە ئەستەنبۆڵ دەردەچێ، لەسەرەتاوە دبیتە قازی شەرع (١٩١٨)، قازیەتی ئامیدی (١٩٢٣)، ئینجا کەرکوك، پاشان دەگوازریتەوە بە حاکمیتی -منفرد-ی هەولیر (١٩٣١)، دەبیتە یاریدەدەری بەریوەبەری گشتی ناوخۆ (١٩٣٨)، دوای موتەسەریفی سلیمانی (١٩٤١) و سەرەك تەسوییەی مافی زەوی (١٩٤٤)، موتەسەریفی هەولیر (١٩٤٨)، کەرکوك (١٩٥٠). دوای دەست بەربونی لە فەرمان خەریکی پاریزەری دەبێ، کتیبخانە بەهادارەکەی دەکاتە دیاری بۆ "کۆری زانیاری کورد" شیخ مستەفا لە ئایاری ١٩٧٣ لە بەغدا جیهان بەجێ دیلێ.

## ئەمین یومنی

شاعیری کورد ئەمین یومنی بەگ سالی ١٨٤٥ لە سلیمانی هاتۆتە جیهان، خویندنەکەی لەسەر شیوازی کۆن بووە، زمانی تورکی و فارسی بە باشی زانیوە،

پاشان کەمیکیش فەرەنسی فێر بووە، هەندێ فرمانی بینیوە دبیتە (قونسلی) دەولەتی عوسمانی لە سنە، پرژاوەتە سەر دیراسەتی شیعری فارسی، دلگرتەی حافیزی شیرازی بووە.

دیوانە پینج خشتەکیەکەی لە ژێر ناوی (جذبة العشق) لە ئەستەنبۆڵ بە چاپی گەیاندووە (١٩٢١)، هەروەها بەشی یەکەم (المثنوي) هی جەلالەدینی رۆمی و "ساقی نامە"ی تەخمیس کردووە، بە تورکیش ئەمانەی داناون (پوتە ئەسرار، قهرمان قاتل، ضروب امثال، ترکیب بند، هفت بیکر – حەوت دەم و چاو). دەست نووسی تری بە فارسی و کوردی لەپاش بەجیماوە، لە سالی ١٩٢١ مەرگ گیانی لی دەستینێ.

## محەمەد تەها شیروانی

شیخ محەمەد تەها کوری ئیسماعیل کوری حەسەن بەگ شیروانییە، سالی ١٨٣٤ لە هەولیر هاتۆتە دنیا، لای زاناکانی ئەوێ دەخوینێ، پاشان بەرەو گوندی تەویلە بەری دەکەوێ، ریبازی سۆفیەتی لەسەر دەستی شیخ محەمەد بەهائەدین کوری شیخ عوسمان وەرگرتووە، دەگەریتەوە هەولیر بە ئەرکی دەرس وتنەوە خەریك دەبێ بەلام زۆر نامینیتەوە بەرەو بەغدا دەروا، تەفسیر لەلای موفتی محەمەد زەهاوی دەخوینێ و ئیجازەی زانستی لی وەردەگرێ، دوای ئەوە دەچیتە کەربەلا. رابەرایەتی و زانستی ئاینی بلاو دەکاتەوە، وتوویژ لە نیوان ئەو و زانایانی شیعە روودەدات، هەروەك محەمەد سالح سەهرەوەردی لە (لب الألباب)دا دەلێ بە تەبایی و تیگەیشتن کۆتایی پێ هاتووە.

پاشان شیروانی دەگەریتەوە بەغدا لەبەری کەرخ دادەبەزی، دەست دەکا بە دامەزراندنی (ختمة النقشبندية) و دەرس وتنەوەی لە مزگەوتی خدر ئیلیاس پێ دەسپیرن. والی محەمەد تەقیەدین پاشا وای پێ باش بووە بگەریتەوە کەربەلا، دەیکاتە بەریوەبەری ئەوقاف، لەوێ هەتا شۆرشەکەی عیراق

دەمینیتـــەوە، ســـەهرەوەردی دەڵـــێ: هـــەندێ نـــەفام و نـــەزانی کەربـــەلا پـــەلاماری ماڵەکـەی دەدەن و ئـاگری تیبـەردەدەن، شـتومەك و کتیبەکانیشـی بـە تـالان دەبـەن، مـــاڵ و منداڵـــەکانی دەگوازیتـــەوە بـــەغدا. وەزارەتـــی ئـــەوقاف لەســـەردەمی وەزیرایــەتی ئیــبراهیم حــەیدەری دەیکاتــە مامۆســتای خویندنگــای (ئەزبکیــە) و خوتبە خوین لە مزگەوتی حاجی ئەمین. لەوە بەردەوام دەبێ هەتا پایانی ژیانی لە ٢١ ئایار ١٩٣١.

سەهرەوەردی دەڵـێ: پیـاویکی خوانـاس و ئـاین پـەروەرو پـاك و دلسـۆز بـوو. هـەندێ نامـــەو پـــەراویز و لیدوانـــی نووســـیوە، دوای مردنـــی هـــەندێ لـــە شـــاعیران شیوەنیان بۆ کردووە لەوانە مەحمود ئەل مەجموعی و محەمەد رەشید حەفید و شیخ داود نەقشبەندی.

## نورەدین شیروانی

نورەدین کوری شیخ ئیسماعیل کوری حەسەن بەگ شیروانییە، سالی ١٨٦٧ لە هەولیر هاتۆتە دنیا، دەرسە سەرەتاییەکان لـەوێ دەخوینـێ، پاشـان دەچیتـە کەربـەلا بۆ لای شیخ تەهای برای کەلـەوێ مودەریس بووە، لەسـەر دەسـتی ئـەو و عـەلی میرزا بـاقر یـەزدی دەخوینـێ، تـەجوید لـەلای حـاجی عەبدولسـەلام بـەغدایی فـیر بـووە، دەیکەنە مامۆستای قوتابخانەی روشدیەی کەربەلا، دەگوازریتەوە بۆ بەسرە (١٨٩٩)، دوایـی بۆ حـەی پاشـان بـۆ بەریوبەرایـەتی خەسـتەخانەی (غربـاء) لـە بـەغدا (١٩٠٤)، دەیکەنـە ئـەندام لـە ئەنجومـەنی (مـەعاریف)، دوای ئـەوە دەبیتـە جیکـاری بەریوەبـەری قوتابخانـەی دووانـاوەندی، جا بەریوەبـەری خانـەی مامۆسـتایان لە بەغدا، دوایـی لـە بەسـرە، پاشـان بەریوەبـەری (دار الأیتـام). دوای دەگیر کردنـی لـە لایـەن بـەریتانیاوە دەگەریتـەوە بـەغدا، دەبیتـە مامۆسـتا لـە کـەرکوك، دوایـی پشـکنینەری (ئەعشـار) لـە هـەولیر، پاشـان دەیکەنـە بەریوەبـەری کولیــەی ئەعزەمیــەی ســەر بــە بەریوەبەرایــەتی ئەوقاف (ئازار ١٩٢٠)، لە سالی ١٩٢٦ واز دەهینێ، دەیکەنە بەریوەبەری قوتابخانەی

ڕەحمانیە لە بەسرە هەتا تەقاعود دەکرێ (تەمووز ١٩٣٠) کە شیخ تەهای برای دەمرێ بە ئەرکەکانی ئەو هەلدەستی.

کتیبی لەسەر میژووی ئیسلام و فەلسەفەی رەوشت، مەنتیق، میژووی پەروەردە، زیندوبوونەوە دوای مردن، زانستی جیاکاری داناوە.

مردنەکەی ریکەوتی ١٩٤٢ دەبێ لە بەغدا " ئەو باوکی بە هائەدین نوری وەزیره".

## ئەمین فەیزی بەگ

ئەمین فەیزی بەگ لە سلیمانی هاتۆتە دنیا، سالی١٨٨٩لە خویندنگای جەنگی لە ئەستەنبۆڵ دەرچووە، لە پلە و پایەکانی سوپای تورکی پیش دەکەوێ تا دەگاتە پایەی میر ئالای (عەقید)، سالی ١٩١١ بۆتە فەرماندەی تۆپ سازی لە بەسرە، دوای ئەوە سەرفراز دەکرێ، سەردەمیك لە بەغدا بەریوەبەری قوتابخانەی روشدیە و دواناوەندی بووە، بە زمانی تورکی کتیبی داناوە (اجمال النتائج) "پوختەیەکی بیرکاریە" چاپی ئەستەنبۆڵ (١٨٩٣)، (تفرقة رياضية) "لەسەر زانستی جەبرە ١٩١١". هەروەها کتیبی ئەدەبی شیعری بە کوردی هەیە لەوانە: ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد (١٩٢١)، پرشنگ (١٩٢٥) و هەوای نەسیمی.

محەمەد ئەمین زەکی باسی دەکا دەڵێ: ئەدیبیکی باش بوو، لە زانستی بیرکاریدا شارەزا و لە شیعرو ئەدەبدا بە توانا و بەهرەوەر بووە، لەگەڵ شیخ رەزای تالەبانی نامەیان بە شیعر ئاڵوگۆر کردووە. لە شیعرە کوردیەکانی کە لە وەرگیرانی رەفیق حیلمی‌یە:

کە جەیشی غەم هجومی کرد نیزامی عومری من تیك چوو
مومکین نیە ئاسایش حاڵ پەریشانم
بینای بورجی بەدەن رووخا بە گوللە حادیسات ئەمرۆ
نەما قوەت لە ئەژنۆما برا پشتم شکا شانم

به گویرەی کە عەباس عەزاوی  لە کتیبەکەیدا (تأریخ علم الفلك) باسی کردووە کەوا ئەمین فەیزی بەگ سالی ١٩٢٨ لە ئاستانە کۆچی دوایی کردووە.

## حوسین نازم

لە پیاوانی کوردی رۆژنامەگەری و میژووا حسین نازم کوری عەبدول فەتاح کوری ئەحمەد خەیاتە، سالی ١٨٧١ لە سلیمانی هاتۆتە دنیاوە، هەر لەویش خویندویەتی، جگە لە زمانە کوردییەکەی فارسی وتورکی باش زانیوە، کاتێ پێ دەگا دەچیتە ناو فرمانی میری، دەبیتە مودیر ناحیەو قایمقامی قەزا، دوای جەنگی یەکەمی جیهانی بۆتە راویژکاری شیخ مەحمود لە کاتی سەربەخۆکردنی فەرمان رەواکەیدا لە سلیمانی، پاش ئەوە دووچاری کینەبەری ئینگلیزی دەبێ، دەیگرن و دەست بەسەر خانوەکەشی دادەگرن. لە سالی ١٩٢٤ لەسەردەمی  فەرمانرەوایی شیخ مەحموددا بووە سەرنوسەری رۆژنامەی "ئومیدی ئیستقلال" کە بەهەر سێ زمان کوردی و فارسی و تورکی دەردەچوو، کە حکومەتی کوردستان لەناوبرا بەرەو تورکیا دەروا، دەیکەنە قایمقامی قەزای شەمزینان کاتێ حکومەتی تورکی دەکەویتە سەرلەدوونانی نیشتیمان پەروەرانی کورد دەگەریتەوە سلیمانی، سەرپەرشتی رۆژنامەی (ژیان) دەکات. کە فەرمانگەی شارەوانی دەری دەچوواند، بەردەوام بوو لەسەر دەرچواندنیدا هەتا لە شاری لەدایك بوونیدا لە ١٩٣٢ مالٌ ئاوایی لە ژیان دەکات. لەسەردەمی خۆیدا لەبەرزترین پیاوانی رۆشنبیری کورد بووە، بەدەست خەت میژووی نوسیوەتەوە کە بۆتە  سەرچاوە بۆ محەمەد ئەمین زەکی و میژوو نووسانی تر، بەرهەمەکانی بە (دەفتەرەکەی حسین نازم) بەناوبانگە.

## مستەفا ساحیبقران

شاعیری کورد مستەفا بەگ کوری مەحمود بەگ کوری ئەحمەد ساحیبقرانە، لەسەرەتای ژیانیدا (هیجری) کردۆتە نازناوی خۆی، پاشان دەیگۆری دەیکا بە

(کوردی). له سالی ١٨٦١ له سلیمانی هاتۆته دنیا لەویش خویندویەتی. به سەلیقه شاعیر بووه، شیعری هۆنیوەتەوه. هەروەك محەمەد ئەمین زەكی بەگ دەڵێ: بەهرەیەکی خۆرسکیه زیاتر لەوەی کەسی بووبیت.

شیعرەکانی خۆی لەبەردەخویندەوه، شیوازەکەی یەکجار ناسك و رەوان بیژو تەرو پاراوو پر مانا بوو، زۆرترین شیعرەکانی دلداری و غەزەلن، بۆ مەبەستی جیاجیا شیعری هەیه، دلنیگەرانی ئەوه بووه کە رۆڵەی نەوەکەی لە ژیر دەستی هیزی فەرمان رەوادا پەریشانه، شیعرەکانی کلاسیکی شیوازی کۆنه، غەزەلەکانیش سۆفیەتیه لە چوارچیوەی ریبازی فارسی چاو لیکەریدا دەرنەچووه، مستەفا بەگ ماوەیەکی زۆر لە تەهران نیشتەجێ دەبێ، ستایشی شای ئیرانی کردووه، دەیکەنه ئەندام لە (مونتەدای ئەدەبی ئیرانی) شیخ رەزای تالەبانی دلگرتەی مستەفا بەگ بووه، لە باشترین شاعیرانی سەردەمەکەی داناوه، لە مەلبەندی هاتنه دنیای دا سالی ١٩٤٨ جیهان بەجێ دیلێ. بەشیك له دیوانی شیعری سالی ١٩٣١ له بەغدا چاپکراوه.

## ئەحمەد بەگی ساحیبقران

شاعیری کورد ئەحمەد حەمدی بەگ کوری فەتاح بەگ کوری ئاراسی کوری ئیبراهیم بەگ کوری مەحمود بەگه، ناسراوه به "حەمدی". دەچیتەوه سەر بنەماڵەی ساحیبقرانی ناودار. سالی ١٨٧٨ لە سلیمانی لەدایك بووه، لە قوتابخانەکانی ئەوێی خویندوه له منداڵیەوه هاوریی وەزیری میژوو نووس محەمەد ئەمین زەکی بەگ بووه، لە کتیبەکەشیا (میژووی سلیمانی) باسی ئەحمەد حەمدی دەکا دەڵێ:ئەحمەد شارەزایی له زمانی کوردی و فارسی پەیدا کردووه، تا ئەوەی چۆته بنج و بناوانی ئەدەبەکه شیانەوه، که سلیمانی سالی ١٩١٨ داگیر دەکریت دیوانه شیعرەکەی دەسوتێ، بەلام دوای ئەوه شیعری تری زۆر هۆنیوەتەوه.

دیوانه کوردیەکەی سالی ١٩٥٧ له بەغدا چاپکراوه. ئەحمەد حەمدی لەگەڵ شیخ مەحمود جیاکار دەبێ، بەلام که شیخ مەحمود له شۆرشەکەیدا نشوست دینی و

دەگیرێ ئەو روو دەکاتە کیو، کاتێ شیخ مەحمود دەگەریتەوە سەر حوکم دەیکاتە بەریوەبەری گشتی باج و خەراج (گومرگ)، پاشان دەبیتە سەرەك شارەوانی سلیمانی.

لە دوازدەی تشرینی دووەم ١٩٣٦ مەرگ لە مەلبەندی لە دایك بوونیدا یەخەگیری دەبێ. محەمەد ئەمین زەکی دەلێ: لە واقیعدا قەسیدە و غەزەل و پیننج خشتەکیەکانی نمونەیەکن لە تەبیعەتی بەرزو نایاب، بۆی هەیە نەتەوەی کورد بە ئەدەبەکەی و ئەدیبانی وەك ئەو بنازێ، پارچە شیعریکی ئەوی خستۆتە بەرچاو.

## حەسەن بامەرنی

شاعیری کورد حەسەن کوری مەلا ئەحمەد بابەکە. سالی ١٨٦٧ لە گوندی بامەرنێ هاتۆتە جیهان. لە خیزانیکدا کە دەچنەوە سەر ئەبوبەکر سدیق[٤]، لەژیر چاودیری باوکی کەوا لە پیاوانی سۆفی گەری سەر بە ریبازی نەقشبەندی بووە پیدەگا. مەحفوز محەمەد عومەریی لە کتیبەکەیدا (امارە بهدینان العباسیە) باسی دەکا دەلێ: "شیعرەکانی ناسکن و لە هەردوو چەشنن کۆن و نوێ، شیوازی یەکجار جوان و پر مانا رەوانبیژو ئەندیشە فراوانن و نایابترین قەسیدەی لەسەر پیشبرکیی گولانە".



## ئەبوبەکر مەلا

زانا و ئەشرافی هەولیر ئەبوبەکر مەلا ئەفەندی کوری عومەر کوری ئەبی بەکری ناسراو بە (کوچك مەلا) کوری عوسمانە. لە سالی ١٨٦٧ لە هەولیر هاتۆتە دنیا[٥]. لەلای باوکی دەخوینێ، کوچك مەلای باوکی وەك باب و باپیرانی لە مزگەوتی قەلا مودەریس بووە، پاشان خوی

داوەتە رابەری و ئیرشاد. مەلا ئەفەندی جیگای باوکی لەدەرس وتنەوەدا دەگریتەوە. دانان و وەرگیرانی لەسەر ئەستیرە ناسی کۆن و نویدا هەیە. لە ٣١ی کانونی یەکەم ١٩٤٢ لە مەلبەندی لە دایك بونی دا جیهان بەجێ دیلێ[٦]. کە بزوتنەوەکەی رەشید عالی گەیلانی روودەدا شەر لەگەڵ ئینگلیز بەرپا دەبێ، مەلیك فەیسەلی دووەم و مەلیکە عالیەی دایکی دینە هەولیر دەبنە میوانی مەلا ئەفەندی کە ئەوسا مەلیك تەمەنی شەش سالان دەبێ.

لیوا عەبدوللەتیف سەرۆکی یاوەرانی مەلیك بۆی باس کردم: کەوا شەو و رۆژ مەلیکی بەرنەداوە ل... ی ژوورەکەی ئەودا دەنووست.. گووتی: ئ... ەبایە دەبوایە بەسەر لاشەکەی مندا تیپەربو...



## حاجی تۆ...

شاعیری کورد تۆفیق بەگ کوری مەحمود ئاغا کوری هەمزئاغای مەسرەفە، بە ناوی (پیرەمیرد) ناسراوە، ئەو نازناوەشی لە گەرانەوەیدا بۆ ولات لە خۆی ناو بە ئەدەبیاتەوە خەریك دەبێ و ئەو نازناوە دەگریتە خۆی. هەمزە ئاغای باپیری وەزیری ئەحمەد پاشا دووا میرەکانی بنەماڵەی بابان بووە.

پیرەمیرد لە سالی ١٨٦٧لە سلیمانی هاتۆتە جیهان، زانیاریەکانی زمان و ئایینی لە قوتابخانە کۆنەکانی ولاتەکەی و لە بانەی سەر بە ئیران خویندوە. زمانی کوردی و تورکی و فارسی بە باشی فیر دەبێ، سالی ١٨٨٢ دەیکەنە نووسەر لە دائیرەی رەگەزناسی سلیمانی، پاشان دەبیتە سەر نووسەر لە دادگای شارباژیر (١٨٨٦) دوایی یاریدەدەری داواکاری گشتی لە کەربەلا (١٨٩٥)، لە فەرمان دەست بەردار دەبی. لەگەڵ شیخ سەعید حەفید لە ١٨٩٨ دەچیتە تورکیا، بۆ سالی ئایندە پیکرا دەچنە حەج. دەیکەنە ئەندام لە ئەنجومونی بالای مەعاریف لە ئاستانەدا (١٨٩٩). نازناوی بەگی پێ دەبەخشرێ، لەهەمان کاتیشدا لە حقوق دەخوینێ بروانامەکەی لی وەردەگریت، کاتی دەستوری عوسمانی لە ١٩٠٨ راگەیەندرا ئەنجومەنی بالا ناهیلن، دەکەویتە کاری پاریزەری و رۆژنامەگەری، بەشداری لە کۆمەلە نیشتیمانییەکانی کورد کە ئەوسا لە پایتەختی عوسمانی دامەزرا بوون دەکات. بەهەرسێ زمانەکەی کە باشی لیدەزانی دەینووسی و شیعری داناوە، رۆژنامەی "رسملی کتاب"ی دەرچواندووە (١٩٠٨)، دەبیتە قایمقامی چۆلە میرگ (١٩٠٩)، دوایی دەیکەنە موتەسەریفی لیوای ئەماسیە (١٩١٨)، حاجی تۆفیق دوایی جەنگە مەزنەکە دەگەریتەوە سلیمانی (١٩٢٠). دەچیتە ژیر سایەی بزووتنەوەی نیشتمانی کورد کە شیخ مەحمود حەفید ئالاکەی بەرزکردبۆوە*، پاشان لە کانونی یەکەم ١٩٢٦ کەوتە سەرپەرشتی کردنی رۆژنامەی "ژیان" کە شارەوانی سلیمانی دەری دەکرد، بووەتە سەرنووسەری (١٩٣٢)، پاشان خاوەنەکەی (١٩٣٤)، گەلێ جار رۆژنامەکەی داخراوە، بەلام هەر بەردەوام دەبێ لە دەرچواندنیدا، تا لە ١٩ حوزەیران

* پیرە میرد لە شوباتی ١٩٢٤ گەراوەتەوە بۆ ولات نەك لە ١٩٢٠، هەروەها فریای شۆرشی شیخ مەحمود نەکەوت. (وەرگیر)

١٩٥٠ مال ئاوایی لە ژیان دەکات. پیرەمیرد پەندی پیشینانی کردۆتە شیعر کە ژمارەیان دەگاتە (٤٨٠٠) پەند و چەندین کتیبی داناوە لەوانە: چیرۆکی مەم وزین، دوانزدە سوارەی مەریوان (١٩٣٥)، پەندی پیشینان (١٩٣٦)، مەحمود ئاغای شیوەکەل (١٩٤٢) و بلاوکردنەوەی دیوانی عەبدولرەحیم مەولەوی لە دوو بەش (١٩٣٥) و گەشتی هونەرمەندیك لە جیهاندا، کەمانچە ژەنی وەرگیراوەتە سەر زمانی کوردی (١٩٤٢)[٧]. لە شیعرە وەرگیردراوەکانی پیرەمیرد (پایزی دلتەنگ و بەفرە باریوە)[٨].

**-پایزی دلتەنگ-**

پایز دلتەنگە پایز دلتەنگە – هەوری نوێ ی زویرو دلتەنگە
رەشەبا لیمان بەژارو ژەنگە – گەلاّ ریزانە گول ئالتون رەنگە

**-بەفرە باریوە-**

بەیانی بوو لە خەو هەستام کە روانیم بەفرە باریوە
سولەیمانی ئەلیی بەلقیسە تارای زیوی پۆشیووە
دەمێ بوو چاوەریی بەفریکی وابووم موژدەبێ باری
سەرم بەفرە کەچی هیشتا شەرە تۆپەلمە بۆ یاری

## مەلا محەمەدی کۆیی

**قازی و زانا فەقیهی کۆیە ئەدیبی کورد مەلا محەمەد ئەفەندی کوری حاجی مەلا عەبدوللا کوری مەلا ئەسعەدە دەچیتەوە سەر بنەمالەی جەلی کەوا لە مەلا عەبدولرەحمانی باپیریەوە هاتونەتە خوار، پشتاوپشت خزمەتی ئاینی ئیسلامیان کردووە، مەلا محەمەد سالی ١٨٧٦ لەشاری کۆیە هاتۆتە دنیا. زانیاریەکانی ئاینی دەخوینێ دوای مردنی باوکی لە ١٩٠٨ جیگای لەسەرۆکایەتی زانایانی شارەکەدا گرتۆتەوە، سالی ١٩١٦ دەیکەنە ئەندامی ئەنجومەنی گشتی ویلایەتی موسلّ، لە**

ئاکامی داگیرکردنی بەریتانیا بە قازیەتی شەرعی کۆیە دادەمەزرێ (کانونی یەکەم ١٩١٨). سالی ١٩٢٤ بە نوینەری هەولیر لە ئەنجومەنی دامەزراندنی عیراق دا هەلدەبژێردرێ.

دوای ئەوە خۆی خەریکی کتیب دانان و شیعر هۆنینەوە کردووە، خواست و داواکاری چاکسازی و خویندەواری بووە... هەتا لە مەلبەندی هاتنە دنیای دا لە دوازدەی تشرینی یەکەمی ١٩٤٢ جیهان بەجێ دیلێ. گەلێ کتیبی لە دووا بەجیماوە زۆربەی زۆریان دەستخەتن لە: (علم الاصول والکلام و العقائد والتفسیر) هەروەها ئەم کتیبانەشی داناون: (کشف الاستار فی مسأله الاختیار، أبهی المارب فی اثبات الواجب. المشاهد، حقیقە الایمان، ضیعان عضیمان، الآلە و الطبیعة والعقل و النبوە و المعجزات و الکرامات، الحدس سلم الارتقاء، خراب العالم) دیاری مەلا محەمەدی کۆیی...هتد[9].

جگە لە شیعر و پەخشان و نووسینەکانی ئەدەبی کوردی، لە شیعرەکانی کە لە کوردییەوە وەری گیراوە:

دەماغی منداڵەکان پرکەن لە حوبی وەتەن
تەربیەتیان باش بدەن میللەتیان فیر بکەن
لە ریگەی راست لامەدەن رێ یەکە نابێ بە دوو[10]

مەسعودی کوری ناوداربووە[11]، وەزیر پاشان ئەندامانی خزمەتگوزاری گشتی، ئەندام لە کۆری زانیاری کورد، هەلبژاردنەکەی بۆ ئەندامیەتی پەرلەمان لە حوزەیرانی ١٩٥٤ بوو.

## عەبدول عەزیز حاجی ئەمین

موفتی سلیمانی عەبدول عەزیز کوری ئەمین کوری ئەحمەد ناسراو بە حوسنی، لە رەچەلەکدا دەچیتەوە سەر مەلا محەمەدی دیلەزەیی کە بەمەلای گەورە ناودار بووە و لە ١٧٥٩ کۆچی دوایی کردووە. لەبنەماڵە زانستییەکانی کوردستانە. لەپیش ئەودا

باوك و باپیرانی پایەی (موفتی)یان لە سلیمانی بینیوە. عەبدولعەزیز بە دوو زمان کوردی و فارسی شیعری داناوە، لەسەر پەیرەوی شاعیرانی سەردەمی خۆیدا کە نازناوەکەیان لە دووا دیری شیعرەکانیان دەربریووە. ئەویش "فەوزی" کردۆتە نازناوی خۆی. سالی ١٨٧١ لە سلیمانی هاتۆتە جیهان، لەلای باوکی دەخوینێ، پاشان زانیاری ئاینی لەلای زاناکانی پینجوین و بیارە وەرگرتووە، لەسالی١٨٩٧ دەیکەنە موفتی سلیمانی و سەرۆکی ئەنجومەنی(مەعاریف)، پاشان حاکمی دادگای شارەکە بووە، دوای داگیرکردنی ئینگلیز دووچاری دەردە سەری دەبێ، لە فرمانەکانی بەدەر نراوە، بەلام لە رابەری فیرکاریدا بەردەوام دەبێ، لە ٢٠ئاب ١٩٤٧ مالٚ ئاوایی لە ژیان دەکات.

تۆژینەوەی لەسەر (منطق)، هەلبەستیکی زۆری کە بەزمانی کوردی و فارسی و مەلحەمەیەك کە نەهامەتی و کارەساتەکانی جەنگی یەکەمی مەزنی هیناوەتە بەرچاو لە پاش بەجێ ماوە.

عەبدولعەزیز حاجی ئەمین موفتی سلیمانی سالی ١٩٣٢ بۆ کاریکی راسپیردراو لە وەزارەتی دەرەوە هاتە لام بۆی باس کردم گوتی: خوا کە پیغەمبەرەکانی دەنارد پشتگیری دەکردن بەو ئایەت و نیشانانەی کە لەجەرگەی ژیانی سەردەمەکەوە هاتبێ. لە کاتیکا موسای نارده لای فیرعەون میللەتەکەی واتا(میسریەکان) هەواداری سیحرو ئەفسون بوون، وەك زانیمان گۆچانی (عصا الکلیم)ی مووسا هەموو سیحرەکانی ئەوانی هەللوشی کە عیسای نارد بەنی ئیسرائیل ویلی پزیشکی و چارەسەرکردنی دەردو نەخۆشیەکان بوون، ئایەت و نیشانەی عیساش چاك کردنەوەی بیمارو زیندو کردنەوەی مردوان بوو، ئەو رۆژەی کەنەبی محەمەدی هەنارد عەرەب خولیاو کردو کۆشی وتەو رەوانبیژی بوو، پیغەمبەر هات لەوان رەوانبیژتر و زمان پاراو تر بوو، موفتی بەردەوام بوو گوتی: ئەگەر خوا حەزبکا پیغەمبەریك لەسەردەمی ئیستای ئیمەدا بنیری، گومانم نیە رۆکفلەر یان فۆرد یاخود یەکێ لەوان نزیك لەسەرمایەدارە زلەکان هەلدەبژیرێ. لەسەردەمیکدا کەوا مادە کەوتووەتە باوو برەو، سەروەت و سامان بووەتە سولتانیکی گەورەو مەزن!!.



## فایەق بێکەس

شاعیری پیشکەوتنخوازی فایەق عەبدوللا کاکە حەمە ناسراو بە (بێکەس) سالی ١٩٠٥ لە سلیمانی هاتۆتە جیهان، لەوێ و پاشان لە کەرکوك و بەغدا دەخوێنێ، لە منداڵییەوە تووشی نەخۆشی ئاولە بووە، چاویکی نابینا دەبێ بێنەواو هەژار پیدەگا، کارو پیشەی جیا جیای کردووە، جگەرە فرۆشی و چاودیری کارو مامۆستای سەرەتایی.

شیعری بە زمانی کوردی هۆنیوەتەوە، شاعیریکی تیکۆشەری گەل پەروەر بوو، گۆرانی و سرودی بۆ سەروەری نەتەوەکەی گوتووە. داوای تیکۆشانی دژ بە داگیرکەرو ئیستعمار کردووە.. هەروەك ئەدیبی کورد فازل دەلێ: بەشداری لە راپەرینەکەی (شەشی ئەیلولی ١٩٣٠) دژ بە پەیمانی عیراقی و بەریتانی دەکات، چەندین جار گیراوەو بەندکراوە،شیعری لە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا بلاوکراوەتەوە[١٢]، لە ١٨ی کانونی یەکەم ١٩٤٨ ماڵ ئاوایی لە ژیان دەکات[١٣]، محەمەد مەهدی جەواهیری بیرەوەری بە پارچە شیعریك دەکاتەوە دەلێ:

| | |
|---|---|
| اخي بيكةس يا سراجا خبا | و يا كوكبا في دجي يفتقد |
| ويا حاصدا من كريم الزروع | غلال الاسى والاذى والحسد |
| بلا احد سنة العبقري | يعي الناس لا يعية احد |
| بلا احد غير خضر الجبال | ووحي الخيال وصمت الابد |

## سەید ئەحمەدی خانەقا

زانای روحی و شیخی سۆفیەتی سەید ئەحمەد خانەقا کوری حوسین کوری عەبدول قادر کوری ئەحمەد سەردار بەرزنجی یە، لەنەوەی سەید بابا عەلی هەمەدانی کۆچکردووی سالی ١٤٠٢ز، خاوەنی دانانی سۆفیەتی و ئاینیە، ئەحمەد سەردار خەلیفەی شیخ خالید نەقشبەندی بووە، لە گوندی سەرگەلوی ناوچەی سورداش لە لیوا سلیمانی هاتووەتە کەرکوك، ئەحمەد خانەقا سالی ١٨٦٨ لە کەرکوك هاتۆتە دنیا، لەلای حیکمەت ئەفەندی و زاناکانی تری سەردەمی خۆیدا دەخوینی، پاشان لە تەکیەکەی خۆیا کە بە خانەقا ناوبراوە دەکەویتە رابەری کردن و فریاگوزاری هەژار و بێ نەوایان، دەستیکی بالای لە پرۆژەکانی خیرخوازی و خزمەتی نیشتیمانیدا بووە، چەندین جار دووچاری دەربەدەری و بەندیەتی هاتووە، چونکە وەك ئەدمۆندس لە کتیبەکەیا "کورد و تورك و عەرەب" دا دەلێ: پیاویکە بەریوەچوونی لەگەڵ دا گرانە. هەوڵ دەدا خەلکی گرگرتو بکاو ئاگری فیتنە خۆش بکات، لە ماوەی جەنگە مەزنەکەدا لەگەڵ موریدەکانی دەچیتە جیهاد شان بەشانی تورکەکان لە شعیبەو ناسریە دژ بە سوپای ئینگلیزی جەنگاوە (١٩١٥). پاشان لەکاتی باس لیوەکردنی
مەسەلەی موسڵ بۆ با ... ازاری ١٩٢٣ دەگیرێ و
رەوانەی بەغدای دەکە ... ت کۆچی دوایی دەکا.
دەستخەتی ئاینی و س ...

ئەدیبی کورد رەئ ... کەوا لە کەرکوك لە ٢٧
ئایار ١٩٧٣ لە تەمەنی ... شارەزایی لە ئەدەبی
کلاسیکی کوردی هەبو ...



## عەبدولقادر زەهاوی

عەبدولقادر زەهاوی شاعیر کوری سەلیم کوری موفتی محەمەد فەیزیـیە. لە خویندنگای سوپایی لە ئەستەنبوڵ بە ئەفسەر دەردەچێ، بەپایەی رەئیس ئەوەل (رائید) لە سوپای تورکی خزمەت گوزار دەبێ، دوای جەنگی یەکەمی مەزن واز لەفەرمان دینێ و خۆی خەریکی ئەدەب و شیعر دانان کردووە، لە هۆگرانی فەهمی مودەریس دەبێ. لە کانونی دووەمی ١٩٥٣ لە بەغدا کۆچی دوایی دەکات.

کورەکانی موفتی زەهاوی بەهرەوەرو هۆشمەند بوون لەوانە: عەبدول غەنی کوری محەمەد فەیزی کەوا سالی ١٨٦١ لەدایك بووە. هەروەك محەمەد ئەمین زەکی دەلێ: لە پیاو چاك و ئەدیبەکان بووە، بە تایبەتی لە زمانی فارسیدا. شاعیریکی ئەندیشە بەرز و ناسك بووە، لەم بارەیەوەش جەمیل سدقی زەهاوی برای شاهیدە. محەمەد ئەمین زەکی سالی ١٩٠٧ لە بەغدا شوناسی لەگەڵ پەیدا دەکات بەلام میژووی مردنەکەی باس نەکردووە.

## رەفیق حیلمی

لە پیاوانی کوردی رۆشنبیر رەفیق حیلمی کوری سالح عەبدوللا ناسراو بە حیلمی، لە سالی ١٨٩٨ لە کەرکوك هاتۆتە جیهان، باوکی ئەفسەریکی سوپای تورکی بووە. قوتابخانەی دووناوەندی لە سلیمانی و بەغدا تەواو دەکات، پاشان

بەرەو ئەستەنبوڵ دەروات، دەچێتە کولیەی سوپایی، کە جەنگە مەزنەکە بەرپا دەبێ دەگەڕێتەوە سلیمانی، پاشان دوای کۆتایی جەنگەکە دیسان دەگەڕێتەوە پایتەختی تورکی، دەچێتە خوێندنگای ئەندازیاری سالی ۱۹۲۰تەواوی دەکات، چەندین زمان فێر بووە وەك: کوردی، عەرەبی، تورکی، فارسی، فەرەنسی. رۆشنبیرییەکی بەرفراوانی بۆ خۆی بەدەست هیناوە، لە تافی لاویەتیدا شیعری بە زمانی تورکی هۆنیوەتەوە. لە ئازاری ۱۹۲۱ دەبیتە مامۆستا، بۆ سالی ئاینده کە شیخ مەحمود حەفید حکومەتەکەی لە سلیمانی راگەیاند وتارو شیعری لە رۆژنامەی (رۆژی کوردستان)دا بلاودەکردەوە. لەسەر روو لینانی شیخ مەحمود وتووویژی نهینی لەگەڵ ئەفسەری تورکی عەلی شەفیق بەگ کردووە. دەگەڕێتەوە پیشەی مامۆستایەتی، پاشان بەشداری لە راپەرینەکەی شەشی ئەیلولی ۱۹۳۰ دا دەکات، بە مامۆستایەتی بۆ هەولیر دەگوازریتەوە، دەبیتە پشکینەری مەعاریفی سلیمانی (تەموز ۱۹٤۳)، دوایی بەریوبەری مەعاریفی لیوای بەسرە (ئەیلول ۱۹٤٥)، ئینجا لیوای دیالە (تشرینی دووەم ۱۹٤٦). پاش شۆرشی تەموزی ۱۹٥۸ دەیکەنە (ملحق سەقافی) لە یەکیك لە بالیۆز خانەکانی دەرەوەی عیراقدا[١٤]. لە چواری ئابی ۱۹٦۰ لە بەغدا جیهان بەجێ دیلێ، لە سلیمانی بە خاك دەسپیردرێ. زۆر بەرهەمی کتیب دانانی هەبووە، لەوانەی کە بە زمانی عەرەبی یە: الاکراد منذ فجر التاریخ الی سنه ۱۹۲۰ (۱۹۳٤). دراسات فی الادب الکردی المعاصر. "وەرگیردراوە" دراسات فی الشعر الکردی "وەرگیردراوە" (۱۹۳۹)، مقالات (۱۹٥٦). بە کوردیش ئەمانەی داناون: یاداشت (شەش بەش ۱۹٥٦-۱۹٥۸). شیعرو ئەدەبیاتی کوردی (دوو بەش ۱۹٤۱-۱۹٥٦). دوای تەموزی ۱۹٦۰ کتیبی ماتماتیك و جوگرافیای قوتابخانەکانی کردونەتە کوردی. داستانی رۆستەمی لە تورکی‌یەوە وەرگیراوەتە سەر زمانی کوردی. بەرهەمەکانی بە زمانی تورکی: صفات من القضیة الکردیە (۱۹۳٥). رەفیق حیلمی لە پیشەوایانی راپەرینی رۆشنبیریەتی کوردیە، بڕوای بە مافی ژیانی دیموکراتی و سەروەری نەتەوەکەی خۆی هەبووە. لە پیناوی ئەوەشا تیکۆشاوە[١٥].

## عەبدوللا گۆران

شاعیری کورد عەبدوللا گۆران کوری سلیمان بەگ هوشیار ناسراو بە گۆران سالی ١٩٠٤ لە هەلەبجە هاتۆتە دنیا هەر لەویش دەخوینێ. پاشان دەچیتە خانەی مامۆستایان لە کەرکوك، بەلام خویندنەکەی تەواو ناکات دەگەریتەوە هەلەبجە و دەبیتە مامۆستا (١٩٥٢-١٩٣٧)، لەهەمان کاتیشدا لە شارەزایی و فیربوونی زمانی عەرەبی، فارسی تورکی، ئینگلیزی بەردەوام دەبێ، لە سالی ١٩٣٧ دەبیتە فەرمانبەر. لە کاتیکا شیعری هۆنیوەتەوە کە تەمەنی لە سیزدە سالی تیپەری نەکردبوو، شیعری چاولیکەری کوردی و شاعیری ئینگلیزی (شیللی) کارتیکەری بوون، شیعرەکانی لەسەرەتاوە رۆمانسی پاشان بۆ ریالیزمی شۆربۆتەوە، سەردانی ناوچەکانی کوردستانی کردووە، هەلبەتە سروشی هۆنینەوەی شیعری لە دیمەنی چاو ئەندازو ژیانی خەلکەکەوە هـ بزوتنەوەی تیکۆشانی پیشکەوتنخوازەکان، لە پ ند بووە، بووەتە بەرپرسی رۆژنامەی - ژین (١٩٥٢- نگرەی ئاشتی خوازانی عیراق دا کردووە (١٩٥٤ بردووە دەگیرێ و دوور دەخریتەوە، لە زیندانەک ن و سلیمانی بەند کراوە، پاش شۆرشی تەموزی ٨ ەردەچوینێ لە سەرەتای سالی ١٩٦٠ دەچیتە بە ت لە ١٨ تشرینی دووەم ١٩٦٢ لە سلیمانی جیهان



**چوار بەرگ لە شیعرەکانی بلاو کراوەتەوە، بەهەشت و یادگار (١٩٥٠)، فرمیسك و هونەر (١٩٥٠)، سروشت و دەرون (١٩٦٨) لاڤك و پەیام (١٩٦٩)، هەروەها "پەیام" (١٩٥٤). نامەی کورد بۆ میهرەجانی بۆخارست (١٩٥٤).. تادوایی.. شاعیری میللی محمد سالح بەحر العلوم دەلێ:**

اذا الدهر يبقي جانب الخير خالدا          فگوران باق في جميع جوانبه

**گۆران لەو شاعیرانەیە کە ئەدەبی کوردیان لە شێواز و ناوەرۆك دا نوێ کردۆتەوە، کۆمەلیك لە شیعرەکانی ئاوازی بۆ سرودی خویندکارو قوتابخانەکان بۆ داندراوە، جگە لەمەش شیعری بۆ شکۆداری برایەتی کورد و عەرەب و رووداوە نیشتمانیەکان داناوە، لە شیعرە وەرگیردراوەکەی بۆ عەرەبی:**

**(برای عەرەب)**

چەخماخەی شمشیری زۆردار          ئا لەو خوینەدا ئاوابوو
کە لە ملی باوکت – باوکم          رژایە سەر ملی میژوو

**هەروەها ئافرەت و جوانی (وەرگیرانی سەلام عیرفان):**

بە ئاسمانەوە ئەستیرەم دیوە          لە باغچەی بەهار گولم چنیوە
شەونمی درەخت لە رووم پژاوە          لە زەردەی زۆر کەل سەرنجم داوە
کام بەرزی جوانە وەك بەرزی بالای؟          کام تیشك ئەگاتە تیشکی نیو نیگای؟
کام تاسە کام مەیل کام چاوەنواری؟          تەلیسماویە وەك هی دلداری

ئەدیبی کورد محەمەد مەلا کەریم دەڵێ: لە گۆرانم پرسی رای لە دووا رۆژی شیعر لە ناو شەپۆلی پیشکەوتنی زانست و بەرفراوان بونی شارستانیەت دا چۆنە؟ وای پیش بینی کرد کە شیعر نامریت چونکە بەشیکە لە جەرگەی ژیانی مرۆڤەوە هاتووە. راستی ئەوەیە وەك گۆران دەڵێ: ئەگەر ئینسان لە نیگەران و ئازار رزگاری بوو ئەوا رەورەوەی گۆرانکاری رادەوەستێ.

## پەراویز:

(١)دەبێ مەبەستی (ماوەران) بێ، گوندیکە دەکەویتە نزیك شەقلاوە، پیشکەو مەلبەندی بنەماڵەی حەیدەرییە. (وەرگیر)

(٢ ) شیخ محەمەد سالح سەهرەوەردی ستایشی توانای بەرزی زانستی و شارەزایی و زانایی لە تەفسیرو حەدیس وە بەهرەو بلیمەتی، بروا بە تینی دەکات.

(٣ )کۆری زانیاری کورد دیوانی شیعرو بەسەرهاتی مەحوی بە تیرو تەسەلی لە قەوارەی ٥٩٨ لاپەرەدا لیکدانەوە لیکۆلینەوەی مامۆستا عەبدول کەریم مودەریس سالی ١٩٧٧ چاپی کردۆتەوە.

(٤)زۆر لە پیاوانی کوردەواری بۆ مەبەستی تایبەتی هەولیانداوە رەچەلەکی خۆیان ببەنەوە سەر ئەبوبەکری سدیق، یاخود سەیدن و لە نەوەی پیغەمبەرن، لە کاتیکدا هیچ بەلگەشیان لەم بارەیەوە بە دەستەوە نییە. "وەرگیر"

(٥ )راستی میژوی هاتنە دنیای مەلا ئەفەندی سالی ١٩٥٨ بووە، واتە لە تەمەنی ٨٠ سالیدا مردووە.

(٦ )پیرەمیرد بە هەلبەستیکی ناسك شیوەن بۆ مەلا ئەفەندی دەکا، سەرەتاکەی بەم شیوەیەیە:
ئاینی ئیسلام دەریخستووە
دوای مردن گیانی وەلی زیندوە.

(٧ )ديوانی پیرەمیرد بۆ یەکەم جار لە لایەن محمد رەسول هاوارەوە بە چاپ گەیەندراوە، بۆ جاری دووەم دیوانەکەی لە ١٩٩٠ لە دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، کۆکردنەوەو ساغکردنەوەی لەلایەن بەریزان: مەحمود ئەحمەد محەمەد، مستەفا سالح کەریم، محەمەد نوری تۆفیق، ئەحمەد زرنگ مستەفا ئەنجامدراوە.

(٨)دانەری ئەم کتیبە حەزی لەم دوو پارچە شیعرە کردووەو وەریگیراوەتە سەر زمانی عەرەبی، ئیمەش تەنها ئەو چەند دیرە کوردیەمان خسە بەر چاو، خوینەری بەریز دەتوانێ سەیری دیوانەکەی بکات. (وەرگیر)

(٩)بەرهەمەکانی ئەدەبی بە زمانی کوردی ئەمانەن: دیوانیکی شیعر، عەقیدەی ئیسلام، نویکەرەوە، هەرسێ بەشەکانی قورئان لە ژیر ناوی (تەفسیری کوردی لە کەلامی خواوەندی) ئەمەشیان لەلایەن خوشکە نەجیبەی کچییەوە بە چاپ گەیەند راوە، فری فری قەل فری.

(١٠)لە سالی ١٩٩٤ کتیبی (مەلای گەورە: زانا و ئەدیب و شاعیر) لە لایەن وەرگیری ئەم کتیبەوە داندراوەو بە چاپ گەیەندرا کەوتە بەر دەستی خوینەری کوردی خۆشەویست. بە تیر و تەسەلی هەموو لایەنیکی ژیانی مەلای گەورە و بیرو بۆچوون و هەلویستی نیشتمانی و پایەی زانستی و ئەدەبی گرتۆتەوە.(وەرگیر)

(١١ )مامۆستا مەسعود سالی ١٩١٩ لە شاری کۆیە هاتۆتە دنیا، خویندنی سەرەتایی لە کۆیە، ناوەندی و دوا ناوەندی لە هەولیر تەواو کردووە، سالی ١٩٤٥ لە کولیەی حقوق لە بەغدا دەرچووە دەبیتە حاکم لە سلیمانی (١٩٥٢) دوای چەند مانگیك دەست بەردار دەبێ. بە نوینەری کۆیە بۆ پەرلەمان هەلدەبژیردرێ (١٩٥٣). دووبارە هەلدەبژیردریتەوە (١٩٥٤) دەچیتە پاڵ ئەندامانی بەرهەلستکار لەبەرەی نیشتمانیدا کە کامیل جادرچی یەك لەوان دەبێ، بەلام دوای هەشت رۆژ لە یەکەم کۆبونە وەی ئەنجومەنەکەدا کە چەند سەعاتیك دەخاینێ لەسەر بریاری سەرەك وەزیران نوری سەعید پاشا ئەنجومەنەکە هەلدەوەشیندرێ دەیکەنە وەزیری ئاوەدانکردنەوەی باکور (١٩٦٤-١٩٦٥ ) دوایی ئەندامی ئەنجومەنی خزمەتگوزاری گشتی (١٩٦٦)، پاشان ئەندامی کۆری زانیاری کورد وە جیگری یەکەمی سەرۆك (١٩٧٠) کە ئیحسان شیرزاد لە سالی ١٩٧٤ واز لە سەرۆکایەتی کۆر دەهینێ ئەو هەموو کاروباری کۆرەکە بەو پەری چالاکی و بەرهەم زۆری ئەدەبییەوە هەتا سالی ١٩٧٨ هەلدەسورینێ. دەتوانین بلیین مامۆستا مەسعود ئەمرۆ لە ریزی هەرە پیشەوەی رۆشنبیرانی کوردە، دانەری چەندین کتیب و خاوەنی نوسینیکی بیشومارە لە ووتار و لیکدانەوە و لیکۆلینەوەی ئەدەبی و زانستییەوە هەر بەردەوامیشە. جگە لە زمانی کوردی - عەرەبی و ئینگلیزی و فارسی و تورکی باش دەزانێ - ئیستا لە بەغدا نیشتەجێ بووە. (وەرگیر).

(١٢)دیوانی بیکەس سالی ١٩٨٠ بۆ جاری دووەم بەسەرپەرشتی و ریکخستن و پیشەکی بۆ نوسینی محەمەدی مەلا کەریم چاپکراوەتەوە (وەرگیر)

(١٣)شيركۆی كوری بيكەس لە شاعيرە بە توانا و بەهرەوەرەكانی كوردە، خاوەنی بەرهەمی شيعری نايابی شيواز نوييە. (وەرگير).

(١٤)رەفيق حيلمی سالی ١٩٥٠ "أمين العاصمە" واتە سەرەك شارەوانی بەغدا و پلەی (ملحق سەقافی) لە توركيا بينيوە.

(١٥)رەفيق حيلمی هەلبژيردرا بە سەرۆكی حزبی هيوا لە كاتی دامەزراندنيدا (١٩٣٨)، گەلێ خويندكار و پياوی رۆشنبير و كورد پەروەری ئەوسای بە خۆيەوە گرت. پيش كۆتای جەنگی دووەمی جيهانی حزبەكە توشی تەنگ و چەلەمەی ناوخۆيی هات، تا لە سالی ١٩٤٥ هەلوەشايەوەو نەما، گەلێ لە ئەندامانی چوونە ناو حزبە تازە دامەزراوەكان، رۆليكی گرنگيان لەبواری خەبات و بەسەرهاتەكانی داهاتوی كوردستان بينی. (وەرگير).

مێـژوو نووسـان و رۆشـنبیرانی کـورد لـەم سـەردەمەی دوایـەدا بایـەخیان بـە لێتۆژینەوەی مێژووی نەتەوەکەیان داوە و تۆماریان کردووە، لەوانە حوسێن حوزنی موکریانی ١٨٦٦-١٩٤٧، لە مەهاباد هاتۆتە دنیا، کتێبەکانی لە حەلەب و رەواندوزو بەغدا بلاوکردۆتەوە. بەرهەمەکانی: بەخێوکردنی کرمی ئاوریشم (١٩٢٨). مێـژووی ئیمارەتەکانی کورد (١٩٢٩-١٩٣١) ناودارانی کورد (١٩٣١). کورد و نادرشا (١٩٣٤). کوردەکانی زەنـد (١٩٣٤). میرەکـانی سـۆران (١٩٣٥). کوردسـتانی موکـری (١٩٣٨) هتد... ئەوبەرهەمانەشی هەمووی بە کوردیە.

## مەلا جەمیل رۆژ بەیانی

لە گوندێکی ناوچەی قەرە حەسەن لە لیوای کەرکوك لەدایك بووە. ئەم کتێبانـەی وەرگێراوەتـە سـەر زمـانی عـەرەبی: مێـژووی سـلێمانی هـی محەمـەد ئـەمین زەکـی (١٩٥١)، شـەرەفنامە (کـە مێـژووی دەوڵـەت و ئیمارەتـەکانی کـوردە) دانەرەکـەی شـەرەفخانی بتلیسـیـیە (١٩٥٣). یاداشـتەکانی رەفیـق حیلمـی (١٩٥٧)، نامـە پیرۆزەکان هی سلیمان فایەق (١٩٦٣).

## شوکری فەزلی

ئـەدیبێکی عـەرەب کـە دەچێتـەوە سـەر عەشـیرەتی (الکرویـە القیسـیە) بـەڵام سەردەمی منداڵی لـە سلێمانی بەسـەر بـردووە، زمـانی کـوردی و تورکـی و فارسـی دەخوێنی. ماوەیەك لە رۆژنامەگەری کوردی کاری کردووە و لەسەر کوردی نووسیوە، ئەگەر بەرەچەڵەکیش نەبوبێ بەدڵ و بە گیان و رەوانی چۆتەوە سەر کورد.

شوکری کوڕی ئەحمەد ئاغا لەسەردارانی (کورەویە) لەسـاڵی ١٨٨٢ لـە بـەغدا هاتۆتە دنیا. کە دەگاتە تەمەنی پێنج ساڵی ساڵح ئەفەندی خـاڵی کەسەردەستەی نووسەرانی ئۆردوگای سلێمانی دەبێ لەگەڵ خۆی دەیباتە وڵاتی کوردان، زیاتر لە

چوارده ساڵی لێ دەمێنێتەوە، لەو ماوەیەدا زانیاری و زمانەکان دەخوێنێ. پاشان دەگەڕێتەوە بەغدا دەچێتە قوتابخانەی ڕوشدیەی سوپایی، ماوەیەك مامۆستایەتی دەکا، ساڵی ١٩٠٨ ڕوو دەکاتە ئەستەنبوڵ، دوو ساڵ لێی نیشتەجێ دەبێ، لەو ماوەیەدا لە ڕۆژنامەکانی تورکی کارمەند دەبێ، دەگەڕێیەوە بەغدا،پەیوەندی بە شێخ عەبدولوەهاب نائیب دەکا زانیارییەکانی (جادە)ی لێوەردەگرێ. هەندێ لایەنی زمانی ئینگلیزی و فەرەنسیش فێردەبێ. شیعری بە عەرەبی و کوردی و فارسی داناوە، داواکاری بیروڕای ئازاد بووە، ڕەخنەی لە ڕەفتاری دەسەڵاتدارانی فەرمان ڕەوا گرتووە، لە کەرکوك زیندانی دەکرێ. کە دەستوری عوسمانی ڕاگەیەندرا ناحەزی و دژایەتی (ئیتحادو ترەقی) لەسەردەمی والی بەغدا ئەحمەد جەمال بەگ دەکات (جەمال پاشا دوایی بە خوێن ڕێژ ناونرا) لەگەڵ تیپێکی تری پیاوانی بەغدا دەیانخاتە بەندیخانەو دەیەوێ بیانداتە دیوانی جەنگی عورفی لە پایتەختی تورکی. بەڵام سەرکردەی سوپا محەمەد فازل پاشای داغستانی پێیان ڕادەگا و بەریان دەدەن، ساڵی ١٩١٧ دوای داگیرکردنی بەغدا دەیکەنە باش کاتبی مەحکەمەی سوڵح، وە دەبێتە ئەندام لە لیژنەی وەرگێڕانی یاساکانی تورکی بۆ سەر زمانی عەرەبی، لە ١٩٢١ دەگوازرێتەوە بەنووسەر لە دیوانی ئەنجومەنی وەزیران و هەتا پایانی ژیانی لێی بەردەوام دەبێ. هەروەها پەنایان بۆ ئەو بردووە لە وەرگێڕانی یاساو نووسینی ڕەسمی و دانانی کتێبەکانی خوێندن بە زمانی کوردی.

لە یەکی حوزەیران ١٩٢٦ لە بەغدا گیانی لەدەست داوە. لە شاعیران: مەعروف ڕەسافی و جەمیل سدقی زەهاوی و هیتر شیوەنیان بۆ کردووە. دوای داگیرکردنی بەریتانیا شوکری فەزلی دەبێتە نووسەر لە ڕۆژنامەکاندا لەوانە: ڕۆژنامەی (العرب) و دوو ڕۆژنامە فارسییەکە.

## عەبدول قادر ڕەشید ناسری

شاعیری کورد عەبدول قادر کوڕی ڕەشید کوڕی ئیسماعیل ساڵی ١٩٢٠ لە سلێمانی هاتۆتە دنیا. باوکی بۆ ناسریە ڕەو دەکا و لێی نیشتەجێ دەبێ، نازناوی

**(ناسری) پێلکاوە، عەبدولقادر خوێندنی دواناوەندی لە بەغدا تەواو دەکا، دەستی داوەتە شیعر دانان، پەیوەندی بە محەمەد مەهدی جەواهیری و گەورە ئەدیبانی ترەوە دەکا (بلاغە و منطق) لای شێخ عەبدولقادر خەتیب و خوتبە خوێنی مزگەوتی "امام الاعضم" خوێندووە، بە کاری نووسەری لە رۆژنامەکاندا هەڵساوە، وەك رۆژنامەی "الرائد و النداء و الاوقات البغدایە"، ساڵی ١٩٤٨ لە ئیسگە دەبێتە فەرمانبەر، لە ساڵی ئایندەدا بۆ تەواو کردنی خوێندنی دەینێرنە پاریس، بەلاّم دوای ساڵێك لەبەر هەندێ هۆی ناچاری دەگەڕێتەوە، دوای ئەوە فەرمانبەریەتێکی بچوکی لە شارەوانی بەغدا دەست دەکەوێت، هەر ئەوەندە پێی دەژیا، ئەدەب دەکاتە پیشەی خۆی، ئازاری دەرونی تینی لێ دەستێنێ. مەی خواردنەوە دەکاتە فەرامۆشی و سێبوری خۆی، تا ئەوەی هێزی لەبەر دەبڕێ و عیزەتی نەفسی ڕیسواو دەماری گیانی سست و لاواز دەکات، لە ١٥ ئایاری ١٩٦٢ لە بەغدا سەری ناوەتەوە، ناسری شاعیرێکی خۆڕسکی ڕەسەن و شەرمن و بە ئەدەب بوو ساڵی ١٩٣٩ دیوان (الحان الالم)ی دەرچوواند، شانۆگەری "ضحایا المجتمع" و دیوانی "صوت فلسطین" جگە لەمەلحەمەو شانۆگەری و وتارەکانی تری کە لە رۆژنامەکانی عێراقی و عەرەبی دا بلاّوکردۆتەوە، لە غەزەل بالاّ دەست دەبێ هونەرو وردەکاریەکی زۆری تێدا دەرخستووە، دیوانە دەستخەتەکانی تری لە پاش بەجێماوە کە نەیتوانیوە بە چاپیان بگەیەنێ، جۆشی هەستی لەناو هێنانی ئافرەت و مەی دا خرۆشاوە، لە ئەڤینیدا وەك پەپولەیەکی نێو گوڵی باغان سووڕی خواردووە، باری قورسی ژیان دایتەپاند، شیعر گەیاندیە لوتکەی بەرزی و نەمری، نەمریەکی ئەڤینداری عاشق.**

احبك و الهوى وتر صدوح — وانسام معطرة وروح
ومجمرة دم العشاق فيها — بخور كلما احترقت تفوح
وفردوس من المتع الغوالي — على شطانة يحلو الصبوح
احبك، هل علمت، سلي دموعي — على كفيك لو سئلت تبوح
احبك، هل علمت بأن روحي — على شفتيك ذائبة تنوح
وأني قد عصرت دمي غراما — فأزهر من دمي طلح وشيح..

## حوسێن مەردان

شاعیری بێ نەواو ناهومێد پێشەوای ئەدەبی والا حوسێن مەردان لە خێزانێکی کورد نەژاد ساڵی ١٩٢٧ لە بەعقوبە هاتۆتە جیهان. بەساوایی لە خوێندن دادەبڕێ و دێتە بەغدا. لە بواری رۆژنامەگەریدا کار دەکا، بەر لەوەی تەمەنی لە بیست ساڵ تێپەڕ بوبێ، یەکەم کۆمەڵە شیعری لە ساڵی ١٩٤٩ لەژێر ناوی "قصائد عاریە" بە چاپ گەیاندووە، هاتووە هەستی پەشۆکاوی دەرونی و ناهومێد بوونی خۆی تێدا دەربڕیوە. گڕی ئارەزو و هەڵچونی سۆزو عاتیفەی لێ بەدی دەکرێ، کۆمەڵێکی پڕ جۆشی تری بەدووادا هات کە "ازاهیر الشر"ی شاعیری فەرەنسی شارل بۆدلێر (١٨٢١–١٨٦٧) مان دێنێتەوە یاد. حوسێن مەردان ساڵی ١٩٥٢ سەبارەت بەوەی گۆیا شیعرەکانی والآن (عاریە) حکوم دەدرێ، هەروەك بۆدلێر لە ناوەراستی سەدەی نۆزدەمیندا بەهۆی شیعرە بێ پەرواکانی لە پاریس حکوم دراوە.. شاعیرمان لە پێناوی باجی ئەدەبی کە بەسەریاندا سەپاند ماوەیەك لە بەندیخانە بەسەر دەبات، مەردان هەژارو کەساس بەو موچە کەمەی دەژیا کە لە کاری پەیامنێری و نووسینەکانی لە رۆژنامەکاندا دەستی دەکەوت، تا لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٢ لە بەغدا سەردەنێتەوە، بەرهەمەکانی: قصائد عاریە (١٩٤٩)، اللحن الاسود (١٩٥٠)، رجل الظباب (١٩٥١)، صور مرعبە (١٩٥١)، عزیزتی فلانە (١٩٥٢)، نشید الانشاد (١٩٥٥)، هلاهل نحو الشمس (١٩٥٥)، الربیع و الجوع، مقالات فی النقد الادبی (١٩٥٥)، رسالە من شاعر الی رسام (١٩٥٦)، الارجوحە هادئە الحبال، العالم تنور، طراز خاص.

## عوسمان پاشای جاف

عوسمان پاشا کوڕی محەمەد پاشا کوڕی کەیخوسرەو بەگ کوڕی سلیمان بەگ کوڕی زاهیر بەگ لە سەرۆکەکانی عەشیرەتی جافی کوردە، ساڵی ١٨٤٧ هاتۆتە دنیا. حکومەتی ئێرانی لە ساڵی ١٨٧٣ کردیە فەرمان ڕەوای جوانڕۆ و زەهاو، پاشان بەپێی پەیمانێك کەلەگەڵ حکومەتا مۆری کرد لەگەڵ باوکی و عەشیرەتەکەی دەگەڕێتەوە وڵاتی عوسمانی (١٨٧٧). باوکی دەکەنە قایمقامی هەڵەبجە، عوسمان بەگیش دەبێتە یاریدەدەری کە باوکی لە ساڵی ١٨٨٢ دەکوژرێ، مەحمود پاشای برای جێگای لە سەرۆکایەتی و قایمقامێتی دا دەگرێتەوە، تا ئەوەی عوسمان پاشا ساڵی ١٨٨٩ هەردوو پایەکە لە جێگای براکەی دەبینێ، نزیکەی بیست ساڵ بەو ئەرکە هەڵدەستێ، حکومەتی عوسمانی پایەی پاشایەتی (میری میران)ی پێ بەخشیوە، هەروەك لە پێشتر بە باوك و برای بەخشیبو. ساڵی ١٩١٠ لە هەڵەبجە کۆچی دوایی دەکا.

عادلە خانمی خێزانی کە لە بنەماڵەیەکی فەرمان ڕەوایانی ئەردەڵانیە ناوبانگی بە هۆشمەندی و دەسەڵاتداریەتی بەرفراوانی دەرکردبوو، مەیلی ئێرانی هەبوو، ئەو عادلە خانمەش کچی عەبدولقادر ساحێبقڕان زادەیە، ساڵی١٨٥٩ لە سنە هاتۆتە دنیا، شوو بە عوسمان پاشا دەکا (١٨٩٥)، لە ساڵی ١٩٢٤ لە هەڵەبجە ماڵ ئاوایی لە ژیان کردووە. حکومەتی بەریتانی دوای داگیرکردن سەبارەت بە خزمەتگوزاریەکانی نازناوی (خان بەهادر)ی پێ دەبەخشێ، کە نازناوێکی شکۆدارانەی هیندیەکانە.

مێجەر ئیدمۆندس ناوی بە (شاژنی شارەزوری تاج لەسەر نەکراو) بردووە. محەمەد ئەمین زەکی لە مێژووی سلێمانیدا دەڵێ: عادلە خانم بەسەر عوسمان پاشادا زاڵ بوو، دەستی بەسەر هەموو کاروباری شارەزوردا گرتبوو، دەسەڵاتی تەواوی بەسەر عەشیرەتەکانی جافدا هەبوو، هەر خۆی هەموو کێشەو گیروگرفتێکی یەکلا دەکردەوە، بەندیخانەی تایبەتی هەبوو، بازاڕێك و سێ خانووبەرەی گەورەی لە هەڵەبجە بنیادنا، لەسەردەمی ئەودا گوندی هەڵەبجە بووە شارۆچکەیەکی ئاوەدان و

قەشەنگ. بەڵام ئاڵوگۆڕی نامەو کاروباری هەموو بە زمانی فارسی بوو. هەروەها لە ئەردەڵانیش گوێ دێری فەرمانەکانی بوون.

ستیڤن لونغریغ لە کتێبەکەیدا "عێراق ١٩٠٠-١٩٥٠" دەڵێ: عادلە خانم سەرداریەتی خێڵ و عەشیرەتی جافی هەردوولای سنوری عێراق و ئێران بەهاوبەشی لەگەڵ عوسمان پاشای هاوسەری و مەحمود پاشای برای عوسمان پاشا دەکرد. لە ڕوی کاربەدەستانی عوسمانی دەوەستان، باج و خەراجیان نەدەدا، کۆڵەکەو ستونی تەلەفۆنەکانیان ڕیشەکێش دەکرد.

کە عوسمان پاشا ساڵی ١٩١٠ کۆچی دوایی دەکات، ژنەکەی دەسەڵاتداریەتی خۆی لە هەڵەبجەدا پاراست. تەنانەت کە شێخ مەحمود لە ئایاری ١٩١٩ شۆڕشی لەسەر کاربەدەستانی بەریتانی نایەوەو ئەفسەرە ئینگلیزەکان دەگرێ، ئەفسەری سیاسی بەریتانی توانی بە هۆی ئەم خاتونەوە لە هەڵەبجە ڕابکا. مێجەر سۆن دەڵێ: عادلە خانم سەردارێکی دانا بوو، ڕابەری خەڵکی ناوچەکەی دەکرد زۆریان لا خۆشەویست بوو، لەگەڵیان ئەوپەڕی تەبا بوو، ئافرەتێکی ناسک و پڕسۆزو چاك بوو.

## مەحمود پاشای جاف

مەحمود پاشای برای عوسمان پاشا لە ساڵی ١٨٤٥ لەدایك بووە، جێگای باوکی لە سەرۆکایەتی عەشیرەتی جاف و قایمقامیەتی قەزای هەڵەبجەدا گرتەوە (١٨٨٢)، بە پارێزگاری ئورفە دەگوازرێتەوە (١٨٨٩)، بەڵام نایکاو ڕوودەکاتە ئاستانە، دوای سێ ساڵ بە نهێنی دەگەڕێتەوە عێراق، پاشان بۆ جاری دووەم دەچێتەوە ئەستەنبوڵ، دیسان دەگەڕێتەوە هەڵەبجە، لەوێ لە ١٥ نیسان ١٩٢١ کۆچی دوایی دەکات. شاعیر بووە بە هەردوو زمان: کوردی و فارسی شیعری هۆنیوەتەوە، خواناس و ئاین پەروەر بوو، گەلێ مزگەوتی بنیاد ناوە.

لە کوڕە ناودارەکانی عوسمان پاشا: تاهیر بەگ و ئەحمەد موختار بەگ و عیزەت بەگ بوون.

## مەحمود خدر

لە سەرۆکەکانی هەماوەندە یاخی و ڕێگر، دونیای بەسەر خراپەدا وەرگێڕابوو، دەوڵەت ناچار دەبێ هەڵمەتی سوپایی بۆ سەرلە دوونان و تەفروتونا کردنی بنێری، پاشان مەحمود خدر لە ڕێگای ئیسماعیل پاشاوە هانا دێنیتە بەر دەوڵەت، لەگەڵ دەست و پێوەندو چەکەکانیانەوە خۆیان بەدەستەوە دەدەن. دوایی ئەوە دەیکەنە سەرکردەی دەرەك (جندرمە) لە موسڵ. هەر لەوێش لەساڵی ١٩٢٣ کۆچی دوایی دەکات.

عەباس عەزاوی لە بەشی هەشتەمی مێژووەکەیدا کە ئەویش لە مەحمود مەللاحی وەرگرتووە دەڵێ: (مەحمود خدر پیاوێکی ڕووخسار کۆکو ناسك بوو، بە چەتە و ئەشقیاکان نەدەچوو) تێکەڵاوی بەهۆی ژن و ژن خوازیەوە لەگەڵ بنەماڵەی تۆحەلە کە لە ئاغاکانی موسڵ بوون پەیدا دەکا. لە ئاکامی کوشتنی شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحمود لە ١٩٠٩ هەڵوێستێکی مەردانەی نواند بە پێچەوانەی پێش بینی خەڵکەکەوە.

## تاهیر بەگ

تاهیر بەگی شاعیر بەهەرسێ زمان کوردی و فارسی و تورکی شیعری داناوە. دیوانە شیعریەکەی لە سلێمانی (١٩٣٦) و لە بەغدا (١٩٣٧) و لە هەولێر (١٩٦٦) چاپ کراوە. لە هەڵەبجە هاتۆتە جیهان لە سلێمانی خوێندویەتی، ساڵی ١٩٣٧ ماڵ ئاوایی لە ژیان دەکا، بەڵام عیزەت عوسمان جافی برای بە نوێنەری سلێمانی بۆ ئەنجومەنی دامەزراندن هەڵبژێردراوە (١٩٢٤)، دوایی بە نوێنەر لە ئەنجومەنی نوێنەراندا (کانونی یەکەم ١٩٣٧)، سەرلە نوێ لە حوزەیرانی ١٩٣٩ هەڵدەبژێردرێتەوە، لە تشرینی یەکەمی ١٩٤٣ هەتا کۆچی دوایی بە ئەندامیەتی پەرلەمان دەمێنێتەوە (یەکی ئاب ١٩٤٥).



**تاهیر بەگ**

## ڕەشید پاشای زەهاوی

**محەمەد ڕەشید کوڕی محەمەد فەیزی زەهاوی موفتییە برای جەمیل سدقی شاعیرە. لە ٢٨ی کانونی دووەم ١٨٤٨ لە بەغدا هاتۆتە دنیا. پیاوێکی ئەدیب و هۆشمەند و هێمن بوو، دەچێتە ناو فرمانی بەڕێوەبەرایەتی، دەیکەنە قایمقام لە قەزاکانی عێراق و سوریادا، جا ئەندامی مەحکەمەی ئیستینافی بەغدا، پاشان دەبێتە بریکاری موتەسەریفی لیوای کەربەلا (١٩٠٦)، دوایی موتەسەریفی لیوای مونتەفیك. لە ٢٩ی کانونی دووەمی ١٩١١ لە بەغدا جیهان بەجێ دێڵێ. جەمیل سدقی برای شیوەنی بۆ دەکا دەڵێ:**

| | |
|---|---|
| یا ضریحا الرشید ینام | مطمئنا مني علیك السلام |
| اکبرت لیلة الرشید اللیالي | ومضت في اکبارها الایام |
| هد رکن البیت الزهاوي خطب | جلل جاءهم ورزء جسام |

**عەبدول ڕەحمان بەننا دەڵێ:**

| | |
|---|---|
| صبراً جمیلاً فالزمان یجور | و العمر فان و الحیاة غرور |
| من قال ان الشمس تغرب في الثری | و البحر في طی التراب یغور |
| و البدر یسمي في المقابر آفلا | ومن العجائب للبدور قبور |

**لەسەردەمی بەڕێوەبەرایەتیەکەی ئەودا مانگرتنی بازرگانە ئێرانییەکان لە کەربەلا سەبارەت بە سەپێندراوی باج و خەراجی قورس بەسەریاندا ڕوو دەدات، زیاتر لە پەنجا ڕۆژ لەسەر هەندێ لە شەقامەکان دادەنیشن، بڵاوەی لێ ناکەن، نە ئامۆژگاری زانایان و نەهەڕەشەی کاربەدەستان سودی نابێ. ئیتر لە تشرینی دووەمی ١٩٠٦ پۆلیس گوللە بارانیان دەکات، حەفتا کەسیان لێ دەکوژرێ و ژمارەیەکی زۆریش بریندار دەبن، بە فەرمانی ئاستانە لێتۆژینەوە لەبەسەرهاتەکەی دەکرێ، والی بەغدا مەجید بەگ لێ دەخرێ.**

## عەبدوڵڵا موخلیس ڕەسول زادە

عەبدوڵڵا موخلیس بەگ ڕەسول پاشا زادە ساڵی ١٨٥٩ لە رەواندوز هاتۆتە دنیا. لە ساڵی ١٨٧٣ لە نوسینگەی لیوای کەرکوك دادەمەزرێ، تا ئەوەی دەبێتە سەرۆکی نوسینگەکە. فرمان گۆڕکێ دەکات، لە کۆیەو ڕەواندوز دەبێتە تۆژەرەوە (١٨٩٠). دەگوازرێتەوە بۆ فرمانی بەڕێوبەرایەتی، لە قەزا جیاکاندا دەبێتە قایمقام وموممەیز، لە فەرمانگەی ویلایەتی موسڵ بە نوێنەری هەولێر بۆ ئەنجومەنی دامەزراندن هەڵدەبژێردرێ (١٩٢٤)، پاشان نوێنەر لە پەرلەمان (١٩٢٥-١٩٢٨). دوای ئەوە جیهان بەجێ دێڵێ.

## حەمدی پاشای بابان

لە پیاوە ناودارەکانی بنەماڵەی بابانە، ئەو محەمەد حەمدی پاشایە کوڕی حوسێن بەگ کوڕی محەمەد پاشا کوڕی خالید پاشا کوڕی ئەحمەد پاشا کوڕی بەکر بەگ کوڕی سلیمان بەگ بابان زادەیە، ساڵی ١٨٤٦ لە سلێمانی هاتۆتە دنیا، بە منداڵی ڕووخانی ئیمارەتی بابان دەبینی، هێنایانە بەغدا، دەبێتە فەرمانبەر لە دیوانی ویلایەتدا، دەیکەنە داواکاری گشتی لە موسڵ پاشان لە بەیروت، دوایی پشکێنەری دادوەری (عدلیە) لە هەرسێ ویلایەتەکانی عێراقدا، ئینجا موتەسەریفی لیوای حودەیدە لە یەمەن دوایی لە عەممارە (١٩٠١-١٩٠٢) و مونتەفیك (١٩٠٦).

دەبێتە وەزیری بێ وەزارەت لە حکومەتی کاتی نەقیب دا (٢٥ تشرینی یەکەم ١٩٢٠)، بەڵام ئەم پایە بەلاوە دەنێ و نایکا. ساڵی ١٩٢٢ لە ئەعزەمیەی دەوروبەری بەغدا کۆچی دوایی دەکات. وەزیری مێژوو نووس محەمەد ئەمین زەکی لە کتێبەکەیدا (مێژووی سلێمانی و دەوروبەری) باسی دەکاو دەڵێ: بایەخی بە لێکۆڵینەوەی یاساکان دەداو چووەتە بنجوبناوانی، بەڕەوشت بەرزی و پیاوچاکی ناوی بردووە، ستایشی شارەزایی و زۆرزانی و بەهرەی سیاسی و ڕاستی ڕاو بۆچوونەکانی دەکات.

## محەمەد ساڵح میللی

محەمەد ساڵح کوڕی حاجی عەلی یە، دەچێتەوە سەر هۆزی میللی کە لە عەشیرەتە گەورەکانی کوردە، بنچینەی جێنشین بوونیان ناوچەکانی شامە.

تەیمور پاشای میللی لە دەوروبەری (ڕقە) لە دەوڵەتی عوسمانی هەڵدەگەڕێتەوە، ساڵی ١٧٩٠بۆ تەمبێ کردنی داوا لە سلێمان پاشا والی بەغدا دەکرێ، تەیمور خۆی دەرباز دەکاو هەڵدێ، پاشان دێتە بەغدا پەنا دەباتە بەر والیەکەی (١٧٩٤). کە ڕەزامەندی دەوڵەت لە ١٨٠٠ وەردەگرێ، دەیکەنە فەرمان ڕەوای (ڕقە)... لەو سەردەمەی دووایەدا ئیبراهیم پاشا سەرداری گشتی هۆزەکە لە زەمانی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم دا ناوبانگی دەرکرد، سوڵتان ناوچەی دیاربەکر و ئورفە و ماردینی دەداتێ (١٩٠٦-١٩٠٧)، کە دەستور ڕاگەیەندرا دژی ئیتیحادیەکان ڕاپەڕی، لە چواردەوری شامەوە هەڵمەتیان هێنایە سەر، لە تشرینی دووەم ١٩٠٨ بەسەر عەشیرەتەکانیدا زاڵ دەبن، لەو ئانەشدا ئیبراهیم پاشا کۆچی دوایی دەکات.

محەمەد ساڵح میللی، لە بەغدا لەدایك دەبێ، لای محەمەد فەیزی زەهاوی و عەبدوڕەحمان قەرەداغی و زانایانی سەردەمی خۆیدا دەخوێنێ، دەبێتە نووسەر لە مەحکەمەی شەرعی، لە زۆر جێگا قازی دەبێ، ساڵی ١٩٠٩ قەزای دیوانیەی پێ دەسپێرن، ماوەیەك بە ئەرکی بریکاری موتەسەریفی لیواکە هەڵساوە (١٩١١)، پاشان لە هەمان ساڵدا بە هیوای دەستکەوتنی پایەی موتەسەریفی بەرەو ئەستەنبۆڵ دەڕوا، کە لەوە ناهومێد دەبێ ڕوودەکاتە پاریس، بانگهێشت بۆ (لامەرکەزیەت) دەکات، دوایی دەگەڕێتەوە بەغدا، کە جەنگی گشتی لە کۆتایی ساڵی ١٩١٤ بەرپا دەبێ ساڵح میللی لە ئەستەنبۆڵ دەبێ، لەگەڵ ساڵح محێیەدین گەیلانی ئەندامی ئەنجومەنی پیران و هیتر بەوەفد بۆ بەغدایان دەنێرن بۆ مەبەستی بانگ داهێشتنی عەشیرەتەکان بۆ جیهاد و پشتگیری کردنی دەوڵەتی تورکی. دەیگەڕێننەوە بە بریکاری موتەسەریفی دیوانیە (١٩١٦)، پاشان کە ئینگلیزەکان شارەکە داگیر دەکەن لە حوزەیرانی ١٩١٧ لەوێ دەیکەنە حاکم، دوای ئەوە بووەتە سەرۆکی ئەنجومەنی ئەوقاف (نیسان ١٩٢٢)، ئیتر خۆی لەکارو فرمان دەست بەردار دەکات، پیرێکی پەك

کەوتە دەبێ، لە بەغدا لە ١٩٤٢ سەری ناوەتەوە، پیاوێکی دنیایی و ئاینی و ئارەزودار و مەرد و بە هیمەت بووە.

کوڕەکەی عومەر حیفزی میللی (١٨٩٢-١٩٧٠) پایە بەرزەکانی دادوەری و بەڕێوەبەرایەتی بینیوە، پشکێنەری دادوەری بووە (١٩٤٢)، موتەسەریفی لیوای دیالە (١٩٤٢)، دوایی هی کەربەلا (١٩٤٣) ئینجا کوت (١٩٤٤)، بە پشکێنەری بەڕێوبەرایەتی دەگوازرێتەوە (١٩٤٦)، بە (مدون قانونی) دەیگەڕێننەوە وەزارەتی داد (١٩٤٨)، دوایی بەڕێوەبەری گشتی دادوەری (١٩٥٠)، پاشان ئەندامی مەحکەمەی تەمیز (١٩٥٣). مستەفا عەلی پێی ڕاگەیاندم: کەوا عومەر حیفزی پێی گوتووە: مێژووی لەدایک بوونم لە ناوەکەم دایە. باوکم ئەو ناوانەی بۆ هەڵبژاردووین کە مێژووی ساڵی لەدایك بوونمان بگرێتە خۆی، ئەمەشی بۆ هەموومان پەیڕەو کردووە، تەنیا فازڵی برای بچوکمان نەبێ چونکە لە کاتێ هاتنە دنیای دا باوکم لە ئەستەنبۆڵ دەبێ، عومەر حیفزی بەپێی (الجمل) دەکاتە (١٣٠٨ك) ئەوەش ساڵی هاتنە جیهانیەتی.

## حەمدی بەگ بابان(1)

ئەحمەد حەمدی بەگ کوڕی محەمەد ڕەشید پاشای ناسراو بە خدێو کوڕی سلیمان پاشا کوڕی خالید پاشای بابانە، لە دەوروبەری ساڵی ١٨٧٠ هاتۆتە دنیا. لە کۆلێجی (الملكيە الشاهانيە) لە ئەستەنبۆڵ خوێندویەتی، داواکاری بیروڕای ئازاد بووە، لەسەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمدا زیندان دەکرێ، کاتی ڕاگەیاندنی دەستور لە ساڵی ١٩٠٨ بەردەدرێ، بە نوێنەری کۆمەڵەی (ئیتیحادو ترەقی) دەنێردرێتە بەغدا، بەڵام بە گوێرەی "ریشارد کوك" لە کتێبەکەیدا (بغداد مدينە السلام) وەرگێڕانی (فوئاد جەمیل و دکتور مستەفا جەواد)، دەڵێ حەمدی بەگ سەیری دەکا کۆمەك خوازی و پشت بەستن بە ئەشراف و ناودارە پارێزگاکانی بەغدا زەحمەتە، کە بەهۆی بنەمای ئاینی بەرهەڵستکەری شۆڕشە تورکییەکە بوون، مەگەر بە ڕواڵەت ئەگینا پێی قایل نەبوون، کە جەنگە مەزنەکە کۆتایی پێهات ماڵەکەی لە

بەغدا بووە مەڵبەندی پێك گەیشتنی پیاوانی کورد، پەیوەندییەکی بەتینی لەگەڵ نیشتیمان پەروەرانی کوردی سلێمانی پەیدا کردبوو، کاربەدەستانی بەریتانیا بۆ مەبەستی ئارام بوونی ناوچەی کوردستان ساڵی ۱۹۲۰ روویان لە حەمدی بەگ نا کە سەردانی سلێمانی بکا، کە فەرمان ڕەواکەی مێجەرسۆن بوو، بە پێنجوێن و هەڵەبجە و ڕانیەشدا گەڕا، پاشان دەگەڕێتەوە بەغدا دوور کەوتنەوەو لاتەریکی لە کاری سیاسی بەباش زانیوە. کاتێ زەویەکانی لە حارسیەی رۆژئاوای بەغدا لێ زەوت کراو دەستی بەسەردا گیرا بۆ مەلیك فەیسەڵی یەکەم، دوای ئەوە حەمدی بەگ ناسرا و لەبری ئەوەشا قایل نەبوو مزەی پارەکەش وەربگرێ، ساڵی ۱۹۲٦ عێراقی بەجێ هێشت و ڕووی کردە لەندەن، لێی نیشتەجێ بوو. بە نیگەران و ناگزوری دەژیا، یارمەتی دانیشی لە هیچ کەسێك نەدەویست، تا لە تشرینی دووەمی ۱۹٦۰ دووچاری مەرگ دەبێ. کتێبەکانی لە بەغدا فرۆشرا، دکتۆر مستەفا جەواد هەندێکی کڕی، یاداشتە سیاسیەکانی تێدا بوو کە حەمدی بەگ بە تورکی نووسیبووی. حەمدی بەگ نمونەیەکی سەرسەختی گەورەیی و بەخۆنازو نەفس بەرز بوو، یەعقوب سەرکیس بۆی باس کردم و گووتی: محەمەد ڕەشید پاشا (باوکی حەمدی بەگ) موتەسەریفی حیللە بوو، لەبەر مەزنی و بەخۆنازی ناسرا بوو بە خدێو محەمەد ڕەشید پاشا، حەمدی بەگ لە باوکیەوە زەوی و زارێکی کشتوکاڵی بەرفراوانی لەو پارێزگایە بۆ بەجێ مابوو، لەماوەی جەنگی یەکەمی مەزنا بەکرێی ساڵانە دەیداتە سەلمان بەڕاك بە هەزار لیرەی زێڕی تورکی، هەموو ساڵێ بەڕاك لیرەکانی بە نەختی بۆ دەهێنایە بەغدا، هەندێ ساڵیش دوای دەخست، دواجار حەمدی بەگ بۆ خۆی دەچێتە حیللە بە دوای کرێ گرتەکەدا دەنێرێ کابراش دێت و نۆسەد لیرەی بۆ دەهێنی، داوای لێبوردنیشی لێدەکاو بەڵێن دەدا دوای ماوەیەکی کەم سەد لیرەکەی تریشی بۆ بێنێتە بەغدا، بەڵام حەمدی بەگ زۆر تووڕە دەبێ و بەتووندی لەگەڵی دەدوێ نۆسەد لیرەکەشی فڕێدەداتە عاردی ولێدەداو و دەڕواتەوە، سەرکیس دەڵێ: دوای ئەوە بەڕاك ناچێتە بەغدا کاتێ ئینگلیز داگیری دەکات، وابزانم حەمدی بەگ هەزار لیرەکەی هەموو لە کیس دەچێ!. کە زەویەکانی حارسیەیان دەست بەسەردا

گرت، نرخەکەی نیو ملیۆن روپیە دەدەنە حەمدی بەگ، بەڵام ئەو داوای ملیۆنێك دەكات، ئیتر پارەكە بەلاوە دەنێ و هیچ وەرناگرێت، پاشان بە بێزاری دەربڕین بۆ ئینگلتەرە دەڕوا، بە كەساسی سەردەنێتەوە، برادەرو ئاشناكانی لە لەندەن بە دەست كورتییەكەی دەزانن بەوپەڕی ڕێزو نەوازشەوە بانگ هێشتنی نان خواردنی نیوەڕۆ یان ئێوارەی بۆ دەكەن، كەچی لەبەر نەفس بەرزی و سەربەرزی خۆیەوە دەعوەتەكەیانی ڕەت دەكردەوەو نەدەچوو.

محەمەد ڕەشید پاشا، باوكی حەمدی بەگ لەساڵی ١٨٢٢ لە سلێمانی هاتۆتە جیهان. فەرمان بەریەتی لە فەرمانگەی ویلایەتی موسڵدا دەكات، پاشان دوو جار لە ساڵی ١٨٧٧ و ١٨٨٢-١٨٨٣ دەبێتە موتەسەریفی حیللە، هەروەها موتەسەریفی مونتەفیك و تەعز لە یەمەن و دێرەزور، والی بەتلیس بووە (١٨٨٢-١٨٨٦)، لە كانونی یەكەمی ١٨٩٥ لە ئەستەنبوڵ ماڵ ئاوایی لە ژیان دەكات.

لە ڕووشكێنی و سەر سەختیەكەی دەگێڕنەوە: یەكێك لە گەورە پیاوانی ناوداری بەغدا بۆ هەندێ كاروباری تایبەتی دەچێتە بارەگای موتەسەریفیەتی حیللە، پاشا لەوێ نابێ دەیبەنە ژوورەكەی ئەو چاوەڕێی هاتنەوەی دەكات كە محەمەد پاشا دەگەڕێتەوە سەیر دەكا میوانەكەی لە ژوورەكەی ئەودا هاتوچوو دەكا! زۆر لێی توڕە دەبێ، بەسەر زەنشتەوە پێی دەڵێ: چۆن ڕێت بەخۆت داوە وا بەبێ ڕێزو حورمەت لە ژوورەكەی مندا هاتووچۆ بكەیت هەروەك لە هەیوانیماڵەكەی خۆتابی!!

## میر لیوا فەتاح پاشا

فەتاح كوڕی سلیمان ساڵی ١٨٦١ لە بەغدا هاتۆتە دنیا، باوكی كڕین و فرۆشتنی كردۆتە پیشە، لە بنچینەدا خەڵكی شاری توز خورماتوە، فەتاح كە باوكی دەمرێ تەمەنی لە دە ساڵی تێپەڕ نەكردبوو، خوێندنی دوا ناوەندی لە بەغدا تەواو دەكات، پاشان هەوار دەباتە ئەستەنبوڵ، دەچێتە خوێندنگای سوپایی. ئینجا قوتابخانەی ئەركان، بە ئەفسەر ڕوكن دەردەچێ، ماوەیەكی زۆر لە سوپای توركی كارمەند دەبێ، تا دەگاتە پایەی ئەمیر لیوا، بەڕێوەبەری كارگەكانی چنینی سوپابووە

له بەغدا، پێش جەنگی گشتی (١٩١٤) تەقاعود دەکرێ. لەسەر ئەنجامی دامەزراندنی حکومەتی عێراق دەیکەنە پارێزگاری لیوای کەرکوک (١٥شوبات ١٩٢١)، پایەکەی نزیکەی چوار ساڵ هەتا ١٩٢٤ بینیوە، لە ساڵی ١٩٢٦ لەگەڵ نوری بەگی کوڕی کارگەیەکی چنینی خوری لە کاظمیة دادەمەزرێنێ، کە لەسەرەتای پرۆژە پیشەسازیە نوێیەکانی عێراق بووە، بەدرێژایی ساڵان پەرەی سەندو سەرکەوتنی وەدەست هێنا، هەتا حکومەت لە ساڵی ١٩٦٤ خۆماڵی دەکات. فەتاح پاشا لە ٨ی کانونی دووەمی ١٩٣٦ کۆچی دوایی کردووە، دوو کوڕەکەی: سلێمان بەگ و نوری بەگ ناودار بوون.

سلێمان فەتاح لە ساڵی ١٨٩١ هاتۆتە دنیا لە خوێندنگای سوپایی لە ئەستەنبۆڵ دەخوێنێ، بە ئەفسەر لە سوپای تورکی خزمەت دەکا. لە ناوەڕاستی ئابی ١٩٢٠ دێتە کفری، هانی سەردارانی ناوچەکە دەدا بۆ شۆڕش نانەوە و باسی سەرکەوتنەکانی شۆڕشگێڕانی فوراتی ناوەڕاستیان بۆ دەکات، ئیبراهیم سەرۆکی بەشێك لە عەشیرەتی دەلۆ بە یارمەتی هەندێك لە هۆزی جاف لە ڕووی کاربەدەستانی بەریتانی ڕادەپەڕێ، سلێمان دێتەوە بەغدا، لە ١٨ کانونی یەکەم ١٩٢١ دەچێتە ناو سوپای عێراقی وە پایەی "ڕەئیس" رائدی پێ دەدرێ، دەیکەنە یاوەری وەزیری بەرگری دوایی یاریدەدەری ئامیری خوێندنگای سوپایی (١٩٢٥)، ساڵی ١٩٢٧ بۆ بەشدار بوونی لە دەورەیەکی سوپایی دا دەینێرنە هیند بۆ ساڵی ئاینده بۆ پایەی (مقدم) بالآ دەکرێ، لە خزمەتگوزاری سوپا خۆی سەرفراز دەکا، لە تشرینی دووەم ١٩٣٠ بە نوێنەری کەرکوك هەڵدەبژێردرێ، دوایی هەر بە نوێنەری کەرکوك دەمێنێتەوە (١٩٣٥)، پاشان هی هەولێر (١٩٣٤)، جارێکی تر نوێنەری کەرکوك (١٩٣٥-١٩٣٦) و تشرینی یەکەمی ١٩٤٣ و ئازاری ١٩٤٧ هەتا شوباتی ١٩٤٨، لە حوزەیرانی ١٩٦٠ لە لەندەن جیهان بەجێ دێڵێ.

نوری فەتاح لە ساڵی ١٨٩٣ لەدایك دەبێ، لە خوێندنگای سوپایی دەردەچێت، بە پایەی (ملازم)ی یەکەم دەبێتە ئەفسەر لە سوپای تورکی دا، دوای جەنگە مەزنەکە دەگەڕێتەوە عێراق، بەشداری لە بزوتنەوە نیشتیمانی‌یەکەدا دەکا، بۆ دورگەی هنجام ئاوارەی دەکەن (ئاب ١٩٢٠). لە شوباتی ١٩٢١ بەردەدرێ. لەگەڵ فەتاح

پاشای باوکی کارگەی چنین لە (کاظمیة) دادەمەزرێنی (١٩٢٦) بە بەڕێوەبەر هەتا خۆماڵی دەکرێ.

هەڵبژێردرا بە ئەندامی لیژنەی بەڕێوەبەرایەتی ژووری بازرگانی بەغدا. ساڵەهای ساڵ تێیدا کارمەند دەبی، دەبێتە سەرۆکی وەفدی عێراقی بۆ کۆنگرەی بازرگانی‌یەتی دەوڵەتان کە لە (رای) سەر بە شاری نیویورك لە تشرینی یەکەمی ١٩٤٤ بەسترا. دوای خۆماڵی کردنی کارگەکانی دوا ساڵەکانی ژیانی لە بەیروت بەسەر بردووە، دەکەوێتە ژێرباری گرانی دەردو بیماری تا تێیدا دووچاری مەرگ دەبێ (ئایاری ١٩٧٦).

## ئیبراهیم حەیدەری

شێخی ئیسلام و وەزیری ئەوقافی عێراقی ئیبراهیم حەیدەری کوڕی عاسم کوڕی ئیبراهیم حەیدەریە، ڕەچەڵەکی بنەماڵەکەی دەچێتەوە سەر برای شا ئیسماعیل سەفەوی کە بەغدای لە ساڵی ١٥٠٨ داگیر کردووە، ئەویش کوڕی سوڵتان جونەیدە وەك دەڵێ گوایا دەچێتەوە سەر ئیمام موسای کازم باپیری، بنەماڵەکەیان شێخ سەفیەدین لە پیاوە خواناس و سۆفیەکان بووە، لە نەوەکانی ئیبراهیم کە بۆ عێراق دێ و لێی نیشتە جێ دەبێ محەمەد کوڕی شێخ حەیدەر (قطب الدین) بووە، ئەو خێزانە لە گوندی حەریر[٢] نزیك هەولێر هەوار نشین بوون، نەوە دوای نەوە دەستەیەك لە زاناو ئەدیبانیان لێ پاشەکەت بووە، لە بەناوبانگترینیان ئیبراهیم فەسیح حەیدەریە (١٨٢٠-١٨٨١) دانەری کتێبی (عنوان المجد فی بیان احوال بغداد و البصره و نجد). ئیبراهیم حەیدەری: لە ساڵی ١٨٦٤ لە هەولێر هاتۆتە دنیا، زانیاریەکانی عەرەبی و ئاینی لای زاناکانی سەردەمی خۆیدا دەخوێنی. ئیجازەی زانستی پێدراوە،بەقازیەتی زاخۆ دادەمەزرێ، دوو ساڵی لێدەمێنێتەوە، پاشان ڕووی کردۆتە ئاستانە، دەچێتە خوێندنگای حقوق بڕوانامەکەی لێ وەردەگرێ، چەندین پایەی بینیوە، دەیکەنە سەرۆك دادگای بازرگانی لە (جەدە)، ئینجا داواکاری گشتی لە موسڵ، دەچێتەوە ئاستانە، دەیکەنە ئەندامی ئەنجومەنی مەعاریف، پایەی جیاجیای دادوەری بینیوە، تا ئەوەی ساڵی ١٨٩٨ دەیکەنە سەرەك ئەنجومەنی (دار

الخير العالي). دەبێتە سەرەك لە هەندێ لیژنەی هەمیشەیی بەڕێوەبردنی مەعاریفی عوسمانی. كە ئەنجومەنی مەعاریفیان نەهێشت، دەیكەنە قازی ویلایەتی دیار بەكر (١٩٠٦)، جا سەرۆكی كاروباری شەرعیە لە (نظارة الدفتر الخاقانی)[٣] لە پایتەختی خەلافەت، ئینجا ئەندام لە (دار الحكمه الاسلامیه) كە لە ١٩١٥ دامەزراوە. لە كۆتایی جەنگە مەزنەكەدا لە دامەزراندنی وەزارەتی ئەحمەد تۆفیق پاشا دەبێتە شێخی ئیسلام (١١ تشرینی دووەم ١٩١٨). هەروەها لە وەزارەتی دووەمی تۆفیق پاشا لە (١٣ی كانونی دووەمی ١٩١٩ هەتا ٣ی ئازاری ١٩١٩)، دوای ئەوە دەبێتە فەرمانبەرێكی تایبەت بە ئەنجومەنی وەزیرانی توركی، ئینجا بۆ جاری سێیەم لە وەزارەتی عەلی ڕەزا پاشادا دەبێتەوە شێخی ئیسلام (٢٠ی تشرینی یەكەم ١٩١٩)، هەمان پایە لە وەزارەتی سالح خلوسی پاشادا (٨ئازار ١٩٢٠- ٢نیسانی ١٩٢٠). لە سالی ١٩٢٣ دەگەڕێتەوە عێراق، بە نوێنەری هەولێر بۆ ئەنجومەنی دامەزراندن هەڵدەبژێردرێ (١٩٢٤). لە وەزارەتی یاسین هاشمی وەزارەتی ئەوقافی پێ سپێردراوە. (٤ی ئاب ١٩٢٤ هەتا ٢٠ی حوزەیران ١٩٢٥). پاشان لە تەموزی ١٩٢٥ دەیكەنە ئەندام لە ئەنجومەنی (ئەعیان) تا لەیەكی كانونی دووەمی ١٩٣١ جیهان بەجێ دێڵێ. شێخ ئیبراهیم حەیدەری دەستخەتی لە فەلسەفەی مێژووی ئیسلامی و فەلسەفەی ئاینەكاندا هەیە، لە بەرهەمە بەجێماوە بڵاوكراوەكانی: مێژووی تەسەوف لە ڕێگەی ئیسلامەتیدا. لە ئاستانە چاپكراوە، هەروەها قەسیدەیەكی دوورو درێژی بۆ لەدەست چوونی عێراق هۆنیوەتەوە، یەكجار بیر تیژو شارەزای ئەدەبی زمانەكانی عەرەبی و توركی فارسی و كوردی بوو، وتووێژی پڕ چێژی ئەدەبی و زمانەوانی لەگەڵ جەمیل سدقی زەهاوی و ئەحمەد فەخری و ئاسەف قاسم ئاغا لە ئەنجومەنی پیراندا هەبووە. مەحمود سوبحی دەفتەری لە چۆنیەتی دانانی ئیبراهیم حەیدەری بە شێخی ئیسلام بۆی باس كردم گووتی: لە ئاكامی تێكشكانی دەوڵەتی عوسمانی لە جەنگە مەزنە جیهانیەكەدا و داواكردنی ئاگربەستی تشرینی یەكەم ١٩١٨.

ئەحمەد تۆفیق پاشا (صدر الاعظم)ی پێشو كە پیاوێكی پیری پەك كەوتەی دەست بەرداری كارو فرمان و گۆشەگیری ناوماڵ بوو كەچی داوای لێكرا حكومەتێكی

نـویٚ دابمـــەزریٚنیٚ. وەزیرەکــان یــەك لــە دوای یــەك دەســت نیشــان کــران، کــە لــە (صدر الاعظم) یان پرسی کیٚ بۆ پایەی شیٚخی ئیسلام دەپالٚیٚوی (کە بەرزترین پایەی دەوڵەتە دوای سەرەك وەزیران) دوو دڵ و داماو پاشان ناوی پیاویٚکی هیٚنا پیٚیان گووت: ئەوە مردووە. ناوی یەکیٚکی تری برد پیٚی دەڵیٚن: ئەوە نەخۆشەو لە ماڵەوە کەوتووە، لە دوایدا یەکیٚك لەوان ناوی شیٚخ ئیبراهیم حەیدەری دەینی و دەکەویٚتە ستایشی چاکەو لیٚهاتویی ئیتر دەیهیٚنیٚ بۆ شیٚخایەتی بالاٚ، بەلاٚم هۆی لادانی لە وەزارەتدا دەفتەری دەڵیٚ: حەیدەری کتیٚبیٚکی داناوە دانەیەکی لیٚ دەکاتە دیاری بۆ سوڵتان محەمەدی شەشەم داوای تەمەن دریٚژی و نەمری لە سەر تەختی خەلافەت بۆ دەکا، بەلاٚم لەو دانەی کە بە دیاری بۆ جیٚگرەکەی ئەمیر عەبدولمەجید دەنووسیٚ: داواکارم کاتی وەرگرتنی دەسەلاٚتداریەتیت بۆ بەختەوەری جیهان و بەرزیەتی پایەی موسڵمانان نزیك بووبیٚ، هەڵەیەك ڕوودەدا کە سەرچاوەکەی نەزاندرا، نوسخەی کتیٚبی (جیٚگرەکە) دەدریٚتە سوڵتان کاتیٚ نووسراوی دیارییەکە دەخویٚنریٚتەوە پیٚی پەست و تووڕە دەبیٚ. لە دڵی خۆیدا دەیهیٚڵیٚتەوە، پاش ماوەیەکی کەم وەزارەت دەکەویٚ و ئیبراهیم حەیدەری لە شیٚخایەتی ئیسلام دەردەهیٚندریٚ!! ئەوەش دوا سەردەمی بوو لەو پایە بەرزەدا. کە دەگەڕیٚتەوە عیٚراق دەیکەنە وەزیری ئەوقاف، پایەکەی بەسەر گرانی وەردەگریٚ، دوای ئەوە کە بەرزترین پایەی ئاینی لە دەوڵەتی عوسمانیدا هەبووە، ڕۆژیٚك مەحمود سوبحی لیٚی دەپرسی: چۆن خۆت لە وەزارەتی ئەوقاف دەبینی؟ ئاهیٚکی هەڵکیٚشاوە دەڵیٚ: لە پیٚشەوە بووین وا ئیٚستاش بووین بە کلك!!.. وەزیری ئەوقاف ئەوسا لە زنجیرەی وەزیرانی دەوڵەت بە دوا وەزیر دادەندرا و، دەبوایە دوای هەموو هاوڕیٚکانی ئیمزا لەسەر یاساو دەستورەکان بکات، عەلی شەوقی لە کتیٚبەکەدا (الاحکام) دەگیٚڕیٚتەوە دەڵیٚ: ڕۆژیٚك ئیبراهیم حەیدەری کە شیٚخی ئیسلام بوو لە ئەستەنبوڵ پیٚی گوتم: لە تۆمارگەی دیوانی شیٚخایەتیدا سەیری کرد کە رابەرو ئامۆژگارانی ئاینیان بۆ شاری دیوانیە ناردووتە عیٚراق گوایا فارسن و ئاینیان بت پەرستییە و پیٚویستیان بە ڕیٚنمایی دەستوری ئیسلامەتی هەیە. ئیبراهیم حەیدەری لیٚی پرسیووە دەربارەی دیوانیەو خەڵك و دانیشتوانی؟ شیٚخ عەلی



لە سالی ١٩٤١ لە فەرمانەکانی میری دەست بەردار دەبی. دەکەویتە کاروباری تایبەتی خۆیەوە. دەبیتە وەزیری دارایی لە وەزارەتی حەمدی پاچەچی دا (٤ حوزەیران ١٩٤٤ – ٢٣ شوبات ١٩٤٦)، لە تشرینی دووەمی ١٩٤٤ بە نوینەری موسڵ هەلدەبژیردریّ. لە وەزارەتی سالح جەبر دەبیتە وەزیری پەروەردە (٢٩ ئازار ١٩٤٧ – ٢٧ کانونی دووەم ١٩٤٨)، بە نوینەری سلیمانی هەلدەبژیردریّ (٣١ ئاب ١٩٤٧)، هەلدەبژیردریّ بە ئەندام لە کۆڕی زانیاری عیراق لە کاتی دامەزراندنیدا. بە جیگری یەکەمی سەرۆکەکەی هەلبژیردراوە (١٢ کانونی دووەم ١٩٤٨)، لە شوباتی ١٩٤٩ وازدەهینیّ، دەکریّ بە ئەندامی ئەنجومەنی پیران (٢٧ ئەیلول ١٩٤٨)، پاشان وەزارەتی کاروباری کۆمەلایەتی لە وەزارەتی سیّیەمی تۆفیق سویدی پیّ دەسپیردریّ (٥ شوبات ١٩٥٠ –١٦ ئەیلول ١٩٥٠)، بە سەرۆکی ئەنجومەنی بالای زانیاری لە وەزارەتی مەعاریف هەلبژیردراوە (تەمموز ١٩٥١)، بەلام دوای مانگیك وازی لیٰ دەهینیّ، لای باشتر بووە کەلەئەندامیەتی ئەنجومەنی پیران بمینیتەوە. لە

ساڵی ١٩٥١ بەشداری لە دامەزراندنی حیزبی ئومەی ئیشتراکی بە سەرۆکایەتی ساڵح جەبر دەکا و بەجێگری سەرەك حیزبەکە هەڵدەبژێردرێ، لە کانونی یەکەمی ١٩٥٥ بە جێگری دووەمی سەرەك ئەنجومەنی ئەعیان هەتا ئەیلولی ١٩٥٦ هەڵبژێردراوە. کاتێ ماوەی ئەندامی‌یەتی کۆتایی پێ دێت دووبارە لە ساڵی ١٩٥٧ هەتا شۆڕشی تەموزی ١٩٥٨ ئەندامیەتی ئەنجومەنەکەی پێ دراوەتەوە. پێش بەرپابوونی شۆڕشەکە دەچێتە بەریتانیا لە پایتەختەکەی نیشتەجێ دەبێ، خوی داوەتە لێکۆڵینەوەو دانان لەگەڵ مێجەر ئەدمۆندس ڕاوێژکاری پێشوی وەزارەتی ناوخۆی عێراق کە بەزمان زانێکی کوردی ناسرا بوو، پێکەوە فەرهەنگی کوردی و ئینگلیزییان داناوە، لە ساڵی ١٩٦٦ چاپکراوە. گەلێ جار لە ساڵانی ١٩٧٦-١٩٨٣ لە لەندەن سەردانیم دەکرد، دەمدیت پیرێکی لەسەرخۆ سەرەڕای تەمەن درێژی و بێ تاقەتی هەر خەریکی دانان و نووسین بوو، لەدووا ساڵەکانا بە ئیفلیجی لەسەر جێگا کەوتبوو.

تۆفیق وەهبی دانان و وتار و موحازەراتی بە زمانی عەرەبی، تورکی، کوردی و ئینگلیزی هەیە، لەوانە: (ڕەشاشات - بە تورکی- ١٩١١)، بەڵام دانانە کوردیەکانی ئەمانەن: ڕێزمانی کوردی ١٩٢٩ و ١٩٥٦ زمانی کوردی بە پیتەکانی لاتینی ١٩٣٣، فەرهەنگی کوردی - عەرەبی ١٩٤٣، فەرهەنگی کوردی - ئینگلیزی لەگەڵ ئەدمۆنس (١٩٦٦)، لە دانانەکانی بە زمانی عەرەبی: (القصد و الأستطراد في اصول معنى بغداد (١٩٥٠)، دروب السياسة. ئالتون کوپری (١٩٥٦)، بهرام گور (١٩٥٧)، اصل اسم كركوك (١٩٥٨)، اصل تسمية شهرزور (١٩٦١)، سفرة من دربندي بازيان الى (ملە) ى تاسلوجة (١٩٦٥).

کتێب و نامەی بە زمانی ئینگلیزیش داناوە لەوانە: هەڵکۆڵین و نەقشی بەردەکان لە ئەشکەوتی گندۆك (١٩٤٩)، بقايا المثرائية في الحضر و كردستان العراقية اليزيدية، (١٩٦٢) دراسات كردية بەشی یەکەم (١٩٦٨)، هەروەها کتێبی لێکۆڵینەوەی لەسەر ئاین و داستانە کۆنەکانی داناوە، بە تایبەتی هی ئێرانی، لەسەر (صائيبە) و (سۆفیەتی). بایەخی بە کتێب و چەك و شتی نایابی دەگمەن داوە، کتێبخانەکەی ماڵەوەی لە بەغدا پڕ بوو لە چاپەمەنی و دەستنوس و کۆمەڵێك

کەلوپەلی دەگمەن و پەیکەر و پارچەی چەکە کۆنەکان و شتی سەیر. لە ئاکامی دامەزراندنی کۆری زانیاری کورد لە حوزەیرانی ١٩٧١ لە بەغدا (تۆفیق وەهبی) یان تێدا کردوە بە ئەندامی فەخری، ئەویش بڕیاریدا هەموو دەست نوسەکانی خۆی بۆ کۆر بکاتە دیاری. دوای دەردو نەخۆشیەکی گران لە پێنجی کانونی دووەمی ١٩٨٤ لە لەندەن کۆچی دوایی کرد، تەرمەکەیان بردەوە بەغدا لە سلیمانی بە خاك سپێردرا.

بیرو راکانی وتوویژ لەگەلی دا: لە تۆفیق وەهبی یان پرسی: لە بنچینەدا تۆ پیاوێکی عەسکەری بووی چۆن رووتکردە زانست؟ گوتی: حالی منیش وەك حالی ئاشەوانەکەی تۆلیستۆی لیهات، لە کتیبیکی تۆلیستۆدا (فەلسەفەی ژیان) هاتووە: ئاشەوانێك لە دەستکەوتی ئاشەکەی خۆش بەخت و دلنیا دەژیا، رۆژێ ویستی بزانێ چۆن کاری هارین روودەدا، دیتی ئەوا پێچکە گرنیە گرنیەکانی یەك یەك تێك هەلکیشراوە بەردە ئاشەکە دەسورێنێ، ماوە بەدوای ئەو هێزەدا بگەرێ کە پێچکەکان دەجولێنێ، سەیری کرد ئەو ئاوەیە کە لە تەوقەسەری چیاکە دیتە خوار، پیا هەلگەرا سەرچاوەی ئاوەکە بدۆزێتەوە، کانیەکەی دیتەوە، جا کەوتە تۆژینەوەو پرسیار لەم و لەو، کە زانی سەرچاوەی ئەو ئاوەی کە لە کانیەکە دیتە دەر لە ئاوی باران پێکهاتووە کە دیتە خوارو نغرۆ دەبێ و لە ناخی زەوی پێچ دەخوا دەگوێزرێتەوەو کۆدەبێتەوە تا لە شوێنێك دەردەچێ کانی لی پەیدا دەبی.. جا ما پرسیار بکا لە چۆنیەتی پێکهاتنی باران!!. هەروەها تۆفیق وەهبی گوتی: کە ئامریەتی کولیەی عەسکەریم وەرگرت، وتنەوەی دەرسی فارسیم کەوتە ئەستۆ، سەبارەت بەوەی ئەو زمانە چلیکە (لقیکە) لە زمانی هیندی ئەوروپی یان ئاری کۆنە، ناچار بووم دەست بە لێکۆلینەوەی هەموو ئەو لایەنانە بکەم. کە لە شیوەو تەبیعەتی ئەدەبی کوردی لییان پرسی ووتی: ئەو ئەدەبە کوردیانەی بەجیماون هەمووی هۆنراوەو هەمە چەشنن، هەیە مەلحەمەیە، هەشە داستان و چیرۆکی خۆبەخت کردنی دلدارییە یان وەسفی جەنگ و شەرەکانە و هیتر.. دەریخست کە شاعیرانی دیرین: ئەحمەدی خانی و مەلای جەزیرییە، بەلام لەسەردەمی ئیستادا: حاجی تۆفیق پیرەمیرد و رەمزی مەعروف، گۆران، شیخ سەلام کە وەرگیری چوارینەکەی خەیامە بۆ کوردی، تۆفیق وەهبی لە پیشەوەی

بایــەخدەرانی زمــانی کوردییــە، کەوتوەتــە دیراســەت و توێژینـــەوەی شــێواز و دەستورەکانی، لە لەندەن وتارێکی بۆ ڕۆژنامەی (التآخي) بەغدای نووسیوە، لە ١٠ی ئازاری ١٩٧٣ بۆی بلأو دەکرێتەوە، ئەوەی تێدا نیشان داوە کە زمانی کوردی بێ توانا یاخود کەم ووشە نیە، بەڵام وشەکانی کۆنە لە ئاکامی پێشکەوتنی زانست و هونەر و پیشەسازی پێویست بەجێ نایەنن، وەك حاڵی عەرەب ئاسا ناچار بوین وشەی بێگانە وەربگرین و لە چوارچێوەی وشەی عەرەبی بیتوێنینەوە و بەکاری بهێنین. تۆفیق وەهبی دەڵێ: هەندێ نامیلکەی مەشقی سوپایم وەرگێڕاوەتە سەر کوردی و لە سلێمانی چاپم کرد. بۆ بەکارهێنانی لەسەردەمی حکومەتی شێخ مەحمود، پاشان ساڵی ١٩٢٤ دەستم بە بلأوکردنەوەی وتار کرد لە گۆڤاری (دیاری کوردستان)ی بەغدا لە ژێر ناوی "چۆن زمانی کوردی بنوسین". وەزارەتی مەعاریف ساڵی ١٩٢٣ داوای لێکرد ڕێزمانی کوردی دابنێ تا لە قوتابخانەکان بخوێندرێ، کە کەوتە کارکردن دیتی پیتەکانی عەرەبی دەنگ و بزوێنەکانی کوردی بەجێ ناهێنن، لە باسەکەی کۆڵیەوە، ڕەمزو نیشانە داهێنان بۆ یەکبوونی دەنگ کە وێنەیان لە پیتەکانی عەرەبیدا نیە، بەڵام وەزارەتی مەعاریف کارەکەی پەسند نەکرد، و ڕێزمانی کوردی ساڵی ١٩٢٩ تەواو کرد، پاشان لە ساڵی ١٩٣٣ نامەیەکی کوردی بلأوکردەوە لە ژێر ناونیشانی خویندنەوەی نوێ (القراءة الحديث) لە بارەی بەکارهینانی تیپی لاتینی بۆ نوسینی کوردی ساڵی ١٩٢٤ فەرهەنگیکی کوردی – عەرەبی بلاوکردەوە، کە هەزار تاکە وشەی کوردی پەتی تیدا بوو، ساڵی ١٩٥٦ دەچیتە بەیروت بۆ سەرپەرشتی دارشتنی تیپە تایبەتی‌یەکان، لە دوو بەشدا بلاوی کردەوە بەشی یەکەم و دووەم لەسەر گرامەری زمانی کوردی بوو.

هاوسەرەکەی: خاتو ئاسیای خیزانی کچی رەزا ریزەلی بازرگانە، خوشکی ماهیرو دکتۆر عەبدول جەبارە، لە پیشەوای راپەرینی ئافرەتانی عیراقە، بەشداری لە کۆمەلەی ڕۆشنبیرو خیرخوازەکاندا کردووە، سەرۆکایەتی کۆمەلەی منداڵ پاریز– بەشی ئافرەتان – دەکا. لە کاتی دامەزراندنیدا (ئازار ١٩٤٥)، ئەندامیکی هەمیشەیی بوو لە کۆمەلەی قەلاچۆکردنی نەخۆشی و گیروگرفتەکانی کۆمەلایەتی‌دا،

سەرۆکایەتی یەکێتی ئافرەتان دەکا لە کاتی دامەزراندنیەوە ١٩٤٥ هەتا شۆڕشی ١٤ی تەمموز ١٩٥٨ و گۆڤارەکەشی لە تشرینی دووەمی ١٩٤٩ دەرچواندوە، لە ماوەی سەرۆکایەتی ئەودا یەکێتیەکە داوای یەکسانی مافی ئافرەتانی لەگەڵ پیاودا کردوە کە لە بواری سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتی مافی هەڵبژاردنی پێ بدرێ و مافی سیاسی خۆی بەکاربێنێ. یەکێتیەکە لە ساڵی ١٩٤٥ هەینییەکی بۆ ئافرەتانی ڕێکخست، کۆمەڵێك لە سیاسەتمەدار و پیاوی یاساناس و ڕۆژنامەگەر و ئەدیبان بەشدارییان تێدا کردو، خاتو ئاسیا سەرۆکایەتی کۆنگرەی ئافرەتانی عەرەبی دەکا کە لە ئازاری ١٩٥٢ لە بەغدا دەبەسترێ، نوێنەرانی میسر و سوریا و لبنان و فەلەستین بەشدارییان تێداکرد، هەروەها ئافرەتانی عێراقی لە چەندین کۆنگرەی عەرەبی و دەوڵەتان لە لوبنان و سوریا و پاکستان دا کردووە.

لە حوزەیرانی ١٩٥٥ کۆنگرەیەك لە هاوینەهەواری حەمدون لە لوبنان بۆ لێکۆڵینەوەی باری ئافرەتان لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست لە ژێر سایەی نەتەوەیەکگرتووەکاندا بەسترا، ئاسیا خان بەشداری تێدا دەکاو دوانێکی لەسەر لێپرسراوی ئافرەتانی عەرەبدا. دوای شۆڕشی تەموز لەگەڵ هاوسەرەکەی لە لەندەن دەژیا، تا لە ١/١٩٨٠ لەوێ سەردەنێتەوە، تەرمەکەیان هێنایەوە بەغدا لە ئارامگای گەیلانی نێژرا. لەدایك بوونی لە دەوروبەری ساڵی ١٩٠٠ بووە، لە بەغدا لەسەردەمی تورکەکاندا لە قوتابخانەی ڕۆشنبیری کچان خوێندویەتی.

ساڵی ١٩٢٧ بۆتە هاوسەری تۆفیق وەهبی، لە کاتی کۆچکردنیدا لە حوزەیرانی ١٩٨٠ بۆ سەرە خۆشی چوومە سەردانی تۆفیق وەهبی، سامی خوندەی وەڵلاش زاوای لەوێ کە لە بەغداوە هاتبوو، پێی گۆت: وەسیەت بێ لات کە مردم لە ناوچەی سلێمانی لە دۆڵی جوانڕۆ لەقەد چیای پیرەمەگرون بمنێژن[١٠]، خاك و گەردی ژنەکەشم بگوازنەوە، با لەتەنیشتم ئارام بگرێ لە ژیانی سەرمەدیدا. هەروەها گوتی: پیرەمەگرون پیاوێکی (وەلی)بووە و لەوێ نێژراوە، چیاکەش هەر بەناوی ئەو ناو دەبرێ، کوردەکانی ئەو ناوچەیە بڕوایان وایە (ئەصحابە) بووە، کە ئەویش ڕاست نییە، تۆفیق وەهبی هەتا مرد هەر بەردەوام بوو لە بایەخمەندی جوغرافیا و زمانی

کوردی، هەمیشە لە لیکۆڵینەوەو نووسینی ئەو باسانەدا بووە، لیی پرسیم: وشەی (قافیە) لە چییەوە هاتووە؟ پیم گوت: بیگومان لە (قفو) هاتووەو (اقتیفاء) واتە پیکەوتن و (تعقیب) و بەدوادا چوون. زمانزانەکان کردویانەتە نیشانەی (استطراد) دوا وشە لە هۆنینەوەدا. گوتی: لە کوردیشدا بە هەمان واتا بۆ قافیەی شیعر بەکار دەهینریّ، ئەو وشەی (کۆك)ی بۆ داریشت، پیاوانی کورد پیی قایل نەبوون، بەلکو بەردەوام بوون لە بەکارهینانی ووشەی عەرەبیەکە، ووتم: بۆ دەتەویّ بیگۆری، هەموو زمانیك وشەی بیگانە هاتۆتە ناوی و لاشیان نەداوە، نمونەم بەناوی هەندیّ خواردەمەنی و ئامراز و شتی تر بۆ هینایەوە کە عەرەب لە فارسیان وەرگرتووە.

مستەفا کەمال ئەتاتورك هەولی دا زمانی تورکی لە عەرەبیو فارسی پاك بکاتەوە کەچی پەنای بردە بەر زمانە ئەوروپیەکان، لە هەولدانەکەی سەرنەکەوت.

تۆفیق وەهبی بەگ ووتی: زمان سیمای ژیانی نەتەوەیە، دەبیّ کورد زمانەکەیان پاك بکەنەوە، ناسکی بکەن، هەتا هەست بەنەتەوەی خۆیان و کەرامەتیان بکەن. ئەوەی شایانی وتنە کەمن لە دەمیّ سالەوەیە لە بەغدا، توفیق وەهبی بەگ دەناسم ویستی کۆمەلەیەکی رۆشنبیری دابمەزرینیّ و بەشداری لە راپەرینی ئەدەبیدا بکا.. داوای کۆبوونەوەی لە مالەکەی خۆیا لیکردین، دەستەیەك لە پیاوانی زانست و ئەدەب ئامادەبوون، لەوانە: ئیبراهیم واعیز، مستەفا جەواد، محەمەد حەسەن سەلمان، عەبدول مەجید قەساب، صفاء الخلوصی، فوئاد جەمیل، گورگیس عەواد، مومتاز عومەری، عومەر خالید شابەندەر، ئەمیر نورەدین و ناهیدە رەفیق حیلمی..هتد. کۆمەلەی دانان و وەرگیران و بلاوکردنەوەمان دامەزراند، تۆفیق وەهبیمان بەسەرەك هەلبژارد، ابراهیم الواعظ بە جیگری سەرۆك، لە حوزەیرانی ١٩٥٨ ژمارەی یەکەم لە گۆڤارەکەی بە ناوی "الکتاب" مان دەرچواند، ژمارەی دووەمی لە مانگی داهاتوودا دەرچوو، پاشان لە تەموز شۆرش بەرپابوو، کۆمەلەکە هەلوەشاو گۆڤارەکەش وون بوو. توفیق وەهبی لە وتە سەرەتاییەکەی کردنەوەی گۆڤارەکەدا ئاواتی خواست کۆمەلەکە بەشداری لە بزووتنەوەی دانان و وەرگیراندا بکا، گوتی: من ئومید دەکەم هەولدانمان لە مەیدانی وەرگیران و گواستنەوە لە زمانی فرەنجی و رۆژهەلاتی بۆسەر

عەرەبی بەند نەبی، بەلکو کردو کۆشمان دەبێ کتیبی عەرەبیش بۆ ئەم سەر زمانانە وەرگیرین، ئەدەبی بەرزمان دەرخەین، بەرهەمەکانی زانستیمان بلاوبکەینەوە، بەوە روباریکمان دەبێ دەرژیتە ناو باغی رۆشنبیری جیهانی سەردەم. بزووتنەوەی دانان و بلاوکردنەوە لەهەر وولاتیکدا چوست و چالاك نابێ ئەگەر جولانەوەیەکی وەرگیرانی لەگەل نەبێ و پشتگیری لی نەکرێ، دەبێ رۆشنبیریمان موتربە بکەین بە رۆشنبیریەتیك دەبێ بۆ نشونماو بە هیزبوونی دەولەمەند بکرێ، بەوەی کەلە رۆشنبیریەتی تردا هەیە، خەلیفەکانی عەباسی بەم راستیەیان دەزانی تایبەت لەوانەی باسیان بکەم، مەنسور دوای ئەو مەئمون هانی بزووتنەوەی وەرگیران و گواستنەوە لە هیندی و فارسیو ئیغریقی داوە تا ئەوەی سەردەمەکەیان لە دەولەمەند و گەشەدارترین سەردەمی رۆشنبیریەتی ئادەمیزادی لیهات[11].

## محەمەد عەلی مەحمود

محەمەد عەلی سالی ١٨٩٢ لە شاری کۆیە سەر بەلیوای هەولیر لە دایك بووە، مەحمودی باوکی فەرمانبەر دەبێ. سالی ١٩١٣ چۆتە کولیەی حقوق لەبەغدا.

کە جەنگی مەزن بەرپا دەبێ لە سوپای تورکی دەیکەن بە ئەفسەر (ئیحتیات)، لە شەرەکانا بریندار دەبێ، لە کۆتایی سالەکانی جەنگ بۆ موسل دەینیرن، پاشان دەگەریتەوە بەغدا، لە خویندن بەردەوام دەبێ و بروانامەی حقوق سالی ١٩٢٠ بەدەست دینێ، لە هەمان کولیەش دا نوسەر دەبێ (١٩١٩-١٩٢٠)، سالانیکی زۆر کاری پاریزەری دەکات، هەتا دەیکەنە سەرەك تەدوینی یاسا، و بەریوەبەری گشتی عەدلیە (تشرینی یەکەم ١٩٣٣)، پاشان بەریوەبەری گشتی تاپۆ (١٠ حوزەیران ١٩٣٤) ئینجا ئەندامی مەحکەمەی تەمیز (کانونی یەکەم ١٩٣٤)، لە هەمان کاتیشدا موحازەراتی لە کولیەی حقوق هەبووە. لە ئابی ١٩٣٥ بەنوینەری لیوای دیالە هەلبژیردرا، لە هەشتی ئەو مانگەدا دەیکەنە جیگری یەکەمی سەرەك ئەنجومەنی نوینەران، پاشان بە نوینەری هەولیر هەلدەبژیردرێ (شوبات ١٩٣٧)، هەروەها لە بیست و حەوتی ئەو مانگەدا هەلدەبژیردرێ بە جیگری یەکەمی سەرەك نوینەران.

دەبیتە وەزیری دارایی (٢٤ حوزەیران ١٩٣٧-١٧ ئابی ١٩٣٧)، جاریکی تر بە نوینەری هەولیر هەلبژیردرایەوە (کانونی یەکەم ١٩٣٧- شوباتی ١٩٣٩)، دوای ئەوە بۆ ماوەی دوو رۆژ دەبیتە وەزیری دارایی (لە ٢٩-٣١ی کانونی دووەمی ١٩٤١)، لە دوا دواییەکەی سەردەمی وەزارەتی سێیەمی گەیلانی، دەبیتە وەزیری دارایی، پاشان لە حکومەتی بەرگری نیشتیمانیدا دەیکەنە وەزیری مواسەلات و ئەشغال ١٢ نیسان ١٩٤١. لە ٢٢ی ئایاری ١٩٤١ پەنا دەباتە بەر ئیران، لەوێ دەیگرن و رەوانەی باشوری ئەفریقای دەکەن ١٩٤٢. لە نیسانی ١٩٤٤ دەیگەریننەوە عیراق، پینج ساڵ حوکمی قورسی بەسەر دا دەدەن ١٦ی ئاب ١٩٤٤.. بەلام لە ٨ی تەمموز ١٩٤٧ بەری دەدەن. لە تشرینی دووەمی ١٩٥٠ بە نوینەری کۆیە هەلدەبژیردرێ، هەتا تشرینی یەکەمی ١٩٥٢. دەبیتە وەزیری داد ٧ی ئایار ١٩٥٣، دوایی جیگری سەرەك وەزیران ١٧ی ئەیلول ١٩٥٣ تا ٢٩ نیسان ١٩٥٤. دووبارە دەبیتەوە وەزیری داد ٨ی ئازار ١٩٥٤ تا ٢٩ نیسان.. دەکرێ بە ئەندام لە ئەنجومەنی ئەعیان ئازار ١٩٥٤، تیدا دەمینیتەوە هەتا شۆرشی ١٤ی تەموز ١٩٥٨. لە ٣ی ئاب ١٩٥٤ بە وەزیرایەتی داد دەگەریتەوە، هەروەها بە ئەرکی بریکاری وەزارەتی ئەعمار هەلدەستێ ٨ی ئایار ١٩٥٥. لە ١٤تشرینی دووەم ٥٥ هەتا ٧ی کانونی یەکەم ١٩٥٥ بە وەزیرایەتی ئەعمار دەگوازریتەوە. لە ٢١ی کانونی دووەمی ١٩٦٥ لە بەغدا کۆچی دوایی کردوە. عەلی شیخ مەحمودی هاوریی لە حکومەتی نیشتمانیدا لە یاداشتەکانیدا دەلێ: محەمەد علی مەحمود و کامیل شبیب لە ئیرانەوە نامەیان بۆ کاربەدەستانی عیراق نوسیوە پەشیمانی و توانج و گلەییان لە بزوتنەوە نیشتمانیەکە داوە، خۆیان لە لیپرسراوی ئاکامەکەیان بیبەری کردوە. دەست و دامین بونی حکومەتە تازە داهاتووەکەیان نیشان داوە بەلام دادی نەدان.

## دارا بەگ

دارا محەمەد عەلی سەرداری عەشیرەتەکانی داودە، کوری محەمەد بەگ کوری عەلی ئاغا کوری ئیسماعیل کوری محەمەد کوری حەقی بەگە، لە سالی ١٨٩١ هاتۆتە

دنیا. نیشتەجێبوونی عەشیرەتەکەی لە ناحیەی سەر بە لیوای کەرکوکە، بە نوێنەری کەرکوك بۆ ئەنجومەنی دامەزراندن هەڵبژێردراوە ١٩٢٤، دوای ئەوە لە ئەنجومەنی نوێنەران سەر لە نوێ لە شوباتی ١٩٣٥، ١٩٣٩ هەتا ١٩٤٣، و ١٩٤٣، ١٩٤٦، ١٩٤٧، ١٩٤٨ هەڵدەبژێردرێتەوە، لە شوباتی ١٩٥٦ کۆچی دوایی دەکات. مێژوونووس عەباس عەزاوی لە کتێبەکەیدا (عشائر العراق الكردية) باسی دارا بەگ دەکات: دەڵێ لەناو میلەتەکەی خۆیدا خۆشەویست و ڕێزدار و گوێرایەڵی بووین[١٢].

## ئەمین ڕەشید ئاغا

لە سەرۆکەکانی هۆزی هەماوەندە لە ناوچەی بازیان سەر بە لیوای سلێمانی. ئەمین ڕەشید ئاغا دەچێتەوە سەر تیپی ڕەمەوان، ئەگەر چی عەباس عەزاوی لە بەشی دووەمی کتێبەکەیدا "العشائر الكردية" دەڵێ: باپیری ئەو تیپە ڕەمەیە، واتە ڕەمەزان. ئەمین کوری ڕەشید کوری قادر کوری حەیدەرە، لەسەر ئەنجامی هەرای شێخ مەحمود لە سلێمانی دەیکەنە قایمقامی قەزای چەمچەماڵ ئازار ١٩٢٣، بەلام ڕووداوی تالانکردنی ناوچەکەیان خستە ئەستۆی ئەو، لای دەبەن و لە تەمووزی هەمان ساڵدا بەندی دەکەن، ئەمین ڕەشید لە حوزەیرانی ١٩٣٩ و حوزەیرانی ١٩٤٨ و کانونی دووەمی ١٩٥٣ و ئەیلولی ١٩٥٤ بە نوێنەری کەرکوك هەڵدەبژێردرێ، لە ئەیلولی ١٩٦٦ جیهان بەجێ دەهێڵێ.

عەشیرەتی هەماوەند وەك ئەمین زەکی بەگ لە کتێبەکەیا "مێژووی سلێمانی و دەوروبەریدا" دەڵێ: هەماوەند لە ئازاترین عەشیرەتەکانی کوردە، لە شەڕو شۆڕشدا لە هەمووان خۆڕاگرو چەتوونترن، تا ئەوەی ژنەکانیشیان لەهەراو هورەکانیاندا بەشدارن، ئەو عەشیرەتە حکومەتی عوسمانییان گێژ کردبوو، چەندین جار یاخی بوون و هەڵمەتی سوپایی دەنارده سەریان، بە تایبەتی لەسەردەمی والی بەغدا.

نامیق پاشای گەورە، مەدحەت پاشا، ڕەئووف پاشا، تەقییەدین پاشا، لەسەرۆکە بەناوبانگەکانیانن، فەقێ نادر کەوا لە ساڵی ١٨٧٢ خۆی تەسلیمی حکومەت دەکاو دێتە بەغدا، جوامێر کە بەدەستی ئێرانیەکان لە ١٨٨٦ دەکوژرێ،

پاشان هەماوەندەکان لە هاوینی ١٩٠٩ ریگای نیوان کەرکوك و سلیمانی دەگرن، هەردوو حکومەتی تورکی و ئیرانی بۆ سەرکوتکردنیان هیزیان ناردۆتە سەریان، ناچار روویان کردۆتە ناوچەی زەهاو، بۆ سالی ئاییندە والی نازم پاشا ریگای گەرانەوەیان بۆ بازیان دەدا.

گەنجەکانی هەماوەند لەسەردەمی تورکدا ناویان بە ریگری و تالانکردنی ریبوارانی ناوچەکەیان دەرکردبوو، خاوەیان بەسەردا دەسەپاندن، تا وای لیهاتبوو لە ناو عیراقیەکاندا وشەی هەماوەند مانای ریگر بگریتەوە.

## سەلاحەدین بابان

سەلاحەدین کوری لامیع بەگ لە بنەمالەی بابانە، لە سویرە سالی ١٨٩١ هاتۆتە جیهان، باوکی لەوێ قایمقام دەبێ و لە کوت و بەغدا خویندویەتی، چۆتە کولیەی حقوق و بروانامەکەی لە ١٩١٤ لی وەرگرتووە، لەسەر ئەنجامی بەرپابوونی جەنگی گشتی بۆ خزمەتی سوپایی بانگ هیشت دەکرێ، دەچیتە دەورەی ئەفسەر ئیحتیات و پایەی ملازمی دووەمی پێ دەدریت. دەچیتە ناو کۆری شەرەوە، باسکی چەپی بریندار دەبێ، پاشان خەریکی بەریوەبردنی مولکەکانی دەبێ. سالی ١٩٣٠ بە نوینەری هەولیر هەلدەبژیردریتەوە، کانونی یەکەم ١٩٤٥، بە نوینەری خانەقین هەلدەبژیردرێ ١٩٤٧.

لە ٣٠ی ئازاری ١٩٥٠ لە بەغدا کۆچی دوایی دەکا. دایکی کورد بوو، هەمیشە هەستی کوردایەتی هەبوە، بە پیچەوانەی جەلالی برای کە دایکیعەرەب بووە، بەشداری لە کۆمەلە نهینیەکانی داواکار بە مافی عەرەب دەکرد.

## جەلال بابان

جەلالەدین کوری رۆستەم لامیع بابان زادەیە، خانەوادەی بابان لە بەناوبانگترین خیزانانی کوردە، میژووەکەی دەگەریتەوە بۆ حەفت سەدە لەمەوبەر، فەرمانرەوای

ناوچەی شارەزوریان کردوە، پاشان سنوری ئیماراتەکەیان بەرفراوان کرد. میر ئیبراهیم پاشا پایتەختەکەی لە سالی ۱۸۷۵ بۆ سلیمانی دەگویزریتەوە، رۆلەی بنەمالەکەیانی تیدا فەرمانرەوا دەبن هەتا دەولەتی عوسمانی لە سالی ۱۸٤۸ ئیماراتەکەیان لەناو دەبات. رۆستەم لامیع بەگ قایمقام دەبێ لە سویرەو قەزاکانی تر، کوری ئیسماعیل بەگ کوری ئیبراهیم پاشا کوری ئەحمەد پاشایە، جەلال بابان لە سالی ۱۸۹۲ لە بەغدا هاتۆتە جیهان. دایکی لە هۆزی (المیاح)ی عەرەبیە، لە قوتابخانەی ئامادەیی عەسکەری خویندویەتی، سالی ۱۹۰۹ روو دەکاتە ئەستەنبۆڵ، لە خویندنگای سوپایی دەخوینێ. لە نیسانی ۱۹۱۲ بە ئەفسەر تۆپسازی دەرچوە، چۆتە ناو لیوای هەشتەم، بەشداری لە جەنگی بولقاندا کردوە. دوای ئەوە دەگوازریتەوە بۆ فەیلەقی سیزدەم کە خراوەتە سەر لیوای سی و حەفتەمی مەدفەعیەی بیابان لە عیراق. کە جەنگی گشتی بەرپا دەبێ خۆی و تیپەکەی ماوەی سێ سالْ شەرەکانی قەفقاس دەبینێ، لە یەکی ئەیلولی ۱۹۱۵ بۆ ملازمی یەکەم بالاْ دەکرێ، لە چوارەمین سالی جەنگا دوای کەوتنی بەغدا بە دەستی سوپای ئینگلیز لەگەڵ تاقمی سوارە کە خۆی سەرکردایەتی دەکرد رەوانەی مەیدانی عیراقی دەکەن. هەر بەردەوام دەبێ لەشەر هەتا ئاگر بەست و راوەستانی جەنگەکە. جەلال بە لاویەتی کاری بۆ مەسەلەی عەرەبی کردوە، چۆتە ناو کۆمەلەی "عەهد"ی نهینی. کە دەگەریتەوە عیراق، پاش کۆتایی هاتنی جەنگی مەزن دەستی بە تیکۆشانی نیشتمانی کردۆتەوە. بەشداری لە دامەزراندنی حیزبی "حرس الاستقلال"ی نهینی دا کردوە، سالی ۱۹۲۰ کاربەدەستانی داگیرکەر گرتوویانە بۆ دورگەی "هنجام" لە خەلیج ئاوارەی دەکەن، یانزدە مانگی لی دەمینیتەوە، دوای راگەیاندنی لیبوردنی گشتی بەر دراوە، دەچیتە ئەرکی بەریوەبەرایەتی، دەیکەنە قایمقامی سامەرا (۲٤ کانونی یەکەم ۱۹۲۱)، ئینجا خانەقین (۱۹۲۲)، دیلتاوە (۹ تەموز ۱۹۲۲)، دوای ئەوە دهۆك ۱۹ ئاب. جا موتەسەریفی لیوای مونتەفیك (یەکی شوباتی ۱۹۲۷)، موتەسەریفی کەربەلا (۸ نیسان ۱۹۳۰)، موتەسەریفی لیوای هەولیر (۲٦ تشرینی دووەم ۱۹۳۱)، لە وەزارەتی ناجی شەوکەت دەبیتە وەزیری دارایی و هاتوچۆ ۳ی

تشرینی دووەمی ١٩٣٢) وەزارەتی یەکەم و دووەمی ڕەشید عالی گەیلانی. دەکرێ بە وەزیری بەرگری (٢٠ی ئازار ١٩٣٣ - ٩ی تشرینی دووەمی ١٩٣٣)، بە نوینەری هەولیر بۆ ئەنجومەنی نوینەران هەلدەبژێردرێ (ئازار ١٩٣٣ - ئەیلولی ١٩٣٤)، لە وەزارەتی دووەمی مەدفەعی پایەی وەزیری (مەعاریف)ی پێ دەدرێ (٢١ شوبات ١٩٣٤) هەتا (٢٥ ئاب ١٩٣٤)، پاشان لە ١١ی کانونی یەکەمی (١٩٣٤) دەیکەنە بەریوەبەری گشتی دارایی ئینجا بەریوەبەری دارایی گشتی و هاتوچۆ (٢٧حوزەیران ١٩٣٥)، بۆ جاری دووەم بەریوەبەری گشتی ئابوری (١٤ کانونی یەکەم ١٩٣٦) بەوەزیرایەتی دارایی و هاتوچۆ بەشداری لە وەزارەتی مەدفەعی چوارەما کردوە (١٧ ئاب ١٩٣٧)، لە ١٤ئایاری ١٩٣٨ لەفەرمان دەست بەردار دەبێ.. دەیکەنە ئەندام لە ئەنجومەنی ئەعیان (١٩٣٧)، هەلبژێردراوە بە جیگری سەرۆکی ئەنجومەنەکە (٣١ی تەمموز ١٩٣٩)، لە وەزارەتی نوری سەعید وەزیرایەتی مواسەلات و ئەشغالی پێ دراوە ئەیلول ١٩٣٩-٢٢ی شوباتی ١٩٤٠، هەلبژێردراوە بەجیگری سەرەك ئەنجومەنی ئەعیان (٢٧ئازار ١٩٤١)، لە وەزارەتی مەدفەعی پینجەما دەبیتە وەزیری مواسەلات و ئەشغال لە ٢٣ حوزەیران ١٩٤٣ هەتا تشرینی یەکەم ١٩٤١، پاشان لە وەزارەتی حەفتەمی نوری سەعید وەزارەتی دارایی پێ سپیردراوە (٢٣ی حوزەیرانی ١٩٤٣)، لە ٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٣ دەست بەردار دەبێ. بە جیگری یەکەمی ئەنجومەنی ئەعیان هەلدەبژێردرێ (٢ی کانونی یەکەم ١٩٤٤)، هەتا ماوەی کۆتایی بوونی ئەندامیەتی (١٧ تشرینی یەکەم ١٩٤٥) دەیکەنە چاودیرکەری گشتی حسابات (٢٥ی ئەیلول ١٩٤٦)، لەو پایەی دەمینیتەوە هەتا جاریکیتر لە وەزارەتی محەمەد سەدر دەبیتەوە وەزیری مواسەلات و ئەشغال (٢٩ی کانونی دووەم ١٩٤٨)، دوایی لە وەزارەتی مەزاحیم پاچەچی وەزارەتی مواسەلات و ئەشغال بریکاری وەزارەتی کاروباری کۆمەلایەتی پیدراوە. هەر بەوەزیرایەتی مواسەلات و ئەشغال لە وەزارەتی دەیەمینی نوری سەعید دەمینیتەوە (٦ی کانونی دووەم١٩٤٩-١٠ کانونی یەکەم ١٩٤٩)، لە هەمان وەزارەتا بریکاری وەزارەتی دارایی پێ دراوە (٦ی کانونی دووەم ١٩٤٩ هەتا ١٦ ئەو مانگە)، دەیکەنە ئەندامی کارامە لە ئەنجومەنی ئاوەدان کردنەوە

(٥ تشرینی دووەم ١٩٥٠)، تییدا دەبێ هەتا شۆرشی (١٤ی تەمموز١٩٥٨)، دوای ئەوە دەرد و نەخۆشی رووی تیدەکا، لە بەیروت نیشتەجێ دەبێ، لە ٢٢ تشرینی یەکەم ١٩٧٠ کۆچی دوایی دەکا.

## جەمال بابان

کوری رەشید کوری عەبدوللا بەگ کوری خالید پاشا کوری ئەحمەد پاشای بابان زادەیە، سالی ١٨٩٣ لە بەغدا هاتۆتە جیهان، لە کولیەی حقوق دەخوینێ و بروانامەکەی سالی ١٩١٤ لی وەردگریت، لە ٨ی شوباتی ١٩١٤ گۆڤاریکی بە کوردیو تورکی نیومانگی بەناوی"بانگی کورد" دەرکردوە، تەنیا پینج دانەی لی دەرچوو، کە جەنگی گەورە راگەیەندرا دەچیتە کۆری مەشق لە بەغدا (١٩١٤)، بەنائیب زابت ئیحتیات دەرچووە، (١٩١٥) خزمەتی سوپای تورکی لە کۆری فەلاحیەو کوت دا دەکا، بۆ پایەی ملازم بالا دەکرێ (١٩١٦)، پاشان لە شەری (ام الطبول) شەری داگیر کردنی بەغدا بەدیل دەگیرێ. ئازار ١٩١٧ دەگوازریتەوە بۆ گرتوخانەیەك لە هیند، بە پایەی ملازم ئەوەل تیکەل بە سوپای شۆرشی عەرەبی دەبێ لە عەقەبە، لەگەل لەشکری عەرەبی دەبێ کە شام داگیردەکەن.بالا دەکرێ بۆ پایەی "رەئیس" و ئامیریەتی دەستەی تۆپچیەتی پێ دەسپیرن، کە فەرەنسیەکان سوریا داگیردەکەن دەگەریتەوە بەغدا (١٩٢٠)، بەکاری پاریزەری هەلدەستێ، دەیکەنە معاون حاکمی جەزای بەغدا (١٥ تشرینی یەکەم ١٩٢٤)، جا حاکمی صولحی بەغدا (٢٥ ئایار ١٩٢٥)، (حاکمی منفرد) ی سلیمانی (٢٧ ئەیلول١٩٢٥)، حاکمی جەزای موسل (یەکی تشرینی دووەم ١٩٢٦)، کە بە نوینەری هەولیر بۆ ئەنجومەنی نوینەران هەلدەبژیردرێ لە کاری قەزایی دەستبەردار دەبێ (١٣ ئایار ١٩٢٨)، بە نوینەری موسل هەلدەبژیردرێ (١٩٣٠-١٩٣٣)، دیسان لەسەر هەولیر (١٩٣٤-١٩٣٥)، جاریکیتر نوینەری هەولیر لە ئەنجومەنەکەدا (١٩٣٧-١٩٣٩-١٩٤٣)، دەیکەنە وەزیری داد لە وەزارەتی نوری سەعیدی یەکەمدا (٢٣ ئازار ١٩٣٠) ،سەرەرای پایەکەی خۆی بریکاری وەزارەتی ئابوریشی پێ دەسپیرن (١٣ی ئەیلولی ١٩٣٠ - ٩ی تشرینی یەکەم ١٩٣٠)، لە

وەزیرایەتی داد بەردەوام دەبێ لە وەزارەتی دووەمی نوری سەعید (١٩ی تشرینی یەکەم ١٩٣١ – ٣ی تشرینی دووەم ١٩٣٢)، بەوەزیرایەتی داد دەگەریتەوە لە وەزارەتی یەکەمی مەدفەعیدا (٩ی تشرینی دووەم ١٩٣٣) و لە وەزارەتی دووەمەکەشیدا (٢١ی شوبات ١٩٣٤) و لەوەزارەتی ئەیوبی (٢٧ی ئاب ١٩٣٤ – ٣ی ئازار ١٩٣٥)، لە وەزارەتی شەشەمی نوری سەعیددا دەبیت بە وەزیری کاروباری کۆمەلایەتی (٩ی تشرینی یەکەم ١٩٤١ –تشرینی یەکەم ١٩٤٢)، بە نوینەری هەولیر هەلدەبژیردریتەوە (١٩٤٣-١٩٤٦)، پاشان لە وەزارەتی صالح جەبر دەبیتە وەزیری دادو جیکاری وەزیری ئابوری (٢٩ی ئازاری ١٩٤٧)، پاشان بوەتە ئەندام لە ئەنجومەنی ئەعیان (تەموز ١٩٤٧ – ٢٩ی حوزەیران ١٩٥٥)، واز لە بریکاری وەزارەتی ئابوری دینێ (٩ی ئەیلول١٩٤٧)، لە وەزارەتی داد دەمینیتەوە هەتا وەزارت دەکەوێ (٢٧ی کانونی دووەم ١٩٤٨)، کە سالح جەبر لە لەندەن دەبێ جەمال بابان بە ئەرکی بریکاری سەرەك وەزیران هەلدەستێ (١ی کانونیدووەمی ١٩٤٨ – ٢٣ی تشرینی دووەم ١٩٥٥)، بە ئەندامیەتی ئەنجومەنی ئەعیان دەمینیتەوە هەتا ١٤ تەموز ١٩٥٨. جەمال بابان پاریزەریکی ناسراو بوو، لە کانونی دووەمی ١٩٦٥ لە بەیروت کۆچی دوایی دەکا.

## سدیق رەسول قادری

جەنەرالی روسیای (بیضاء) و فەرمانبەریکی بەریوەبەرایەتی عیراقی سدیق رەسول قادر. لە سالی ١٨٩١ لە بەغدا هاتۆتە دنیا، لە ئەستەنبوڵ خویندویەتی، کاتی بەرپا بوونی جەنگە مەزنەکە دەبیتە ئەفسەر لە سوپای تورکیدا، لەبەرەکانی شەری قەفقاس جەنگاوە، بەدیلیەتی دەکەویتە دەست روسەکان، کە شۆرشی بەلشەفی روودەدا (١٩١٧)، خۆی دەخاتە پاڵ ئەو سوپا روسیەی کە بۆ بەگژدا چوونی شیوعیەکان بەسەرکردایەتی جەنەراڵ دینکین و جەنەراڵ رانغل و ئەمیرال کۆشاك پیك هینرابوو، پایەی جەنەرالی پیدراوە نازناوی پاشا بەخۆیەوە دەگرێ، بەرەو حیجاز دەروا، چاوی بە مەلیك حوسین دەکەوێ، فتوایەك بە (تحریم) کردی

شیوعیەت دەردەچویندرێ، دەگەڕیتەوە سیبریا بە مەبەستی ورە بەرزکردنەوەی موسلمانەکانی باشوری روسیا، بەلام بەرەی خۆراگری و بەرگری لە سالی ١٩٢٠ دەروخێ، لایەنگرانی هەلدین و سەرکردایەتیەکەیان پەرتوبلاو دەبێ. قادری دەگەڕیتەوە عیراق، کتیبەکەی لە ژیر ناوی (یاداشتی قادری لە شۆڕشە مەزنەکەی روسی) سالی ١٩٢٤ دەری چواندووە. دەچیتە ناو فەرمان رەوایی حکومەتی عیراق (ئاب ١٩٣١)، دەیکەنە مودیر ناحیە لە هەندێ ناوچەکانی باکوردا، دوایی قایمقام بۆ قەزای شەهربازار دەگوازریتەوە (ئاب ١٩٣٨)، پاشان بۆ سلیمانی (١٩٤١) و چەمچەماڵ (١٩٤٢)، دەکرێ بە جیگری پاریزگاری بەسرە (١٩٤٣)، دوایی قایمقامی زاخۆ (١٩٤٤)، ئینجا قایمقامی ناو کەرکوك (١٩٤٦)، بۆ قەزای رەواندوز دەگوازریتەوە (١٩٥٠)، پاشان بوەتە پشکینەری بەریوەبەرایەتی، دوای ئەوە خانە نشین دەکرێ، کتیبەکەی (مەترسی سوور) کە دژ بە شیوعیەتە سالی ١٩٥٧ بە چاپی گەیاندووە، خزمەتگوزاریەکانی خۆی لە بەگژداچوونی لەشکرەکانی بەلشەفی سالی ١٩١٨ تیدا تۆمار کردوە.

دوای چەند سالیك لە کۆرو مەجلیسی مەحمود سوبحی دەفتەری دیتم: پیریکی پەریشانی پەك کەوتوی دڵ شکاو بوو، بۆی باس کردم: هەر کتیبەکەی (مەترسی سوور)ی دەرچواند شۆڕشی تەموزی ١٩٥٨ی بەسەردا هات، شیوعیەکان تیدا بالا دەست بوون، ئەوەندەی پێی کراوە دانەی کتیبەکانی کۆدەکاتەوە لە ناویان دەبا، لە ترسان خۆی لە مالەوە گۆشەگیر دەکا، هەتا هەلپەو هەلچونیان سنور بەند دەبێ، لەبەسرە نیشتەجێ بووە تاکو سالی ١٩٨١.

## شیخ قادر شیخ سەعید حەفید زادە

شیخ قادر شیخ سەعید بەرزنجی برای شیخ مەحمودی سەرداری شۆڕشگیری کوردە، سالی ١٨٩٥ لە سلیمانی هاتۆتە جیهان. زانیاریەکانی ئاینی لەسەردەستی شیخەکانی شارەکەیدا وەرگرتووە. بەسەرکردەی لەشکری گیان فیداکانی کورد بۆ پشگیری تورکەکان لە شەری دژ بە ئینگلیز لە باشوری عیراق دەچێ (١٩١٥)، سالی

١٩٢٤ بە نوینەری سلیمانی لە ئەنجومەنی دامەزاندن هەڵدەبژێردرێ، پاشان لە تەموزی ١٩٢٥ دەیکەنە ئەندامی ئەنجومەنی (ئەعیان) بەڵام دامەزرانەکەی لەبەر تەمەن نەگەیشتنی یاسایی هەڵدەوەشێ، لە ئازاری ١٩٤٠ بەسەرۆکایەتی (غرفە)ی کشتوکاڵی سلیمانی هەڵدەبژێردرێ. ساڵی ١٩٥٩ کۆچی دوایی دەکات[١٣].

## داود جاف

لە کفری سەرەك عەشیرەتەکانی جافە، داود جاف لە ساڵی ١٨٩٤ لەدایك دەبێ، خۆی بە کشتوکاڵەوە خەریك دەکا، لە ماوەی جەنگی یەکەمی مەزندا بەلایەنگری تورکەکان دژ بە لەشکری رووسی لەسەر سنوری ئێران جەنگاوە، لە ئابی ١٩٣٥ بە نوینەری لیوای کەرکوك هەڵدەبژێردرێ، دووبارە لە حوزەیرانی ١٩٣٩ هەڵدەبژێردریتەوە، هەروەها لە ئەنجومەنی نوینەرایەتی‌یەکانی یەك لە دوای یەك هەتا شۆرشی تەموزی ١٩٥٨ هەڵدەبژێردریتەوە، دوای ئەوە پەنا دەباتە بەر ئێران. لە ئایاری ١٩٦٦ لە تاهران کۆچی دوایی دەکات.

داود جافیکی تر کە (١٩٠٤-١٩٧٤) یەك لەسەرەك خیلەکانی جافە لە هەلەبجە، کوری محەمەد سەعید بەگ کوری عوسمان پاشای جافە.

## ئیسماعیل رەواندوزی

ئیسماعیل بەگ رەواندوزی کوری سەعید کوری عەبدوڵڵا موخلس لە نەوەی رەسول ئاغای برای محەمەد پاشای رەواندوزی ناسراو بە محەمەد پاشای کوێرە، کەمیری رەواندوز بوو، هەتا دەولەتی عوسمانی ساڵی ١٨٣٦ فەرمان رەوایی‌یەکەی لەناو بردووە. ئیسماعیل بەگ ساڵی ١٨٩٥ لە رەواندوز هاتۆتە جیهان، کاربەدەستانی بەریتانی ساڵی ١٩٢٠ لە کاتی بەرپا بونی ئاژاوە لە ناوچە کوردیەکاندا دەیکەنە فەرمان رەوا لەشارەکە خۆیدا. لە تەموزی ١٩٢٥ بە نوینەری

لیوای هەولیر هەلبژیردراوە، لە ئایاری ١٩٢٨سەر لە نویّ هەلدەبژیردریتەوە، لە حوزەیرانی ١٩٣٣ لە ریگای چونەوەیدا بۆ رەواندوز بەغەدر دەکوژریّ.

ئیسماعیل بەگ سالی ١٩٢٧ بەرهەلستی (تەجنیدی ئیجباری) کردووە، بەیان نامەیەکی لە رۆژنامەی (الأوقات البغدادیة)دا بلاودەکاتەوە تیـ یدا دەلیّ: هەندیّ خەلك وادەزانیّ تەنیا شیعە لە تەجنیدی ئیجباری نارازین، بەلام هەروەها کوردەکانیش بەتەواوی سەرپیچی دەکەن و لەگەلّ جەعفەریەکان ریك دەکەون کەوا یاسای تەجنید لەگەلّ بارودۆخی سیاسی و ئاستی ئیستامان ناگونجیّ، ئەو راو بۆچونەش سەراپای کورد بروای پیّیەتی.

## حازم شەمدین ئاغا(١٤)

یوسف پاشا شەمدین ئاغای باوکی حازم بەگ لەسەردەمی خۆیدا سەردارو سەروەری زاخۆ بووە.

حازم بەگ سالی ١٨٩٥ لە زاخۆ هاتۆتە دنیا، لە سالی ١٩٢٥ بەنوینەری موسلّ هەلدەبژیردریّ، سەر لە نویّ هەلدەبژیردریتەوە (١٩٢٨-١٩٣٠)، هەروەها لە دەورەکانی سالانی داهاتودا: لە کانونی یەکەمی ١٩٣٤ هەتا ١٩٤٦ هەلبژاردنەکەی نویّ دەکریتەوە. لە ئازاری ١٩٤٦ دەیکەنە ئەندامی ئەعیان، تییدا دەمینیتەوە هەتا ٢٧ی شوباتی ١٩٥٤، لە وەزارەتی سیّیەمی تۆفیق سویدی دا دەبیتە وەزیری بیّ وەزارەت (٥ی شوبات ١٩٥٠ - ١٦ئەیلول ١٩٥٠).

لە حوزەیرانی ١٩٥٤ لە موسلّ جیهان بەجیّ دیلیّ. مەحفوز محەمەد عومەر لە کتیبەکەیدا (أمارة بهدینان العباسیة) بە پیاویکی مرۆڤانەی ناو بردووە، نازناوی باوکی هەژارانی پیّ داوە. لە بنەمالەی شەمدین ئاغا محەمەد کوری حاجی ئاغای ئامۆزای حازم بەگ ناسرابوو، لەسەردەمی تورکەکاندا سەرەك شارەوانی زاخۆ دەبیّ. لە ئازاری ١٩٢٤ بە نوینەری موسلّ لە ئەنجومەنی دامەزراندندا هەلبدەبژیردریّ، بەلام لە ٢٣ی تەموزی هەمان سالدا بەهۆی رووداوی کەوتنی فرۆکەکەی لە کاتی گەرانەوەی لە موسلەوە بۆ بەغدا گیانی لە دەست داوە.

ئیلیاس زخورا له کتیبه‌که‌یدا (مرآة العصر في تأریخ ورسوم أكابر الرجال بمصر – قاهیره ١٩١٦) ده‌ڵێ: بنه‌ماڵه‌ی شه‌مدین ئاغا له خێزانه کورده ناسراوه‌کانه، هه‌ندێ له کوره‌کانیان بۆ شام و میسر ره‌ویان کردووه، بکباشی مه‌حمود ئه‌فه‌ندی شه‌مدین ئاغا له‌سه‌رده‌می والیه‌تی محه‌مه‌د عه‌لی پاشادا له ئه‌فسه‌رانی سوپای میسر بووه، دوایی محه‌مه‌د ئه‌فه‌ندی له‌و کاته‌ی که ئه‌فسه‌ر ده‌بێ له سوپای تورکی‌دا له‌گه‌ڵ کامیل لوتفی کوره‌که‌ی که ته‌مه‌نی دووسالان ده‌بێ له ١٨٧١ له شامه‌وه ده‌چنه لای مه‌حمود ئه‌فه‌ندی برای له میسر و کامیل لوتفی به‌گ ده‌بیته یه‌ك له‌ناودارو مولکداره گه‌وره‌کانی (فیوم).

## ماجید مسته‌فا

ماجید مسته‌فا مه‌حمود ده‌چیته‌وه سه‌ر خێزانیکی ناسراوی کورد. سالی ١٨٩٦ له سلیمانی هاتۆته جیهان، له قوتابخانه‌ی دواناوه‌ندی عه‌سکه‌ری ده‌خوینێ پاشان به‌ره‌و ئاستانه ده‌که‌ویته رێ، ده‌چیته خویندنگا سوپاییه‌که‌ی، به ملازم سانی ده‌رچووه، وه‌ك ئه‌فسه‌ریك ده‌چیته ناو له‌شکری تورکی، له شه‌ره‌کانی جناق قه‌لعه و فه‌له‌ستین به‌شدارو زامدار ده‌بێ. دوای ئاگر به‌ست ده‌گه‌ریته‌وه به‌غدا، به‌شداری له بزوتنه‌وه نیشتمانییه‌که‌ی کورد کردووه له سلیمانی و یه‌ك له‌سه‌رکرده‌کانی هیزی شیخ مه‌حمود بووه له کاتی یاخی بونه‌که‌یدا (ته‌موز ١٩٢٣)، دوای ئه‌وه بووه به مودیر ناحیه‌ی موفه‌قیه له پاریزگای کوت (١٩٢٧)، بۆ قایمقامی ئامیدی بالا ده‌کرێ (١٩٢٩)، ده‌چیته کفری (١٩٣١)، دووباره ئامیدی (١٩٣٢)، له ئه‌یلولی ١٩٣٤ ده‌یکه‌نه جیکاری پاریزگاری کوت، دوایی ده‌بیته پاریزگاری مونته‌فیك (نیسان ١٩٣٥)، ئینجا عه‌ماره پاشان دیوانیه (١٩٣٦)، هه‌روه‌ها کوت (١٩٣٧) دیسان عه‌ماره (١٩٣٨)، له حوزه‌یرانی ١٩٤١ ده‌گوازریته‌وه به پشکنینه‌ری به‌ریوبه‌رایه‌تی، پاشان له تشرینی یه‌که‌می ئه‌و ساله‌دا ده‌ست به‌رداری ده‌که‌ن، له ٢٥ی کانونی یه‌که‌می ١٩٣٤ له وه‌زاره‌تی هه‌شته‌می نوری سه‌عید دا ده‌بیته وه‌زیری بێ وه‌زارەت هه‌تا ٣ حوزه‌یران ١٩٤٢، له‌نیسانی ١٩٤٤ به نوینه‌ری سلیمانی هه‌لده‌بژیردرێ، ده‌یکه‌نه وه‌زیری

کاروباری کۆمەلایەتی (١٦ ئەیلول ١٩٥٠ – ١٠ تەمموز ١٩٥٢)، بە نوینەری قەزای رانیە هەلدەبژێردرێ (تشرینی دووەم ١٩٥٠)، بەردەوام دەبێ لە وەزیرایەتی کاروباری کۆمەلایەتی‌دا (١٢ تەموز ١٩٥٢)، پاشان وەزارەتی کاروباری کۆمەلایەتی و هەروەها جیکاری وەزارەتی ئابوری وەردەگریت (٢٢ تشرینی دووەم ١٩٥٢)، لە ٢١ کانونی یەکەم ١٩٥٢ دەست بەردار دەبێ. لە کانونی دووەم ١٩٥٣ و حوزەیرانی ١٩٥٤ بە نوینەری سلیمانی هەلدەبژێردریتەوە، بەلام ئەو ئەنجومەنە دەست بەجێ هەلدەوەشێ، جاریکی تر دەیکەنەوە وەزیری کاروباری کۆمەلایەتی (٢٩ کانونی دووەم ١٩٥٣ – ١٧ ئەیلول ١٩٥٣)، پاشان دەکەویتە کاروباری بازرگانیەوە. ماجید مستەفا لە ٢ ئابی ١٩٧٤ لە بەغدا ماڵ ئاوایی لە ژیان دەکات.

## راغب عەبدوللا بەگ

راغب عەبدوللا بەگی عوسمان پاشا زادە لە سەردارانی عەشیرەتەکانی باجەلانە لە خانەقین (سەر بە پاریزگای دیالە)، لە حوزەیرانی ١٩٥٤ بە نوینەری ئەوی هەلدەبژێردرێ. سەرلەنوێ لە ئەیلولی ١٩٥٤ و ئایاری ١٩٥٨ هەلدەبژێردریتەوە . لە کانونی دووەمی ١٩٦٨ لە خانەقین جیهان بەجی دیلێ.

مستەفا پاشا کوری عوسمان پاشا لە ماوەی جەنگی یەکەمی جیهانی دا سەرۆکی عەشیرەتەکانی باجەلان بووە، کە کۆچی دوایی دەکات عەبدوللاّ بەگی برای (باوکی راغب بەگ) جیگای دەگریتەوە، پاشان شەوکەت بەگی کوری (واتا برای راغب بەگ).

## دکتۆر شەوکەت زەهاوی

شەوکەت کوری ئیبراهیم کوری محەمەد فەیزی زەهاوی موفتی بەغدایە، لە پینجی ئازار ١٨٩٦ لە بەغدا هاتۆتە دنیا، لە کۆلیجی پزیشکی حەیدەر پاشا لە ئاستانەدا پاشان لە پاریس دەخوینێ، دەگەریتەوە بەغدا دەیکەنە یاریدەدەری

بەریوەبەری پەیمانگای باسۆلۆجی (١٩٢٢)، دوایی بەریوەبەری پەیمانگاکە (١٩٣٥)، بەریوەی بردووە هەتا تەموزی ١٩٥٨، جگە لە ماوەیەکی کەم کە بوەتە وەزیری کاروباری کۆمەلایەتی (٢٣ نیسان ١٩٤٦ – ٣١ ئایار ١٩٤٦)، پاشان دەیگەریننەوە بۆ بەریوەبەری پەیمانگای باسۆلۆجی (حوزەیران ١٩٤٦)، لە ئایاری ١٩٥٣ دەیکەنە ئوستازی کۆلیجی پزیشکی، دوای شۆرشی ١٤ تەموز ١٩٥٨ لە فەرمان دەست بەردار دەبێ.

کتیبی (الباثلوجي العام) سالی ١٩٦٣ داناوە. ئەحمەد حەسەن زەییاد باسی دەکا دەلێ: پشوی فراوان، بیر تەسك و هۆشمەند، هەوڵ و کۆششی هەمووی بەکارو فەرمانەکەیەوە بەند بوو، چ ئارەزوویکی تری نەبوو، بەشداری چ بیرو رایەکی نەدەکرد تا ئیستا بایەخی بە هیچ رووداویك نەداوە.

دکتۆر شەوکەت لە ژیان دا ماوە لە بەغدایە (کانونی دووەم ١٩٩١).



## ئەحمەد م

**شاعیری کورد ئەحمەد موختار بەگ لە سەرۆکەکانی جافە، کوری عوسمان پاشا کوری محەمەد پاشا کوری کەیخوسرەو بەگە. سالی ١٨٩٦ لە هەلەبجە هاتۆتە جیهان، لەسەر دەستی زاناکانی ئەوێ دەخوێنێ، لەخۆرسکەوە بەهرەی شاعیریەتی هەبووە، شیعری بەدوو زمان کوردی وفارسی هۆنیوەتەوە، لە تەموزی ١٩٢٥ بە نوینەری سلیمانی لە ئەنجومەنی نوینەراندا هەلبژیردراوە، بەلام لە سالی داهاتوودا واز دەهینێ، دووبارە لە تشرینی دووەمی ١٩٣٠ هەلبژیردرایەوە، سالی ١٩٣٣ لە کاتی پەرینەوەی لە زیی سیروانداا دەدریتەبەر گوللەو گیانی لە دەست دەدا. دیوانە شیعریەکەی سالی ١٩٦٠ چاپکراوە و لەبەرهەمە بەجیماوەکانی: چیرۆکی مەسەلەی ویژدان ، چاپی سالی ١٩٧٠.**

**ئەحمەد موختار شۆرە سواریکی ئازا بوو، کوردیکی نیشتمان پەروەر بوو، گەل و ولاتەکەی لا خۆشەویست بوو. محەمەد ئەمین زەکی نمونەیەکی شیعری هیناوەتەوە کە دەلێ:**

لەخەو هەلسن درەنگە میللەتی کورد خەو زەرەرتانە
هەمووتەئریخی عالەم شاهیدی فەزل و هونەرتانە
دەسا تیکۆشن ئەی قەومی نەجیبی بێ کەسی مەزلوم
بە کورتی بیبرن ئەو ریگە دورەی وا لە بەرتانە

**ئەنوەر قادر جاف لە وتاریکیدا رۆژنامەی (التأخي – ١٩٧١/١٢/٢٠) دەلێ: شاعیر لە کۆمەلگایەکی پر زۆرداری کۆمەلایەتی و جەورو ستەمی چینایەتی ژیاوە، ئەو بارە نالەبارە بوو هیزی لیستاندبوو، بەرژەوەندی تایبەتی و ژیانی شادمانی و کامەرانی خۆی خستۆتە لاوە ریزی چینی بەگلەری و دەرەبەگایەتی بنچینەیی خۆی بەجێهیشتووە، چۆتە ریزی گەلەکەی، بە خەبات و شیعرەکانی دەستی بە چارەسەرکردنی کیشەکانی میللەتەکەی کردووە. هانی داون کەیەکگرن و راپەرن لە پیناو ئازادی و سەرفرازیا، لە شیعرەکانی دا رەخنەی لە کۆمەلگا بێ سەروبەرو ناهەموارەکەی گرتووە، ئەو کۆمەلگایەی کەوا دووبەرەکی عەشایەری و خەرافات بالی**

بەسەردا کیشاوە، کەوا بوەتە قوربانی و بەندە گیربوونی ئەو جەورو ستەمە، لە چوار چیوەی زەبرو زەنگی تاریکی ونەریتی کۆنی ئەوسای کۆمەلەی کوردەواری دەی نالاند، بیری پر هەستی نەتەوایەتیەکەی لە داکۆکی بەرگری لە هەژار و چەوساوەکانی تیکرای گەلەکەی رەنگی داوەتەوە. چیرۆکیکی جوانی لە ژیر ناونیشانی (مەسەلەی ویژدان) هەیە. شاعیریکی شۆرشگیر بوو بە هەموو مانای وتەوە، رەفیق حیلمی دەلیٚ: شیعرەکانی ئەحمەد موختار نمونەیەکن لە تەر و پاراوی و ئاوازیی جوان.

ئەنوەر قادر جاف باسی دەکاو دەلیٚ: ئەحمەد موختار پەیوەندیەکی دۆستایەتی بە شیخ مەحمود حەفیدەوە هەبوو، بەلام بەهۆی بوختان و لی دوانی ناحەزانی شیخ حەپسی دەکا.

شاعیر قەسیدەیەکی هەست بزوین و پر ستایش بۆ شیخ مەحمود دەهۆنیتەوە ئیتر بەری دەدا.

## لیوا بەهائەدین نوری

بەهائەدین کوری شیخ نورەدین کوری ئیسماعیل کوری حەسەن بەگ شیروانیە، شیخ نورەدینی باوکی لە زانا ناسراوەکانی ئاینی بووە، سالی ١٨٦٧ لە هەولیر هاتۆتە جیهان و سالی ١٩٤٢ لە بەغدا مالٚ ئاوایی لە ژیان کردووە، لەسەردەمی تورکەکاندا کردیانە بەریوەبەری خویندنگای مامۆستایان لە بەغدا و لە بەسرە ١٩٢٠-١٩٢٦، پاشان بەریوەبەری کولیەی ایمام الأعظم بووە، چەندین کتیبی داناوە لەوانە: خلاصة تأريخ الاسلام، الفلسفة العلمية، الفلسفة الاخلاقية، تأريخ التربية...هتد.

بەهائەدین سالی ١٨٧٩ لە سلیمانی لەدایك بووە، لە خویندنگای عەسکەری لە ئەستەنبۆلٚ بە ئەفسەر دەرچووە، لە مەیدانی عیراق دا جەنگاوە، بەدیلیەتی دەکەویتە دەست سوپای بەریتانی بەسرکردایەتی جەنەرالٚ مۆد، دوای ئەوە دەچیتە ناو سوپای عەرەبی لە حیجاز و سوریادا. لە ١١ ئاب ١٩٢١ دیتە ناو سوپای عیراق، پاش

ئەوە دەیکەنە مامۆستای (خانەی مەشقی سوپایی)، لە کۆتایی سالی ١٩٢٤ دەینیرنە بەریتانیا سالیك لە (ئالدەرشود) مەشق دەکا، پاشان دەچیتە قوتابخانەی چەکە سوکەکان، لە شوباتی ١٩٢٦ دەگەریتەوە عیراق پیشکەوتوی راهینەری رەشاشەکان ئینجا ئەفسەر روکن لە وەزارەتی بەرگریدا، لە کولیەی ئەرکانی عیراق دەخوینێ لیی دەردەچێ، بە پایەی مقدم لیوا بەشداری لە بزوتنەوەکانی سلیمانی و بارزان دەکا، لە تەموزی ١٩٢٨ لەگەڵ تۆفیق سویدی دەچێ بۆ کۆنگرەی جەددە وەك پسپۆریکی سوپایی بۆ وتوویژکردن لەگەڵ عەبدولعەزیز ئالسعود دا، وەفدەکەش بەسەرۆکایەتی سیرجلبرد کالاتین بووە، بەهائەدین نوری سالی ١٩٣١ بروانامەی بەکەلۆریۆسی زانیاری لە کولیەی ویلایەتی کەنساس بەدەست هیناوە، بەکاری دەرس وتنەوە لە کولیەی ئەرکان هەلدەستێ، سالی ١٩٣٥ بەوەفد دەنیردریتە ئینگلتەرە بۆ بەردەوام بوونی خویندن لە کولیەی ئەرکان لە کمبرلی، پاش سالیك دەگەریتەوە، دەبیتە ئەفسەر روکنی یەکەم، ئینجا ئامیر کولیەی ئەرکانی عیراقی (١٩٣٧)، بالا دەکری بۆ پایەی عەمید ئەیلول ١٩٣٨، لە کانونی یەکەمی ١٩٣٨ خانە نشینی دەکەن، خزمەت گوزاریەکەی دەگوازنەوە بۆ سکەی شەمەندەفەر و دەیکەنە جیگری بەریوەبەری گواستنەوە، لە ئابی ١٩٤١ دەگەریتەوە سوپا دەیکەنە ئامیر کولیەی ئەرکان، دوایی یارمەتیدەری سوپا سالاری ئەرکان و بریکاری بەریوەبەرایەتی گشتی لە وەزارەتی بەرگریدا. لە کانونی یەکەم ١٩٤١ بۆ پایەی لیوا بالا دەکرێ، دەگوازریتەوە بۆ سەرکردەی ناوچەی باشور لە بەسرە تشرینی دووەم ١٩٤٢، پاشان لە ئابی ١٩٤٤ لە فەرمان دەست بەردار دەبێ، دەیکەنە پاریزگاری سلیمانی لە ئازاری ١٩٤٧، پاشان لە حوزەیرانی ١٩٤٨ بە نوینەری سلیمانی هەلدەبژیردرێ، دەیکەنە وەزیری کاروباری کۆمەلایەتی ٦ی کانونی دووەم ١٩٤٩ تا ١٠ی کانونی یەکەم ١٩٤٩، پاشان کردیانە وەزیری مفەوەز لە دیوانی وەزارەتی دەرەوە مایس ١٩٥١، دوایی دەبیتە وەزیر مفەوەز لە بالویزخانەی عیراق لە تاهراندا (ئاب ١٩٥١)، پاشان لەوێ بالا دەکرێ بۆ بالویز ئایار ١٩٥٣، لە ئاکامی یەکیتییەکەی عیراق و ئوردن و یەکبونی فەرمانی دبلۆماسیەتی هەردوو دەولەت بەسەفیرایەتی دەگوازریتەوە عەمان کانونی دووەم

١٩٥٦ – تەموز ١٩٥٨، دوایی شۆڕشەکەی ١٩٥٨ لە ئوردن دەمینێتەوە، دەیکەنە سەفیر لە وەزارەتی دەرەوەی ئوردن تا لە ئابی ١٩٥٩ لە پایەکەی دەخەن، دەیکەنە وەزیر مفەوەزی ئوردن لە ڕۆما.

لە نیسانی ١٩٦٠ لە پایتەختی ئیتالیا جیهان بەجێ دیلێ.

بەهائەدین ئەم کتیبانەی لە ئینگلیزیەوە وەرگیراوەتە سەر زمانی عەرەبی (الرتل الخامس ١٩٤٢) رحلة ريج في العراق عام ١٨٢٠ لە سالی ١٩٥١ چاپکراوە، جەنگیزخان ١٩٤٦، حرب الفلسطين، الخطوط الأساسية لحرب العراق (١٩٣٥)، هەروەها (كيف تعالت بروسية) هی ئەحمەد ڕەفیق (١٩٣٤)، بەهائەدین نوری کتیبی سوپایشی داناوەو وەریگیراوە لەوانە: أوامر الحركات (١٩٢٨)، تعبيئة الرشاشات (١٩٢٩)، رتل باز في حركات بارزان (١٩٣٢)، مسائل في تعبيئة الخيالة (١٩٣٠)، نقاط في تدريب التعبيئة الصغرى (١٩٣٠) ...هتد. خالید دورە دەلێ: بەهائەدین نوری پەروەردە ئایینیەکەی و گەنجایەتی بەغدای لی کۆببۆوە، ئەفسەر روکنیکی بە تواناو ڕۆشنبیریکی بەرفراوان بوو، ئەحمەد حامید سەراف بۆی باس کردم کەوا بەهائەدین لە زمانی تورکی ئەدیب بووەو شیعری ناسکی هۆنیوەتەوە. هەروەها عەبدولعەزیز موزەفەر پێی گوتم کە: بەهائەدین نوری سالی ١٩٢٤ دەچیتە ئینگلتەرە بۆ بەشداری کردن لە دەورەیەکی سوپایی، بەپیی ئەوەی کە ئاین پەروەریکە دەپرسێ لە مزگەوتیك کە لە لەندەن نویژی لێ بکات پییان گوتبو مزگەوتیك لە شاری (ووکینگ) هەیە ٢٤ میل لە باشوری ڕۆژهەلاتی پایتەختە، ڕۆژی هەینی سواری شەمەندەفەر دەبێ بەرەو ئەو شارە دەکەویتە ڕێ، نیوەڕۆ دەچیتە مزگەوتەکە سەیر دەکا دەرگاکە کلیل دراوە، کە زەنگەکە لیدەدا بە زەحمەت پیاویکی پیری سەرو سیما هیندی عەمامە بەسەری لیدیتە دەرو پیی دەلێ: ئایا ئەوە مزگەوت نیە! ئیمرۆ هەینی یەو کاتی نویژ هاتووە کوا نویژکەرەکان؟ پیاوە پیرەکە داوای لیبوردنی لی دەکا دەلێ ژمارەی موسلمانەکان کەمە ئەوان ڕۆژی جومعەکار دەکەن، ئەگەر ڕۆژی یەك شەم بییت کە لەم ولاتەدا پشودانە دەتوانی بەشداری نویژی جومعە بکەیت. بەهائەدین نوری نیوەڕۆی یەك شەممە دیتەوە شاری (ووکینگ) کە چی دیسان دەرگاکە

داخراوە، زەنگەکە لی دەدا کابرا لی ی دیتەدەرو بەسەر سورماوی پێ ی دەلێ: ها کورە لاوەکە ئەوە تۆی هاتیەوە!! دەلێ بەلێ بەلام کوا نویژ کەرەکان؟ دەلێ: پەلە مەکە تۆ لە ولاتی موسلمانان نی لە وولاتی کافرانی لیرە نویژ عەسران دادەبەسترێ، سەعات چوار وەرەوە، نویژ بکەو پاشان چا بخۆرەوە! بەهائەدین نوری لە سەعاتی دیاری کراودا دەچیتەوە دەبینێ دەرگای مزگەوتەکە کراوەتەوە، لەگەل چەند کەسانیکی هیندی بەشداری نویژ دەکا و چاش دەخواتەوە.

ئەو چیرۆکەم بۆ تۆفیق وەهبی گیرایەوە پیکەنی و گوتی: بەهائەدین نوری بەدینەو نویژ لە لەندەن دەکات؟! شیخ نوری باوکی گلەیی لای من لی دەکرد کەوا کەم تەرخەمی لە کاروباری ئاینی دەکات!!

وەك زانراوە مزگەوتی ووکینگ دەگەریتەوە بۆ تیپی ئەحمەدیەی ناسراو بە (قادیانیە) کە میرزا غولام ئەحمەدی شاری قادیان سەربە بنجابی هیندی سالی ١٨٧٩ دروستی کردووە، وای راگەیاندووە گوایە مەهدی و مەسیح لە شەخسی ئەودا کۆبونەتەوە، راستە مەسیح (صلب) کراوە بەلام بە زیندویی دایان بەزاندوەو حۆریەکانی هینایتیانە کشمیر، لەوێ ژیاوە تاکو لە گوندی سرینجار دەمرێ و دەنیژرێ.

## سەیفوللا خەندان

سەیفوللا بەگ خەندان دەچیتەوە سەر خیزانیکی ناسراوی سلیمانی، دایکی لە بنەمالەی بابانە، عیزەت بەگی باوکی کوری حوسین پاشایە کە وەزیر دەبێ لەسەردەمی سولتان محەمەد وەحیدەدینی شەشەم، بەلام سەعید پاشای مامی ناسراو بە (کوردی) لە (ئەساطین) سەردەمی حەمیدی بووە.

سەیفوللا بەگ سالی ١٨٩٧ لە ئاستانە هاتۆتە دنیا لە قوتابخانەی غلطت سرای خویندویەتی سالی ١٩٢٣ هاتۆتە عیراق، لە ئایاری ١٩٢٨ بە نوینەری سلیمانی هەلبژیردراوە، لە کانونی یەکەمی ١٩٣٣ دەبیتە جیکاری شەریکەی کارەبای بەغدای بەریتانی، سەر لە نوێ لە تشرینی دووەمی ١٩٣٠ و شوباتی ١٩٣٣ و کانونی یەکەم

١٩٣٤ و ئابی ١٩٣٥ به نوینەرایەتی هەلدەبژێردریتەوە، پاشان دەیکەنە یاریدەدەری نیردراوی عیراق لە (عصبة الأمم) ئاب ١٩٣٧-١٩٣٨، جاریکی تر لە حوزەیرانی ١٩٣٩ بە نوینەری سلیمانی هەلدەبژێردریتەوە، دەبیتە بەریوەبەری تەشریفات لە وەزارەتی دەرەوە (١٩٤١)، دوایی دەبیتە قونسل لە ئەستەنبۆڵ (تشرینی دووەم ١٩٤١) پاشان سکرتیری یەکەم لە موفەوەزیەتی عیراق لە واشنتۆن (نیسان ١٩٤٢) دەگوازریتەوە بەراویژکار لەموفەوەزیەتی عیراق لە لەندەن (حوزەیران ١٩٤٦)، پاشان بە ئەرکی موفەوەزی عیراق لە پاریس هەلساوە (تشرینی یەکەم ١٩٤٧)، کە مەزاحیم پاچەچی دەبیتە سەرەك وەزیران لە پایەکەی دەخا (١٩٤٨)، ئەمەش بەهەلیك دەزانێ کەوا خویندنی بالای تەواو بکا، بروانامەی دکتۆرای لە (علوم سیاسە) لە جامیعەی پاریس سالی ١٩٥١ بەدەست هیناوە، باسی دکتۆراکەشی لەسەر (کیشەی قوبرس) دەبێ، پاشان دەیگەریننەوە سەر فرمان، دەیکەنە بەریوەبەری گشتی تەشریفات لە وەزارەتی دەرەوە (کانونی یەکەم ١٩٤٩)، دوایی ئەوە بۆ پلەی وەزیر مفەوەز بالاّ دەکریّ (١٩٥٢)، دەبیتە وەزیری مفەوەزی عیراق لە بۆن (ئەیلول ١٩٥٣)، پاشان سەفیر لە مەدرید (تشرینی یەکەم ١٩٥٦ - ئاب ١٩٥٨)، لە فەرمان دەست بەرداری دەکەن. دوای ئەوە دەکەویتە کاروباری ئابوریەوە، لە ئاکامی رووداوی ئۆتۆمبیل خۆی و ژنەکەی لە شاری ڤیننا سالی ١٩٧١ گیانیان لەدەست داوە.

## محەمەد عەتا ئەمین

لە سیاسەتمەدارانی لیهاتوو محەمەد عەتا کوری محەمەد ئەمین ئەعزەمی لە پانزدەی کانونی یەکەمی ١٨٩٧ لە بەغدا لە دایك بووە، لەسەردەمی عوسمانیەکاندا لە قوتابخانەی سولتانیە دەخوینێ، لەسەر ئەنجامی داگیرکردنی ئینگلیزەکان دەچیتە دەورەی مامۆستایان لە بەریوەبەرایەتی پەروەردە، دەکریّ بە مامۆستای خانەی مامۆستایان و قوتابخانەی فەرمانبەران (تشرینی یەکەم ١٩١٧)، پاشان دەگوازریتەوە بە سکرتیری بەریوەبەری پەروەردە (١٩١٩)، دوایی وەرگیر لە بەریوەبەرایەتی عەدلیە (١٩٢٠)، پاشان نووسەر لە دیوانی پاشایەتیدا (١٩٢١)، ئینجا یاریدەدەری سکرتیر

له دیوانی ناوبراودا (١٩٢٢-١٩٢٥)، لەو ماوەیەشدا له خویندنگای حقوق دەخوینێ، سالی ١٩٢٣ لێی دەرچووه، له تافی لاویەتیەوه به ئەدیب و نووسەر ناسراوه، وتار و لیکۆلینەوەو چیرۆکی له رۆژنامەو گۆڤارەکانی عیراقی دا بلاو کردۆتەوه به تایبەتی له گۆڤاری (دار السلام) و رۆژنامەی (العراق)، لەوانه (کیف یرتقي العراق، رؤیا صادقة) له (دار السلام) بلاوکراوەتەوه (١٩١٩)، لوحة من الواح الدهر -دار السلام ١٩٢٠، عاقبة الحیاة - دار السلام، وقفة علی دیالة - جریدة العراق ١٩٢١، هەروەها نامەیەکی لەسەر (السلم الدولي العام ١٩٢٣)،. پاشان وتارەکانی له گۆڤاری (حریة)دا نووسیوه (١٩٢٤-١٩٢٦).

هەر له سەرەتای دامەزراندنییەوه دەچیته فرمانی دبلۆماسیەتی عیراق دەیکەنه سکرتیری نوینەری سیاسی عیراق له لەندەن (٢٧ حوزەیران ١٩٢٥)، به (مدەون) قانونی بۆ وەزارەتی داد دەگوازریتەوه (١٩٢٧)، دوایی دەیگەریننەوه به سکرتیر له موفەوەزیەتی عیراق له لەندەن (ئازار ١٩٢٨)، پاشان لەئەنقەره (ئازار ١٩٣٠) جاریکی تر له لەندەن (ئاب ١٩٣٢)، له کۆتایی کانونی یەکەمی ١٩٣٢ له فەرمانەکانی دەست بەرداری دەکەن.

خوازبینی ئەمیره (ساره) کچی حوسین مەلیکی حیجاز واتا خوشکی ئەمیر زەیدی کردووه، دەیگەریننەوه دەیکەنه سکرتیری یەکەم له موفەوەزیەتی عیراق له رۆما(تشرینی دووەم ١٩٣٤)، ئینجا راویژکارو کارگیری موفەوەزیەتی عیراق له لەندەن (١٩٣٥)، دەگوازریتەوه به راویژکارو کارگیر له موفەوەزیەتی پاریس دا (ئازار١٩٣٨)، دوایی لەبەرلین (ئازار ١٩٣٩)، جاریکی تر رۆما(تەموز ١٩٣٩)، دوایی راویژکاری یەکەم و کارگیری موفەوەزیەتی عیراق له لەندەن (حوزەیران ١٩٤٠)، دەگەریتەوه بەغدا دەیکەنه بەریوەبەری گشتی وەزارەتی دەرەوه (تشرینی دووەم ١٩٣٤)، پاشان دەبیته وەزیری موفەوەز له ئەنقەره (ئاب ١٩٤٤)، دوایی وەزیری موفەوەز له پاریس (نیسان ١٩٤٩)، دەست بەردار دەبێ له کاروبارو فرمانی دەرەوەدا (تەموز١٩٥٢)، دەیکەنه بەریوەبەری گشتی له بەرژەوەندی پالاوتنی نەوتی میری، دوایی سەرۆکی ئەنجومەنی بەریوەبردنی بەرژەوەندیەکە

(ئەیلول ١٩٥٥). هەتا تەموزی ١٩٥٨، دوای ئەوە شاری جنیڤ لە سویسرا دەکاتە هەوار و هەر لەویش لە ٢٥ ئەیلول ١٩٧١ کۆچی دوایی دەکات، لە گۆرستانی ئیمامی ئەعزەم دەنیژرێ.

هەلبژاردەی چیرۆکەکانی لە کتیبیکدا بەناوی (قصاصون من العراق)وەزارەتی راگەیاندن سالی ١٩٧٧ بلاوی کردۆتەوە.

سامی خوندە پێی راگەیاندم: لەماوەی جەنگی یەکەمی مەزندا لەگەل عەتا ئەمین هاورێی دەبن لە قوتابخانەی سولتانیە، ئەو محەمەد عەتایە کوری محەمەد ئەمین کوری حوسین ئەفەندی پشدەریە. تۆفیق وەهبی دەلێ: جارێ عەتا ئەمین پێی گوتم کەوا بنچینەی بنەمالەکەی لە عەشیرەتی پشدەری کوردە، عەباس عەزاوی لە کتیبەکەیدا (عشائر لعراق) لە بەشی دووەمدا (العشائر الکردیە) دا دەلێ: حوسین ئەفەندی پشدەری باپیری عەتا ئەمینە، ئەمرۆ عەشیرەتی پشدەر لە بەهیزترین عەشیرەتەکانی کورد دەژمیردرێ، زۆر زانای بلیمەتیان لی پەیدا بووە لەوانە: حوسین ئەفەندی کۆچ کردووی ١١ کانونی یەکەمی ١٩٠٤ لە مامۆستایانی مەدرەسەی ئیمامی ئەعزەم بووە لە بەغدا.

## ئەحمەد تۆفیق

ئەحمەد تۆفیق کوری تۆفیق بەگ کوری محەمەد سالح بەگ کوری سلیمان بەگ لە ئەشرافەکانی سلیمانیە، دایکی لە خانەوادەی سەرۆکەکانی پشدەرە، سالی ١٨٩٩ لە سلیمانی هاتۆتە جیهان، لەسەردەستی مامۆستایانی تایبەتی لە موسل و کەرکوك و سلیمانی خویندویەتی، چۆتە خویندنگای دواناوەندی، کە جەنگە مەزنەکە بەرپا دەبێ تۆفیق بەگی باوکی بەسەرکردەیی عەشیرەتەکانی کورد لە تەك سوپای تورکی دا لە تەوریزو مهابادو بۆکان جەنگاوە، لەشەرو پیکدادانی لەگەل روسیادا دەکوژرێ. دوای جەنگەکە ئەحمەد بەگ هەلویستیکی باشی دەربارەی مانەوەی ویلایەتی موسل و سلیمانیشی لەگەلدا پێ نواندووە کەوا بەشیکە لە عیراق و جیا ناکریتەوە. سالی ١٩٢٤ هەلبژیردرا بە نوینەری سلیمانی لە ئەنجومەنی دامەزراندندا. پاشان دەیکەنە

پاریزگـاری سـلیمانی (ئـازار ١٩٢٥)، لـە نیسـانی ١٩٢٧ واز دەهێنـێ. جـارێکی تـر دەیکەنەوە پاریزگاری شارەکە (ئەیلول ١٩٣٠)، بۆ پاریزگاری هـەولێر دەگوازرێتـەوە (نیسـان ١٩٣٥)، پاشـان دەبێتـە موفەتیشـی ئیـداری (١٩٣٩)، هـەر لـەم سـاڵەدا لـە تشرینی دووەم لـە فـەرمان دەست بەردار دەبێ. بە نوێنـەری سلیمانی بـۆ پەرلـەمان هـەڵدەبژێردرێ (تشرینی یەکەم ١٩٤٣)، بەڵام لـە کۆتـایی تشـرینی دووەمـی هـەمان ساڵدا واز دەهێنێ. لە حەوتی کانونی یەکەم ١٩٦٣ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

## عەلی کەمال عەبدورەحمان

عەلی کەمال لە ٢٩ تشرینی یەکـەم ١٩٠٠ لـە بنەماڵەیەکی ناسـراودا لـە سلیمانی هاتۆتـە جیـهان، عـەبدورەحمانی بـاوکی لـە ئاکـامی پیکرانـی بـە گوللەیـەك گیـانی لەدەست داوە، کە ئەوسا عەلی کەمال منداڵیکی ساوای تەمەن دوو ساڵ و نیو دەبێ، دایکی پەروەردەی دەکا دەیخاتە قوتابخانەوە، ساڵی ١٩١٤ رووەدەکاتە بەغدا، دەچێتە خوێندنگـای دوانـاوەندی سـوپایی، دوای دوو سـاڵ بـەرەو ئاسـتانە دەروا، دەچێتـە قوتابخانـەی جـەنگی، سـاڵی ١٩١٨ بـە ملازمـی دووەم دەردەچـێ، بـە مامۆسـتایەتی قوتابخانەی تازە ئەفسەران لە ناوچەی ئەستەنبۆڵ دادەمـەزرێ. پیش ئاگر بەست بۆ ئەزمیر دەگوازرێتەوە. لە ئایاری ١٩١٩ سوپای یۆنانی ئەو شارە داگیر دەکا، مستەفا کـەمال (ئـەتاتورك) سـەرداری سـوپای رزگـاری بـۆ داکۆکـی و بـەرگری لـە شـاری ئەستەنبۆڵ رادەپەرێ، عەلی کەمال لە خۆیەوە دەچێ بەشداری لە شەری سەربەخۆیی بـوون دەکـا. دوای ئـەوە بـۆ دیاربـەکر و مـاردین دەگوازرێتـەوە، لـە شـوباتی ١٩٢٢ دەگەرێتـەوە بەغدا، دەچێتـە ناو فرمانی پۆلیسی، دەیکەنـە معـاون لـە هـەولێر و بـۆ کۆیسنجاق دەگوازرێتەوە، ئینجا بۆ دیوانیـە (کۆتایی ساڵی ١٩٢٣)، لەوێ بەشداری لە هەڵمـەتی تـەمبێ کردنـی عەشیرەتە یاخی بووەکان دەکا، دوای ئەوە بۆ سلیمانی دەگوازرێتەوە، پاشان دەیکەنە بەرێوەبەری پۆلیسی دیالە (نیسان ١٩٣١)، دوایی هی بـەغدا (حوزەیـران ١٩٣٢)، ئینجـا کـەرکوك (کـانونی دووەم ١٩٣٤)، پاشـان دەگوازرێتـەوە بـۆ بەرێوەبـەری پۆلیسـی بادیـەی باشـور، دوایـی پشـتگیری کردنـی

بزوتنەوەکانی سوپا بۆ ئاسایی کردنەوەی شاری (سوق الشیوخ) پێ دەسپێرن، هەر لەو قەزایەشدا دەیکەنە قایمقام (١٩٣٥)، زۆری پێ ناچێ واز لە بەڕیوبەرایەتی دینێ، لە ئابی ١٩٣٥ بە نوینەری سلیمانی هەلدەبژێردرێ، دووبارە هەر لەم شارەدا لە حوزەیرانی ١٩٤٨ هەلدەبژێردریتەوە، لەهەمان کاتدا خۆی خەریکی کاروباری ئابوری کردووە، بەشداری لە هەموو هەولوکاریکی خێرخوازی دا کردووە، خویندکارە ئاینیەکانی لەسەر کیسەی خۆی بۆ خویندن دەناردە ئەزهەر لە میسر، چاودیری و یارمەتی مزگەوت و هەتیوخانە و بنکە تەندروستیەکانی دەکرد. دوای شۆرشی چواردەی تەموزی ١٩٥٨ ماوەیەك دەگیرێ و بەندی دەکەن، پاش ئەوە روو دەکاتە لەندەن و لەی نیشتە جێ دەبێ[١٥].

## سەعید بەگ میری شیخان

سەرۆکی یەزیدیەکان سەعید بەگ ناسراو بە ئەمیری شیخان، نیشتەجیکەی لە باعوزری نزیك مەزاری شیخ عەدیە، ئەو کوری عەلی بەگ کوری حوسین بەگ کوری عەلی بەگی گەورە کوری حەسەن بەگە، بنەچەکەی دەگەریتەوە بۆ عودەی کوری سەخر (ئەو کوری برای عودەی کوری موسافیر هەکاریەکە سالی ١١٦٢ کۆچی دوایی کردووە) لە شیخەکانی تەسەوف بووە، باپیری ئەو بنەمالەیە عەلی بەگی گەورە بەناوبانگ بوو، سالی ١٨٣٢ لە زارگەلی نزیك رەواندوز دەکوژرێ و هەر بەناوی ئەویش ناونراوە (گەلی عەلی بەگ).

سەعید بەگ سالی ١٩٠١ لە دایك بووە، باوکی سالی ١٩١٣ لە زارگەلی دەکوژرێ، دایکی میان خاتون کچی عەبدی بەگ جلەوی کاروبار دەگریتە دەست، ژنیکی ژیرو مشورگیر بووە، لە سەردەمی داگیرکردنی ئینگلیزدا سەعید بەگ لە تەمەنیکی هەرزەکاری دا دەبێ، بە ئەرکی سەرۆکایەتی هەلدەستێ، سالی ١٩٢١ ئامادەی ئاهەنگی دانانی مەلیك فەیسەڵ لەسەر عەرش دەبێ لە بەغدا. پاشان لە سەرۆکایەتیەکەیدا ئیسماعیل بەگ کوری عەبدی بەگی ئامۆزای کیشەی لەگەل یا بوو

**دوایی پیکهاتونەتەوە، سەعید بەگ لە ئایاری ١٩٤١ لایەنگری رەشید عالی دەبێ داوا لە کۆمەلەکەی دەکا بچنە ناولەشکری عیراق و بەگژداچوونی ئینگلیز .**

**سەعید بەگ سالی ١٩٤٢ کۆچی دوایی دەکا، تەحسین بەگی کوری کە ئەوسا مندال دەبێ جیگای لە ئیمارەتەکەدا دەگریتەوە، سالی ١٩٣٠ هاتۆتە دنیا، دووبارە خاتومیان خاتونی نەنکی دەگەریتەوە سەر هەلسورانی کاروباری هۆزەکەی، هەتا تەحسین بەگ پێ دەگا.**

**پاش شۆرشی چواردەی تەموز ١٩٥٨ سەرۆکایەتیەکە دەدریتە معاویەی ئەمەوی کوری ئیسماعیل بەگ کە پیشتر باسمان کرد،پاشان بۆ بایەزیدی برای، کە بایەزیدی سەرۆکی ئیسماعیلیەکان سالی ١٩٨١ دەمرێ، نیاز دیتە سەر ئەوەی کە داوا لە تەحسین بەگ بکرێ سەر لەنوێ کاروباری ئیمارەتەکە بگریتەوە دەست، کەماوەیەکی زۆر جێنشینی لەندەن بووە. هەروەها لەسەرداره ناسراوەکانی تریان لەم سەردەمەدا: شیخ ئیلیاس سەرەك عەشیرەتی هەکاری کوری شیخ خدر کوری حەسەنە. عەباس عەزاوی لە کتیبەکەیدا (تاریخ الیزیدیة)_١٩٣٥، باسی دەکا دەلێ:زۆرترین زانیاریەکانی لە ئەو وەرگرتووە – واتا لە شیخ ئیلیاس – خویندن و نوسین هەر لە چوارچیوەی بنەمالەکەی ئەودا بەندە گیرە.**

**مستەفا عەلی (وەزیری داد لەسەردەمی عەبدولکەریم قاسمدا) پیی راگەیاندم: کەوا شیخ ئیلیاسی ناسیوە چاوی پێکەوتوە دەلێ: پیاویکی ئاسۆ فراوان و ئارەزومەندی رۆشنبیر بوونی هۆزەکەی بووە، حەزی بە تیکەلی و پەیوەندارییەتی لەگەل میللەتانی تردا کردووە، بەلام ئیسماعیل بەگ کوری عوبید بەگ کە کیشەی لەگەل سەعید بەگی ئامۆزای لە سەرۆکایەتی دا هەبوو دوای داگیرکردنی بەغدا پەیوەندی بە سوپای ئینگلیزەوە دەکا کە ئەوسا لە نزیك سامەرا هەلیان دابوو، ئەشکەنجەو داپلۆسینی تورکەکانی پێ رادەگەیەنێ، دوای یارمەتییان بۆ نەتەوەکەی لێ دەکا، زانیاریەکی فرە دیاردەی بنچینەکەیان دەداتە دکتۆر قوستەنتین کە پشتی بۆ دانانی کتیبەکەی پێ بەستووە (الیزیدیة قدیما و حدیثا) داوا لە ئیسماعیل بەگ**

دەکرێ لە بەغدا نیشتەجێ بێ پاشان لە موسڵ، دوایی ریی پێ دەدرێ بچیتە سنجار، لە تەموزی ١٩٣٣ جیهان بە جێ دیلێ.

یەزیدیەکان لە میژوویاندا دووچاری مەینەتیەکی گەورە بوون لەسەر دەستی عومەر وەهبی پاشا سەرکردەی هیزی چاکسازی تورکی، کە سالی ١٨٩٢ دیتە موسڵ داوا لە پیاوەکانیان دەکا لە سەروی هەمویانەوە میرەکەیان میرزا بەگ کە دەبێ واز لە بیرو باوەری خۆیان بینن، بگەرینەوە سەر ئاینی ئیسلام، ئیتر بەربادیان دەکا. سەربازکانی دەنیریتە سەر گوندەکانی شیخان تالانی دەکەن ئەوەی پیاوە دەیکوژن و پرکیشی ئافرەت و مندالەکانیان دەکەن، دوای ئەوە روو دەکەنە گوندەکانی سنجار، هەمان رەفتار لەگەڵ ئەوانیشدا دووبارە دەکەنەوە، شکات و سکالای ئەو کارە درندانەیە دەگاتە ئەستەنبۆڵ ولاتانی بیگانە دینە دەنگ، فەریق وەهبی پاشا لێ دەخەن.

میسس کرترۆدبیڵ لە سالی ١٩٠٩ سەردانی ناوچەکانی کوردستان دەکات، چاوی بە عەلی بەگ ئەمیری یەزیدیەکان دەکەوێ، قاوەی لا دەخواتەوە، پێی دەلێ: کۆمەلەکەت لە چیا پییان راگەیاندم کەوا تۆ (حاکمی گشتیانی) زۆر بە ناسکی وەلامی دەداتەوە دەلێ (حاکمی هەموومان هەر ئەو خودایەیە) باسی دەکا کە: پیاویکە لە ناوەراستی تەمەن دایە، سەر و سیما و روخسار هیمن و لەسەرخۆ، ردینیکی دریژی خەنەیی پیچ پیچی هەتا کەمەری شۆرببۆوە، جلوبەرگیکی سپی پۆشیبوو، لەسەریەوە هەتا دامینی هاتبوو.

## غیاث الدین نەقشبەندی

شیخ غیاث الدین کوری هەرە گەورەی شیخ بەهائەدین نەقشبەندی کوری محەمەد کوری تاهیر کوری مەلا سافی مورشید و رابەری ئامیدی و بامەرنی و دەوروبەرەکەیەتی. شیخ غیاث الدین سالی ١٩٠٠ هاتۆتە دنیا. ریبازی سۆفیەتی لە باوکی وەردەگرێ، لەسەر دەستی زاناکانی ناوچەکەیدا وەك: موفتی ئامیدی و شوری ئەفەندی دەخوینێ.

لە تشرینی دووەمی ١٩٣٠ بە نوینەری موسڵ هەڵدەبژێردرێ، دوای ئەوە لە ئابی ١٩٣٥، کانونی یەکەمی ١٩٣٧ و تشرینی یەکەمی ١٩٤٢ هەلدەبژیردریتەوە. لە سالی ١٩٤٤ لە ئامیدی کۆچی دوایی دەکات.

موسلح الدین نەقشبەندی برای، ناودار بوو، سالی ١٩٢٠ لە ئامیدی هاتۆتە دنیا، لە کۆلیجی یاسا دەرچووە (١٩٤٣)، دەچیتە کاروباری دادوەری، دەیکەنە نائیب حاکم دوایی دەبیتەحاکم ، لە سالی ١٩٥٣ بە نوینەری موسڵ هەڵدەبژێردرێ، سەرلە نوێ ١٩٥٤ و نیسانی ١٩٥٨ هەلدەبژیردریتەوە، دەگەریتەوە سەرکاری دادوەری، دەبیتە حاکمی بەدائەی کەرادە، موسلح نەقشبەندی لە وەزارەتی تاهیر یەحیا دەبیتە وەزیری دەولەت بۆ کاروباری ئەوقاف (٢٠ تشرینی دووەم ١٩٦٣)، دوایی وەزیری ئەوقاف (یەکی نیسان ١٩٦٤)، سەرەرای پایەکەی دووبارە دەیکەنەوە وەزیری دەولەت (١١ کانونی یەکەم ١٩٦٥)، جیکاری وەزیری پیشەسازی (١٧ نیسان ١٩٦٦ – ١٨ نیسان ١٩٦٦). جاریکی تر وەزارەتی دادی پێ دەدریتەوە (٩ ئاب ١٩٦٦)، بەئەرکی خۆی لە وەزارەتەکانی یەك لە دوای یەك هەلساوە هەتا ٣٠ی تەموز ١٩٦٨.

لە سالی ١٩٩٦ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

## ئەحمەد موختار بابان

ئەحمەد بەگ کوری حەسەن بەگە دایکی لە بنەمالەی بابانە، سالی ١٩٠٠ لە بەغدا هاتۆتە دنیا، بروانامەی یاسای بەدەست هیناوە، خزمەتگوزاری لە پیشەی دادوەری و بەریوەبەرایەتی دا کردووە. سالی ١٩٤٢ بوەتە وەزیری کاروباری کۆمەلایەتی، پاشان بە پایەی وەزیرایەتی مواسەلات و ئەشغال، وەزیری داد، سەرەك دیوانی پادشایی، جیگری سەرەك وەزیرانی پێ دراوە، دوای ئەوەی کە دەبیتە وەزیری بەرگری و بریکاری وەزیری پەروەردە لە ١٩ ئایاری ١٩٥٨، دەبیتە سەرەك وەزیران کەوا دوا سەرەك وەزیران بووە لە پیش بەرپا بوونی شۆرشی ١٤ تەموزی

١٩٥٨. له ٢٤ تشرینی یەکەم سالی ١٩٧٦ له بۆن پایتەختی ئەلمانیای یەکگرتوو کۆچی دوایی دەکات.

## محەمەد سەعید قەزاز[١٦]

محەمەد سەعید قەزاز سالی ١٩٠٤ له سلیمانی هاتۆتە جیهان، مندالیکی ساوا دەبێ کە باوکی کۆچی دوایی دەکات، لە خویندنگەی دواناوەندی سالی ١٩١٧ دەرچووە، لە ٢٠ تەموزی ١٩٢٤ بە نوسەر (کاتب) لە بەشی پشکنینەری بەریوەبەرایەتی وەزارەتی ناوخۆ دادەمەزرێ. پاشان بوەتە بەریوەبەری (تەحریرات) لە پاریزگای هەولیر (١٩٣٢)، دوایی لە کەرکوك.. دەیکەنە مودیر ناحیەی تکریت (١٩٣٩)، دوای ئەوە پێبەپێ پلەو پایەی بەریوەبەرایەتییەکانی بینیوە، مودیر ناحیەی شەقلاوە (١٩٣٥)، قایمقامی هەلەبجە (١٩٣٨)، دوایی زاخۆ (١٩٣٩)، لە تەموزی ١٩٤١ بوەتە یاریدەدەری بەریوبەری گشتی ناوخۆ، پاشان پاریزگاری لیوای هەولیر (ئەیلول ١٩٤٤)، پاشان پشکنینەری بەریوەبەرایەتی (١٩٤٦)، دوایی پاریزگاری لیوای کوت (ئەیلول ١٩٤٦)، ئینجا کەرکوك (کانونی دووەم ١٩٤٨)، دوایی موسڵ (حوزەیران ١٩٤٦)، پاشان وەزارەتی کاروباری کۆمەلایەتی پێ دەسپیرن (٢١ کانونی یەکەم ١٩٥٢ – ٢٩ کانونی دووەم ١٩٥٣)، دوای ئەوە دەبیتە بەریوەبەری گشتی بەندەرەکان لە بەسرە (١٥شوبات ١٩٥٣) بەلام لە شەشی نیسانی ١٩٥٣ واز دەهینێ، دیسان دەیکەنەوە بەریوەبەری گشتی بەندەرەکان (حوزەیران ١٩٥٣)، دوایی وەزیری ناوخۆ (١٩ی ئەیلول ١٩٥٣) پایەکەی خۆی لە وەزارەتی فاضل جەمالی دا پاراستوە (٨ی ئازار ١٩٥٤)، هەروەها لە وەزارەتی دووەمی ئەرشەد عومەری (٢٩ی نیسانی ١٩٥٤ – ١٤ی حوزەیرانی ١٩٥٤)، خۆی دەست بەردار دەکا. بە نوینەری کەرکوك هەلدەبژیردرێ (تشرینی یەکەم ١٩٥٣)، سلیمانی (ئەیلول ١٩٥٤) و (نیسانی ١٩٥٨). لە وەزارەتی دوازدەمینی نوری سەعید دا دەیکەنە وەزیری ناوخۆ (٣ی ئاب ١٩٥٤)، لە پایەکەی خۆی لەوەزارەتی سیزدەمی نوری سەعیدا دەمینیتەوە (١٧ کانونی یەکەم ١٩٥٥ – ٢٠ حوزەیرانی ١٩٥٧)، دیسان لە وەزارەتی

چواردەمینی نوری سەعید بە وەزیری ناوخۆ دەگەریتەوە (٣ی ئازاری ١٩٥٨)، هەروەها لە وەزارەتی ئەحمەد موختار بابان دا (١٩ی ئایار ١٩٥٨) هەتا (١٤ی تەموز ١٩٥٨)، لە رۆژی شۆرشەکەدا دەگیریَ "مەحکەمەی شەعب" حوکمی خنکانی بەسەردا دەدا (٤ی شوبات ١٩٥٩) حوکمەکەیان سەر لە بەیانی ٢٠ ئەیلولی ١٩٥٩ لە بەغدا بەجیَ هیناو لە سیدارە درا..[١٧] سەعید قەزاز بەریوەبەریکی ئازاو نەبەرد بوو، ترس لە دلیا نەبوو، سەربوردەی خۆبەختکەری لی دەگیرنەوە کەوا بە دەستی خۆی چەتەو تاوانباری لە چیاکانی کوردستان بەردەست کردووە، دژی کۆمۆنیست بوو، وای بۆ چوو بوو کەوا ئەو بیرو بروایە بیرو بروایەکی تیکدەرو روخینەرە کە ولاتانی ساوای تازە پیگەیشتووی وەك هەریمی عیراق ویران دەکات، کاتیَ بە تەوژمەکەی سالی ١٩٥٤ کە چواردەوری بەغدای بەسەر خستبوو، مەترسی ژیژ ئاوبوونی لی دەکرا، لە شەویکی تووش و پشیویدا دوای ئەوەی پردو بەربەستەکان رمان ئاو چووە ناو چواردەوری گەرەکی سەعدون، وەزیری لیپرسراوانی ئاودیری کۆبونەوە، زۆرترینیان چۆلْ کردنی بەرەی رەسافەیان پەسەند کرد کە دووچاری هەلچونی دیجلەیە، بەلام سەعید قەزاز دەلیَ: چۆن بەری رۆژئاوا چۆلْ دەکەن، کە لە دوو پردی زیاتر نیە بە کەرخ یانەوە ببەستیَ، دەبیتە هەراو پەشۆکانیك کەس بە کەس نابیَ، هەر خەلکەو دەکەویتە ژیر پیوەو هەر ئۆتۆمبیلەو پیك دەکەویَ. فرمانی دا لە کۆمپانیا خاوەن پرۆژە زلەکان کە دەست بەجیَ ٢٢ ئۆتۆمبیل و ئامیری قورس و ئامرازە بەرزکەرەوەکانیان بینن پردو بەربەستەکان توند و چاك بکەنەوە، بەهۆی دانایی و هیمەتی ئەو پیاوە مەردە وە بەغدا لە ژیر ئاوبوون و خنکان رزگاری بوو، سیر همفری تریفلیان بالیۆزی بەریتانی دوای شۆرشی چواردەی تەموز لە کتیبەکەیا "الشرق الاوسط في غمار الثورة" دەلیَ: شیوعیەکان رقیان لە سەعید قەزاز دەبۆوە و لیی دەترسان، لای هەموو کەسیکی تر ریزدار بووە، دەلیَ: بەرانبەر جنیودان و ریسواکردنی پر هەرای دادگای مەهداوی بەشیوەیەکی خۆراگر و هیمن چاو نەترس و ئازا راوەستا.

## سەعید قەزاز لە مەحکەمەی شەعبدا[18]

لە ٢٩ کانونی دووەمی ١٩٥٩ بەرانبەر مەحکەمەی شەعب بە سەرۆکایەتی عەقید فازل مەهداوی راوەستا کەوتە داکۆکی و بەرگری لە خودی خۆیدا، کۆتایی پێ هیناو گوتی: من ئیستا راوەستاوم، وا دەبینم مردنم لی نزیك بۆتەوە، سیدارە نامترسینێ، کاتێ لیی بەسەر دەکەوم زۆر کەسان لە ژیر پیمەوە دەبینم کەوا شایستەی ژیان نین، بە ئاشکرا رای دەگەیەنم کە من بەو کردەوەو خزمەتگوزاریانە دەنازم کە پیشکەشی نیشتمانی خۆشەویستم کردووە، شانازی دەکەم کە قەلاچۆی شیوعیەتم لە پیناو موسلمانیەتی و نیشتیمانەکەمدا کردووە، بەوە دەنازم وەزیریکی کارامە بووم رەفتار و کردەوەم ئەنجامداوە، بەوەحی لە خواوە و بەو عەقڵ و هۆشەو ئەو دلەی لە سینەمدایە بەدکاری شیوعی جیهانی و مەترسی لەسەر نیشتیمانی ئازیزم راگەیاندووە، بۆیە کۆتایی بەبەرگری لە خۆکردنم دینم کەوا داوای بەخشین و بەزەیی لە هیچ ئادەمیزادیك ناکەم، بەلکو خۆم دەخەمە بەر دەستی خودا، ئارام دەگرم تا یەزدان حوکمی خۆی دەدا، کە ئەو چاکترین حاکمە.

## عەلی حەیدەر سلیمان

دەچیتەوە سەر بنەمالەیەکی کوردی ناسراو کە فەرمانرەواییان لە ناوچەی سۆراندا کردووە، هەتا سەردەمی محەمەد پاشای (کۆرە)ی رەواندوزی کوژراوی سالی ١٨٣٦. عەلی حەیدەر سلیمان سالی ١٩٠٥ لە رەواندوز لە لیوای هەولیر هاتۆتە جیهان. لە موسڵ خویندویەتی دوایی نیردراوەتە بەیروت بۆ تەواوکردنی خویندنی لە جامیعەی ئەمریکی (١٩٢٦)، سالی ١٩٣٠ لیی دەرچووە بروانامەی بەکەلۆریۆسی لە علومی سیاسی بەدەست هیناوە، بە مامۆستایەتی دادەمەزرێ، پاشان پشکنینەر لە وەزارەتی (مەعاریف)، کتیبی "میژووی شارستانیەتی ئەوروپا" (١٩٢٣) و "میژووی ئەوروپای نوێ"ی داناوە (١٩٣٧)، دەگوازریتەوە بە (ملاحظ) لە نوسینگەی تایبەتی وەزارەتی ناوخۆ (١٩٣٣). دوایی یاریدەدەری بەریوەبەری گشتی ناوخۆ

(١٩٣٥)، پـاش ئـەوە کارمـەند دەبـێ لـە فـەرمانی دەرەوە، سـکرتیری سـێیەمی مفەوەزیەتی عیراق لە رۆما (١٩٣٧)، بۆ مفەوەزیەتی قاهیرە دەگوازریتـەوە، پاشان لـە فەرمانی دەست بەردار دەکەن و دەگـیرێ (تشـرینی دووەم ١٩٤١)، کـە بـەری دەدەن دەکەویتە کاری سەربەخۆ، سالە ١٩٤٨ بە نوینەری رەواندوز هەلدەبژیردرێ، بەلام لە ئازاری ١٩٥٠ واز دەهینێ، دەیکەنە وەزیری کاروباری کۆمەلایەتی (١٩ ئاب ١٩٤٨) و بریکاری وەزیری ئابوری (یەکی کانونی یەکەم ١٩٤٨ – ٦ کانونی دووەمی ١٩٤٩)، پاشـان بـە وەزیـری ئەشـغال و موسـەلات دامـەزراوە (١٠ کـانونی یەکـەم ١٩٤٩ – ٥ شوبات ١٩٥٠)، سەر لە نوێ بە نوینەری رەواندوز هەلدەبژیردریتـەوە (کانونی دووەم ١٩٥٣) و لـە (حوزەیرانـی ١٩٥٤) دەبیتـە وەزیـری ئـاوەدان کردنـەوە (اعمـار) (١٧ی ئەیلول ١٩٥٣)، دوایی وەزیری ئابوری (٨ ئازار ١٩٥٤) و جیکاری وەزارەتی ئاوەدان کردنەوەشـیان پـێ سـپاردووە (١٤ نیسـان ١٩٥٤ – ٢٩ نیسـان ١٩٥٤)، پاشـان دادەمـەزرێ بـە بـالیۆز لـە وەزارەتـی دەرەوە (تـەموز ١٩٥٦)، بـە سـەفیرایەتی عـیراق دەنیردریتە بۆن (تشرینی یەکەم ١٩٥٦)، لە هەمان کاتدا دەیکەنە وەزیـری مفـەوەز لـە هۆلنـدە (١٩٥٧)، دیسـان دەیکەنـە سـەفیر لـە وەزارەتـی دەرەوە (تشـرینی دووەم ١٩٥٨)، بـە جیگـری وەزیـری دەرەوە دادەمـەزرێ (شـوبات ١٩٥٩)، پاشـان دەیکەنـە بـالیۆز لـە واشـنتۆن (ئـازار ١٩٥٩)، لـە تـەموزی ١٩٦٢ بـە سـەفیرایەتی لـە دیوانـی وەزارەت دەگەریتـەوە بەغدا، دیسان دەیکەنـەوە سـەفیر لـە واشـنتۆن (ئـەیلول ١٩٦٤)، ئینجا سەفیر لە برن (تەموز ١٩٦٤) دوایی سـەفیر لـە رۆما (تـەموز ١٩٦٦)، لـە ئازاری ١٩٦٨ خانەنشین دەکرێ[١٩].

## محەمەد سدیق تەها

محەمەد سدیق کوری تەها کوری محەمەد کوری عەبدوللای کوری سـەید تـەهای نـەهری گـەیلانیـە، سـەید تـەهای باپیرە گـەورەی لـە نـەوەی عەبدولعـەزیز کـوری شـیخ عەبدولقادری گەیلانیە و لە رابەرانی ریبازی قادریە. لە تشرینی یەکـەمی ١٩٤٣ هـەتا

تشرینی دووەمی ١٩٤٦ بە نوینـەری هـەولیر هـەلبژیردراوە، نزیکـەی سـالی ١٩٧٠ کۆچی دوایی کردووە.

## قاسم حەسەن

پاریزەرو نوسەری سیاسەتمەدار قاسم حەسەن بنەمالەکەی لە دایکیـەوە کـوردی کەرکوکە، بـاوکی ئەفسـەریکی لەشکری تورکی بووە، سالی ١٩١٠ لـە بەغدا هاتۆتـە جیـهان، لـە کولیـەی حقـوق دەردەچـێ. لـە کـاتی خویندکـاریدا بەشـداری لـە بزوتنەوەکانی خۆپیشاندان و مان گرتندا کردووە، لە شوباتی ١٩٣٤ دەگیرێ، بەکاری پاریزەری هەلساوە، لەسی‌یەکانا تیکەڵ بە دەستەی دەرچوینەری رۆژنامـەی (الاهـالی) دەبێ. خەباتی لەگەڵ گەنج و لاوانی پیشکەوتنخواز و چاکسازانا کـردووە، بەشـداری لـە بزوتنـەوە نیشـتیمانیەکەی ئایـاری ١٩٤١ دا دەکـات لەسـەرئەنجاما بـەرەو ئـیران هەلدێ. دەچیتە ناو (حیزبی دیموکرات) لە کاتی دامەزرانیدا (١٩٤٦)، لە ریزەکـانی تیکۆشـاوەو لـە رۆژنامەکـەیا دەینوسـی، لـە راپـەرینی تشـرینی دووەمـی ١٩٥٢ بـۆ ماوەیـەکی کـەم دەگـیرێ، لـە ئاکـامی بـەرپابوونی شۆرشـی تـەموزی ١٩٥٨ دەیکەنـە بالیۆزی عیراق لە دەلهی (١٩٥٩)، بۆ براغ دەگوازریتەوە (١٩٦٠)، پاشان بۆ بۆدابست هەتا ١٩٦٣، بەشداری دەکا لـە کۆنگرەی (یـەکگرتوی ئاسیایی و ئەفریقی).. ئەندام دەبـێ لـەوەفدی عـیراقی لـە کۆبوونـەوەی دوو دەورەی نەتـەوە یـەکگرتووەکاندا (١٩٦٠ و ١٩٦١)، دەگەریتـەوە سـەرکاری پاریزەرایـەتی، لـە ٣ی تشـرینی یەکـەمی ١٩٧٠ لـە بـەغدا جیهان بـەجی دیلـی. قاسم حەسـەن لـە نووسـەرە سیاسـیە بـەرزەکان بوو، کتیب و نامیلکەی زۆری داناوە لەوانە: جهاد العرب القومی في فلسطين (١٩٣٩)، (المبادیء السياسية الحديثة في بلادنا) (١٩٣٩). (الثورة الصناعية في انگلترا)، الحق بين الصهيونية و الاستعمار (١٩٤٦)، العرب و المشكلة اليهودية (١٩٤٦)، اسرائيل دولة فاشية اعتدائية (١٩٦٠)، بوابتا ثورات القرن العشرين (١٩٦٩)، لمحات من تأريخ التطورات الأجتماعية في الغرب ١٩٥٨ ...هتد.

## حەسەن فەهمی جاف

لەسەرۆکانی عەشیرەتی جاف حەسن فەهمی کوری عەلی کوری مەحمود پاشایە، لە ١٦ تشرینی دووەمی ١٩٠٥ لە هەلەبجە هاتۆتە دنیا، لەسەر دەستی مامۆستایانی تایبەتی خویندویەتی، خەریکی کشتوکاڵ و بەریوەبردنی کاروباری عەشیرەتەکانی بووە، ئارەزومەندی بەلای ئەدەبەوە چووە، وتارەکانی لە بارەی کاروباری ئابوری و ئاوەدانی ناوچەکەیدا لە گۆڤاری گەلاویژی ماناگنەیی کوردی بلاوکردۆتەوە کە سالی ١٩٣٩–١٩٤٩ دەرچووە، باس و تویژینەوەی لەسەر میژووی بنەمالەی زەندی کورد نوسیوە کەوا لە ناوەراستی سەدەی هەژدەهەمدا فەرمانرەوایی ئیرانی کردووە.

لەسەر گەشتی زەینەفون بۆ کوردستان، بە نوینەری هەلەبجەی سەر بە پاریزگای سلیمانی هەلدەبژیردریّ (حوزەیران ١٩٤٨)، سەر لە نویّ لە کانونی دووەمی ١٩٥٣ و ئەیلولی ١٩٥٤ و ئایاری ١٩٥٨ هەلدەبژیردریتەوە، لە ١٨ حوزەیرانی ١٩٧٣ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە. دانەرەکانی: بە زمانی کوردی: (پالەوانی زەند) سەربوردەی لوتفی عەلی خانی زەندە، لە فارسیەوە وەری گرتووە و لە ١٩٥٦ چاپکراوە، کوردستان گەرانەوەی دە هەزار یۆنانی سالی ٤٠١ پیش زاین دانەرەکەی (زەینەفۆن) هەروەها لە (١٩٥٦ چاپکراوە)، لە دەستخەتە بەجیماوەکانی: شیعرەکانی بە کوردی و فارسی و تورکی، و کتیبیّ لەسەر عەشیرەتی جاف.

هەروەها لە سەرۆکە ناسراوەکانی هۆزی جاف ئەحمەد محەمەد سالح: کوری محەمەد سالح بەگ کوری عەزیز بەگ کوری محەمەد بەگ کوری قادر بەگ (لە بەرەی بەهرام بەگ)ە سالی ١٩٠٣ لەدایك بووە، لە تەمموزی ١٩٥٤ بە نوینەری سلیمانی هەلبژیردراوە (قەزای هەلەبجە). لە ١٦ ئابی ١٩٧٣ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

## میرانی قادر بەگ

میرانی عەبدول قادر بەگ کوری مستەفا بەگ سەرۆکی هۆزی خۆشناو دەچیتەوە سەر بنەماڵەی میر محمەلی، بارەگاکەی لە ناحیەی شەقلاوەی سەربە هەولیرە، دوای مەرگی بایز بەگی برای سەرداریەتی هۆزەکەی گرتۆتە دەست، پیاویکی توند و بە توانا بوو، داواکاری یەکیتی و یەکبوون بوو، هەولی بلاوکردنەوەی خویندەواری لە هەموو ناوچەکانی هۆزەکەی داوە. لە شوباتی ۱۹۲۳ بە نوینەری هەولیر هەلبژیردراوە، سەر لە نویٚ لە دەورەکانی داهاتوودا هەتا سالی ۱۹۳۷ هەلدەبژیردریتەوە، لە کۆتایی ئایاری ۱۹۳۹ بەهۆی زام و برینیکی باسکی لە تەمەنی شەستەکاندا کۆچی دوایی دەکات.

سدیق میرانی کوری جیگای لە سەرۆکایەتیەکەدا دەگریتەوە، سالی ۱۹۰۷ هاتۆتە دنیا، لە حوزەیرانی سالی ۱۹۳۹ بە نوینەری هەولیر هەلبژیردرایەوە، بەنوینەریەتی لە هەموو دەورەکانی یەك لە دوای یەکدا دەمینیتەوە، هەتا شۆرشی تەموزی ۱۹۵۸.

لە شوباتی ۱۹٦۱ لە نزیك شارۆچکەی شەقلاوە لە هاتوو هەرای عەشیرەت گەری نیوان بارزانیەکان و کوردەکانی شەقلاوە بەغەدر دەکوژریٚ[٢٠].

## بابا عەلی شیخ مەحمودی حەفید

بابا عەلی کوری شیخ مەحمود کوری شیخ سەعید کوری کاك ئەحمەد کوری شیخ مەعروفی نۆدییە. شیخ مەحمود باوکی (۱۸۸۱-۱۹٥٦) سەرۆکی عەشیرەتەکانی بەرزنجە بووە لە سلیمانی، سەرکردایەتی چەندین شۆرشی لەسەر حکومەتەکانی تورکی و بەریتانی و عیراقی بەرپا کردووە.

باباعەلی لە بەهاری سالی ۱۹۱۲ لە سلیمانی هاتۆتە جیهان، قوتابخانەی سەرەتایی لە بەغدا تەواو دەکا، ناردویانە بۆ کولیەی ڤکتۆریا لە ئەسکەندەریە (۱۹۲۸)، سالی ۱۹۳۲ لیٚی دەرچووە. پاشان چوەتە جامیعەی کۆلۆمبیا لە نیۆیۆرك (۱۹۳۳)، بروانامەی (ئوستاذ علوم)ی لە بواری ئابوری سالی ۱۹۳۸ بەدەست هیناوە. کە دەگەریتەوە بۆ ماوەیەکی کەم فەرمانبەری لە بەریوەبەرایەتی سکەی شەمەندەفەر

بینیوه (١٩٤٠)، پاشان دەکەویتە کاروباری کشتوکالی و ئابوریەوە. سالی ١٩٤٣ لە عەمارە و رومادی بە هۆی بەدگۆیی و بوختانیکی درۆوە دەگیریّ، دوای دوو مانگ بەردەدریّ. لە وەزارەتی ئەرشەد ئەل عومەری دەیکەنە وەزیری ئابوری (یەکی حوزەیران ١٩٤٦)، لە پایەکەی خۆی لە وەزارەتی نۆیەمینی نوری سەعید دەمینیتەوە (٢١ تشرینی دووەم ١٩٤٦ – ٢٩ ئازار ١٩٤٧). بە نوینەری سلیمانی هەلدەبژیردریّ (ئازار ١٩٤٧)، دەیکەنە وەزیری ئەشغال و مواسەلات (١٤ تەمموز ١٩٥٨)، لە ٧ی شوبات ١٩٥٩ واز دەهینیّ، پاشان بە وەزیرایەتی کشتوکالّ دادەمەزریّ (٨ شوبات ١٩٦٣ – ١٦ حوزەیران ١٩٦٣)، دوای ئەوە خۆی خەریکی کاروباری ئابوری کردووە. سالی ١٩٦٨ عیراق بەجیّ دیلیّ، دوو سالّ لە تاهران و بەیروت نیشتەجیّ دەبیّ پاشان لە لەندەن دەگاتە دوا هەواری[٢١].

## نازم زەهاوی

نازم کوری عەبدولجەلیل کوری محەمەد فەیزی موفتی بەغدای سەردەم، لە بەغدا سالی ١٩١٠ هاتۆتە دنیا، لە تشرینی یەکەمی ١٩٢٩ دەست بەکاردەبیّ لە خزمەتگوزاریەتی حکومەت، لە کولیەی حقوق دەخوینیّ، سالی ١٩٣٤ لیی دەرچووە. لە ئایاری ١٩٣٥ بەبەریوەبەری (ئەموالی قاسرین) دادەمەزریّ، هەتا لە کۆتایی سالی ١٩٤٥ واز دەهینی،لە گەنجە رۆشنبیرەکانی داواکار بۆ بیروبروای پیشکەوتن و چاکسازی بووە، وتارەکانی لە گۆڤارو رۆژنامەکاندا نووسیوە. کتیبی: "نقد المثالیة الحدیثة" دانەرەکەی جۆن لویس وەرگیراوە (١٩٤٥) "الاصول التاریخیة للامپریالزم الالمانی (١٩٤٦) دانەرەکەی ئوجین ڤارکا پسپۆری ئابوری مەجەری، "مقدمة فی الفلسفة المادیة" کاتی بەریوەبەری بەرپرسیاری رۆژنامەی (السیاسة) دەبیّ لە ئابی ١٩٤٦ سەبارەت بە وتارە ئازاو چاو نەترسیەکانی رۆژنامەکەیابلاوی کردونەتەوە دەیگرن و مانگیك حوکمی دەدەن، پاشان بەری دەدەن، دەگەریتەوە خزمەتگوزاریەتی میری دەیکەنە بەریوەبەری گشتی ئەموالی موستوردە (١٩٤٨)، دوایی پشکینەری گشتی دارایی (١٩٥٢)، ئینجا بەریوەبەری گشتی لە وەزارەتی ئابوری (١٩٥٢)،

دەگوازریتەوە بە بەریوەبەری گشتی "مصرف صناعی" (١٩٥٣)، بە نوینەری عیراق دەبیتە بەریوەبەر لە کۆمپانیە نەوتەکان لە لەندەن (حوزەیران ١٩٥٥)، دوای شۆرشی ١٩٥٨ دەگەریتەوە بەغدا، دەبیتە بەریوەبەری گشتی شەریکەی "الزیوت النباتیة" دەیکەنە موحافیزی بەنقی مەرکەزی (نیسان ١٩٥٩)، دوایی وەزیری بازرگانی (١٥ تشرینی دووەم ١٩٦٠_ ٨ شوبات ١٩٦٣)، دوای ئەوە پەنا دەباتە بەر ولاتی عەرەبی سعودی لە ٢٤ تشرینی دووەمی ١٩٦٣لە (ریاز) کۆچی دوایی دەکا. مەحمود سوبحی دەفتەری بۆی باس کردم: ئەو سالی١٩٣٩ وەزیری داد دەبیّ، لیستەیەك بۆ لیکخستنی هەندیّ لە فەرمانبەرانی گەورە خرایە بە دەستی ئەنجومەنی وەزیران، لەوانە نازم زەهاوی بەریوەبەری "ئەموالی قاسرین" بوو، دەفتەری دەلیّ: سەبارەت بەوەی من تواناو سەر راستی نازم زەهاویم دەزانی بەرهەلستیم لە لادانی کردوو لە فەرمانەکەی خۆیدا مایەوە، دوای چەند رۆژیك هات سوپاسی کردم پاشان پیی گوتم: پاش ماوەیەکی کەم شایستەی بەرزکردنەوەی موچەکەمم، گوتم: هەرچی لە توانامدا بیّ بۆتی دەکەم، بەلام مەزەندەی ئەوە ناکەم لەم تەرزە زروفەدا تەرفیعت ببیّ. هەفتەیەك یا دەرۆژی نەبرد جاریکیتر نازم هاتەوە لام، لەبارەی بەرزکردنەوەکەی پرسی چی لی هاتەوە، چونکە ماوەی پیویست بەگویرەی یاسا سیّ سالە، من لەو رۆژەوە هەقی خۆمە. بە پیکەنینەوە پیم گوت: چما ئەوە کۆمپیالەیە کەوتۆتە سەرم کە بیدەم تۆش هاتووی داوام لی دەکەی!!...

## خالید نەقشبەندی

خالید عەبدول غەفار نەقشبەندی لە سالی ١٩١٥ لە گوندی بامەرنی سەر بە قەزای ئامیدی لە پاریزگای موسلّ هاتۆتە دنیا، خویندنی قوتابخانەی ناوەندی لە موسلّ دواناوەندی لە بەغدا تەواو کردووە، چۆتە کولیەی عەسکەری (١٩٣٦) لە تەموزی (١٩٣٧) بە ملازم لیی دەرچووە، دوای ئەوە لە کولیەی ئەرکان بە پایەی رەئیس روکن دەردەچیّ (١٩٤٥)، ئیواران لە حقوق دەخوینیّ، سالی ١٩٥٠ تەواوی

دەکا. لە سوپا دەمینیتەوە،بۆ پایەی موقەدەم بالا دەکرێ (١٩٥٠)، دەیکەنە ئامیر فەوجی دووەم لە لیوای سییەمدا و ئامیری حامیەی رەواندوز.

سوپا بەجێ دیلێ، دەبێتە قایمقامی قەزای رانیە (١٩٥٢) و کۆیسنجاق ئینجا هەلەبجە، بۆ پاریزگاری لێ ، کە شۆرشی ١٤ تەموزی ١٩٥٨ بەرپا دەبێ دەیکە ەی کۆماری عیراق، هەتا کۆچی دوایی لە بەغدا لە



## عزالدینی م

کوری ئەبی بەکر ) لە زانایانی هەولیر و ناودارەکانییەتی، دەچیت رکی دەرس وتنەوەیان لە مزگەوتی گەورەی قەلات اوکی و ئەبوبەکری باپیری کە نازناوی کوچك مەلا بووە، کوری مەلا عوسمان کوری ئەبوبەکری حوجرەوییە.

عیزەدین سالی ١٩١٦ لە هەولیر هاتۆتە دنیا[٢٢]، لە جامیعەی ئەمریکی لە بەیروت خویندویەتی، بە نوینەری هەولیر لە ئەنجومەنی نوینەراندا هەلبژیردراوە

(ئـازار ١٩٤٧)، سـەر لـەنوێ لـەدەورەکانی داهـاتووی یـەك لـە دوای یـەك دا هەلبژێردراوەتەوە، لە یەکی کانونی یەکەمی ١٩٤٧ بە جیگری دووەمی ئەنجومەنی نوینەران هەلدەبژێردرێ، دیسان لە ٢١ حوزەیران ١٩٤٨ هەلدەبژێردریتەوە، پاشان هەلبژاردنەکەی نوێ دەکریتەوە هەتا ٢٧ تشرینی یەکەم ١٩٥٢. بە جیگری دووەمی سەرەك ئەنجومەنەکە هەلدەبژێردریتەوە (٢٤ کانونی دووەم ١٩٥٣)، پاشان بە جیگری یەکەمی سەرۆك (یەکی کانونی یەکەم ١٩٥٣)، دیسان هەلبژاردنەکەی نوێ دەکریتەوە هەتا (١٥ کانونی یەکەم ١٩٥٧). دادەمەزرێ بە وەزیری بێ وەزارەت (١٥ی کانونی یەکەم ١٩٥٧ تا ٣ی ئازار ١٩٥٨) دوایی بە جیگری یەکەمی سەرەك ئەنجومەنی نوینەران هەلدەبژێردرێ (١٠ ئایار ١٩٥٨ تا ١٤ تەموز ١٩٥٨). دوای ئەوە لە بەیروت نیشتەجێ دەبێ[٢٣].

## مەحمود جەمیل

لە بنەمالەی ناسراوی بابانە، مەحمود کوری جەمیل کوری مەجید پاشای بابانە، باوکی نوینەر بووە لە ئەنجومەنی نوینەراندا، لە تەموزی ١٩٤٦ کۆچی دوایی کردووە، مەحمود بابان سالی ١٩٢٠ لەدایك بووە، لە جامیعەی ئەمریکی لە بەیروت دەخوینێ، لە کولیەی حقوق لە بەغدا دەرچووە (١٩٤٣) دەیکەنە کاتبی یەکەم لە دادگاکانی مەدەنی (١٩٤٤) دوایی (محقق عەدلی) ئینجا جیگری حاکمی ئەغرەمیە (کانونی دووەم ١٩٥٠) دەبیتە حاکمی جەزای بەغدا، سالی ١٩٥١ بە نوینەری خانەقین هەلدەبژێردرێ، دوایی نوینەری قەزای کفری لەم دەورانەدا ١٩٥٣ و ١٩٥٤ و ١٩٥٨، ئیمتیازی دەرچواندنی گۆڤاریکی کوردی بە ناوی (هیوا)ی پێ دراوە دەرچواندنەکەشی بە حافز مستەفا و هاشم دۆغرەمەچی سپاردووە، دادەمەزرێ بە وەزیری تەندروستی (١٥ی کانونی یەکەم ١٩٥٧)، دوایی وەزیری دەولەت (٣ی ئازار ١٩٥٨)، بەردەوام دەبێ لە پایەکەی لە ١٩ ئایاری ١٩٥٨ هەتا ٤ تەمموزی ١٩٥٨، ئامادەی کۆنگرەی پەرلەمانیەکانی دەولەتان دەبێ کەوا لە برن (١٩٥٢) و (١٩٥٥) و لەندەن (١٩٥٧) دەبەسترێ، دوای ئەوە بە راویژکار لە وەزارەتی ناوخۆی سعودیە

کارمەند دەبێ، بۆ لەندەن دەگوازرێتەوە لیی نیشتەجێ دەبێ، دەکەوێتە کاروباری بازرگانیەوە.

پەراویز:

(١ )بە پیی ئەو بەلگەنامە نهێنیانەی کە لە کاتی خۆیدا بڵاوکراونەتەوە. مەلای گەورە و جەمیل ئاغای حەویزی یاداشتیکیان لە سالی ١٩٢٠ دایتە کەپتان های ئەفسەری سیاسی بەریتانی لە کۆیە تییدا هاتووە دەلێ: حەمدی بەگ بابان پیاویکی لیوەشاوەیە شایستەی ئەوەیە بکرێ بە فەرمانرەوای گشتی دامودەزگای حکومەتیکی سەربەخۆی کورد، لە باریکا ئەگەر بەریتانیا نارەزایی و دلنیگەرانیان لە شیخ مەحمود هەیە، چونکە لە بنەمالەیەکی خانە وادەیە رۆشنبیر و دەولەمەند و لیهاتووە لەوانەیە بەبێ موچەش فەرمان بەجێ بینێ. دەقی ئەم بەلگەنامانەش لە کتیبی (مەلای گەورە و زانا و ئەدیب و شاعیر)دا هەیە "وەرگیر".

(٢ )گوندی (ماوەران) نیشتەجێ بووی بنەمالەی حەیدەرییە نەك گوندی حەریر.

(٣)نظارة الدفتر الخاقاني : واتای بەریوەبەری تەشریفاتی خەلافەت دەگەیەنێ.

(٤ )زەید ئەحمەد عوسمان: سالی ١٩٢٤ لە هەولیر هاتۆتە جیهان، کولیەی حقوق لە بەغدا تەواو دەکات، ماوەیەك بە کاری پاریزەری هەلدەستێ، یەکیك بوو لە زمان زان و رۆشنبیرانی کورد جگە لە زمانی کوردی عەرەبی و تورکی و ئینگلیزی و فەرەنسی زانیوە. هەستی نەتەوایەتی و هەلویستی جۆراو جۆری سیاسی کوردانەی هەبوو، تا ئەوەی سەردەمیك روو دەکاتە کەژ و کیو تیکەڵ بە

بزوتنەوەی ئازادیخوازی کورد دەبێ، پاشان بە دڵ نیگەرانیەوە دەچیتە فەرەنسا هەر لەویش لە ١٩٧٨ بە نائومیدی سەردەنیتەوە تەرمەکەیان هینایەوە لە هەولیر بە خاك سپیردرا. "وەرگیر"

(٥ )بنەماڵەی دزەیی یان لە بنچینەدا لە دیی (دزدێ) گوندی سەید تەهای نەهری لە کوردستانی بەشی ئیرانەوە لەبەر هەر هۆیەك بوبێ هاتینە ناوچەی قوشتەپە نزیك شاری هەولیر وە ئەم خانەوادەیەش لە چوار بەرەباب پیك هاتین وە هەر یەکیك لەو بەرەبابانەش سەردار و برا گەورەی تایبەتی خۆیان هەیە .

١ .بەرەبابی مالی پاشا کە خدر بەگ دوای مەرگی باوکی دەبیتە سەردارو سەرۆکیان.

٢ .بەرەی مالی فارس: برا گەورەو سەرداریان مەعروف پیرداود ئاغا بووە.

٣ .بەرەی مالی بایز: گەورە پیاو و سەرۆکیان برایم ئاغا بوو کە لە مەخمور دادەنیشت دوای ئەو ئەحمەد حەمەد ئەمین لە دوو گردکان بوو.

٤ .بەرەی مالی کاکە خان : عەلی مەحمود سەرداریان بووە، هەواری گوندی مورتکە دەبێ. بەشیك لە بنەماڵەی کاکە خان بە مام خولەیی ناسراون، برا گەورەیان سلیمان ئاغا لە دیبەگە نیشتەجێ بووە. "وەرگیر"

(٦)سالی ١٩٥٣سالی تازە دەرچونی خویندنم بوو بەریوەبەری قوتابخانەی قورشاغلو بووم، خدر بەگ زوو زوو سەردانی ئەو گوندەی دەکرد کە هی ئاغای برای بوو (باوکی حاکم رەحمان ئەندامی مەحکەمەی تەمیز) دۆستایەتی و ئاشنایەتیمان لەگەڵ خدر بەگ خۆش بوو، ئەو شەوەم هەرگیز لەبیر ناچیتەوە لە دیوەخانی ئاغا دانیشتبووین زۆری خەلکی گوندەکەش لەوێ بوون لە ناکاو خدر بەگ بە ژورکەوت تیکرا سەرپێ هەموو راست بوینەوە، دوای سلاوکردن بەلای سەرەوەدا هات رووبەرووی حاجی رەسول وەستا کە لە تەنشت منەوە وەستا بوو وەلای دەستی راستم ئاغا بوو بیدەنگ تاوێ لە حاجی‌راما پاشان کوتوپر هەلی کیشا دەمانچەکەی کەوتە گوللە باران کردنی حاجی، پەیتا پەیتا چواردە گوللەی یەك لە دوای یەك بە پشتی سەری و تەنیشتی چەپ و راستیەوە نا هەمووشیان لە پەنجەی دەست زیاتر لە نیوان گوللەکان و لەشی حاجی تیپەر نەبوو! تەقەو تەوژمی دەمانچەی چواردە خۆر ژورەکەی دەهەژاند حاجیش وەك تاویرە بەرد چەق و رەق وەستا بوو هەستی لە خۆی بریبوو دەستەکانی بە خۆیدا شۆرکردبۆوە پاشان خدر بەگ دەستی کرد بە پیکەنین و هەندێ جوینی بە حاجی‌دا، بەراستی من حەپەسام و سەرم لەوە سورما هەندێ لە گوللەکانیش نیوان من و حاجی گرتەوە! گوتم: حاجی دەك مالت بە قور گیرێ ئەوە چۆن ئۆقرەت گرت نەجولای و نەشیوای؟ گوتی مامۆستا شارەزای دەست وقامی نیشان شکینی ئەوم هەر بجولابام میشکی دەهاریم! تا بلیی مەشرەب خۆش و خیرخواز و بێ فیز بوو.

(٧)سالح زەکی بەگ ئەم کورانەی لە پاش بەجیماون: یوسف و شامل لە هەولیر دادەنیشن ئەمیر و تەیموور لە بەغدا نیشتەجێ بوون، ئیستا لە ئەلمانیان، هەروەها (عماد) کە لە ئمارات کار دەکات.

(٨ )لەبارەی شاعیریەتی سالح زەکی بەگ و بەرهەمەکانی شتیکی وام دەست نەکەوت تەنیا ئەم دوو دیر شیعرەم بەرچاو کەوت کە لە پشتی ئەو وینە یادگاریەی کە لەگەڵ مەلای گەورە لە کۆیە گیراوە.

هات و چوونە حالی عالەم حالی نابێ پایەدار          حالی رابردوو بە حەسرەت بابمینێ یادگار

(٩ )لە زۆر سەرچاوەی باوەرپیکراودا بە تایبەتی ئەفسەرانی کوردی هاوسەردەم و شارەزا بە هەلویست و ژیانی بەکر سدقی ئەوە دەگەیەنن کەوا نەتەوایەتی کوردایەتی و هەلویستی دلیرانەی هەبووە. تا ئەوەی دەلین: لە کاتی فەرمان رەوایی ئەودا زۆربەی خویندکاری کورد لە کولیەی سوپایی وەردەگیران، کە گەلێ ئەفسەرو سەرکردەی سوپایی لیهاتووی کورد پیگەیشتن لە ناو سوپای عیراقدا. بەکر سدقی نیاز و ئارەزویەکی دورو بەرفراوانی بۆ چارەنووسی کورد هەبووە. "وەرگیر"

(١٠)وەسیەتەکەی تۆفیق وەهبی بەگ بە ئەنجام گەیەندرا، بەریو رەسمیکی شکۆدارەوە بە ئامادەبوونی خەلکیکی زۆر لەسەرکردەی سیاسیی و ئەدیب و خویندکارانی کورد تەرمەکەیان لە قەد چیای پیرەمەگرون بەخاك سپیردرا.

(١١)لە ئیوارەی ١٩٩٩/٣/١٦ پەردە لەسەر پەیکەری ئەو زانا مەزنە کوردە لە سلیمانی لادرا، کە لە دەستکردی هونەرمەندی لیهاتوو "زاهیر سدیق"ە.

(١٢)دارا بەگ لەو سەرداره ناودارانە بووە کە شایستەی زیاتر نووسینە لەسەری، پیاویکی بەخشندە و دڵ فراوان و میهرەبان بووە، جوامیرانە بەها نای هەژارو لیقەوماوان هاتووە، گەلێ کەسی لە مەینەتی و بەندی و ئەشکەنجەیی رزگارکردوە، بەدل وبەگیان خەلك و عەشیرەتەکەی خۆشیان دەویست و ریزو شوینی تایبەتی لای کاربە دەستانی حکومەتی ئەوسا هەبووە. خەتی تایبەتی تەلەفونی بۆ راکیشراوەتە گوندەکەی کە بەناوی ئاوایی دارابەگ ناوبراوە ، سکەی شەمەندەفەریان بەناودا بردووە هەرکاتی سەفەری بکردبا فارگونی تایبەتی بۆ دەبەسترا ، ژمارە (یەك ١) دراوە بە ئۆتۆمبیلەکەی . . وەجاغ کویربوو، نەوەی لەدو ا بەجی نەماوە . لەسەر وەسیەتی خۆی هەر لە مالە کەی خۆشی نیژراوە (وەرگیر).

(١٣)شیخ قادر لە حکومەتی شیخ محمودا پایەی سوپاسالاری بووە، هەروەها سەرەك وەزیرانی حکومەتەکەی مەلیك مەحمود بوو.

(١٤)کارو ڕەفتاری خێرخوازی و جوامێرانـەی حـازم بـەگ تـاکو ئـەمڕۆش لەسـەر زارو یـادی خەلکی ناوچەی زاخۆ و دەوروبەریەتی. بەش بەحالی خۆم یەك دوو جار چوومەتە زاخۆ بۆ ئەوەی بتوانم وینەو هەندێ زانیاری و بەسەرهاتوو هەلویستی تایبەتی ئەو پیاوە دلیرە بەدەست بینم، بەلام وەك پییان ڕاگەیاندم هـەموو کـورو نـەوەکانی لـەدەرەوەی وولاتـدا دەژیـن، زۆربـەیان پیـاوی کارامــەو لیهاتون. خویندەوار و خاوەن بروانامەی بەرزن. بەر یککەوت توشی مامۆستایەکی بەتەمەن بووم بۆی باس کردم گوتـی: بەراسـتی حـازم بـەگ بـاوکی هـەژارو کەسـاس و لی قـەوماوی میللەتەکـەی بـوو، بـۆ نمونە: لە سالی ١٩٤٢ وە یا ١٩٤٣ خەلکیکی زۆری کوردی تورکیـا بـە مـاڵ وخیزانـەوە ڕوو لـە زاخـۆ دەکەن لە خانی حاجی ئیبراهیم کـە ئیسـتا مزگەوتـە دادەبـەزن، قایمقـامی ئەوسـا شـاکر هورمـزی کـە پیاویکی تورکمان بوو فەرمان دەدا کە ئەو کو ردانە هەموویان دەربکرین، کە حازم بـەگ بـەوە دەزانـێ زۆر دل نیگـەران دەبـێ، بـە عـادەتی خـۆی هـەموو ڕۆژێ لـە دیوەخانەکـەیدا پیشـوازی لـە میوانـەکانی دەکات، قایمقامیش یەك لەوان دەبێ، حازم بەگ بـە تووڕەییـەوە پـێی دەلـێ: چـۆن ئـەم کوردانـە بـەم زستانە ساردو پر بەفرە کە لەوانەیە هەموویان بمرن و لەناوبچن دەریان دەکەی، قایمقام دەلێ: چیان بەسەر دێ با بەسەریان بێ، من بە گویرەی یاسا کە بەبێ شەرعی هاتوون دەریان دەکەم. دوای ئـەوە حازم بەگ تەلـەفون بـۆ موتەسـەریف دەکـات مەسـەلەکەی تیدەگـەینێ، لەسـەر داواکـاری ئـەو قایمقـام لەوێ لا دەچێ، کوردەکانیش لە جیگای خۆیان دەمیننـەوە. لەلایـەکی تریشـەوە هـەمزە عـەبدوللا کـە ئەمرۆ لە کوردەسیاسیە ناسراوەکانە لە بنچینەدا کوردی تورکیایە، لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانی دا لە هە ردوو حکومەت تورکیا و عیراق تاوانبار کرابوو، حازم بەگ لە مالی خۆی دالدەی دەداو ریزی لی دەنـێ و بـەنازو نیعمـەت پاریزگـاری دەکـا هەرچـەندە پۆلیـس و کاربەدەسـتیش بـەوە دەزانـن بـەلام لەبەر حازم بەگ ناتوانن هیچ بکەن، مامۆستا کەلەسـەر باسـەکەی ڕۆیشـتو گوتـی: ئـەوەندە پیـاویکی بەخشندەو لیبوردە بوو ئەگەر یەکیك پاش ملە باسی بەچاکە نەکردبایە و شـالاوی هینابایـە سـەری ئـەو دەچـوو گـەنم و برنـج و دیـاری تـری دەدایـێ!! ڕۆژێ لـە ڕۆژان هــەندێ ئیــش و کــاری لــەناو زەویەکاندا دەبێ سەرکارەکەی حازم بەگ چەند کریکاریك دەردەکا، کـە حـازم بـەگ لێی دەپرسـی لـە هـۆی دەرکردنیـان دەلـێ چونکـە ئیشـمان پییـان نـەماوە، حـازم بـەگ دەلـێ: بـا ئـەو بەردانـەی کـە گواستیتیانەوە بابیبەنەوە جیگاکەی خۆی سەرکارەکە سەری سور دەمینێ حازم بەگ دەلـێ: ئەوانـە هەژارن دەمەوێ بێ کار نەبن گوزەران بکەن "وەرگیر".

(١٥ )من ئەو کاتە لە لەندەن بووم کە عەلی کەمال لە یەکی ئابی ١٩٩٨ لـە لـەندەن کۆچی دوایـی کرد، تەرمەکەیان بردەوە کوردستان لە سلیمانی بە خاك سپیردرا، حکومەتی هەریمی کوردسـتان لـە سلیمانی زۆر بە شکۆمەندیەوە لەچلەیدا کۆری ماتەمینییان بۆ گرت. "وەرگیر".

(١٦)محەمـەد سـەعید کـوری میرزا مـەجید کـوری حـاجی ئەحمـەدی قـەزازە، سـالی ١٩٠٣ لـە گـەرەکی گۆیـژە لـە سـلیمانی هاتۆتـە دنیـا، کـە بـاوکی کۆچـی دوایـی دەکـات لـە ژیـر سـایەی حـاجی

ئەحمەدی باپیری و دوای ئەو لەلای مامی پیدەگات. هاوسەرکەی سەعید قەزاز "زەکیە خان" کچی توفیق قەزازی مامی بوو، سالی ١٩٨٣ کۆچی دوایی کردووە. تاقە کچیکی بە ناو "پەری" لە دوا بەجێ ماوە. چەندین جار لە لەندەن دیداریم لەگەلدا کردووە، ئافرەتیکی خاتوون و هۆشمەند و لیوەشاوەیە، هاوسەرەکەی دوکتۆر کەمال عەبدوللا ناجیە، کچیك و دوو کوری بروانامەیان هەیە. "وەرگیر".

(١٧)جەمیل غەریس بەریوەبەرو خاوەنی (گۆڤاری ئەلتەحریر) لە بەیروت پارچە شیعریکی ناسکی پر ستایشی لەسەر سەعید قەزاز بلاو کردۆتەوە کە بەم شیوەیە دەست پێ دەکات:

لك اسم مثل السيف نافذ يا وزير

و الوفاء و الجود حافضلك عهود

(١٨ )ئەگەر چی سەعید قەزاز بە برواو لە خۆبردوییەوە خۆی دابەستەوە، عەبدول کەریم قاسم سەرکردەی شۆرشی ١٩٥٨ و سەرەك وەزیران بەلینی بە هەندی کەسایەتی کوردیش دا کەوا حوکمە بەسەردا دراوەکەی سەعید قەزاز بەجێ نەینێ، کەچی لە ٢٠ ئەیلول ١٩٥٩ لە سیدارە درا، دلیرانە خۆی لەبەر سام و ترس و ویشومەی مەرگ راگرت.

ئەحمەد جەمال جیاووك لە رۆژنامەی خەبات بە عەرەبی لە بارەی دوا ساتی ژیانی سەعید قەزاز لە بەندیخانەدا نوسیویەتی کە ئەویش لە کابرایەکی عەرەبی گوی لێ بووە کە لەو کاتەدا لە بەندیخانەکە دەبێ دەلێ: پیاوی وا قارەمان وەك سەعید قەزاز کەم هەلْ دەکەوێ، بەهجەت عەتیە بەرێوەبەری ئاسایشی ئەوساکە لەبەر جەلادەکەی دەپارێتەوە کەوا هەندی دوای بخاو بیکاتە دووا لیستەی لە سێدارە دراوەکان، سەعید قەزاز کە لەتەنیشتی دەبی خۆی لێ تورە دەکا پێی دەلێ: حەفتا سالی تەمەنت بەرێ کرد بێزار نەبووی، چەند ساتێك لە دواخستنی بەجێ هێنانەکە چ سودێك دەگەیەنێ کە تۆ لەو بارو هەلۆیستەدای، پاشان سەعید قەزاز لە جەلادەکەی دەخورێ دەلێ: وەرە من ئامادەم حوکمەکە بەجێ بێنە، نامەوێ لەم مەینەتەدا بمێنمەوە پێم باشترە بەپەتی سێدارەوە هەلواسرێم و ئەوانیش لەژێر پێمەوە بن کەشایستەی ژیان نین.

عیدۆ باب شێخ – ووتارێکی بە عەرەبی لە رۆژنامەی ئیتحاد ژمارە ١٥٥ شەممە ٢٨ تشرینی یەکەم سالی ١٩٩٥ بلاوکردۆتەوە. ئێمەش تەنیا بەشێکمان لێ وەرگێرایە سەر زمانی کوردی دەلێ: لە مێژووی تازە دامەزراوی حکومەتی عێراقی گەلێ کەسایەتی کورد پەیدا بوون کەوا بەوپەری دلسۆزی و خۆبەختیەوە لە بواری خۆیاندا خزمەتیان کردووە، لەوانەی کەلە بەرێوەبەرایەتی دا ناودار بوون. ئوستاذ سەعید قەزاز بوو، کەوا پێ بە پێ لە پلەو پایەکانی تێ هەلچووە تا ئەوەی بە هۆی زیرەکی و دەست پاکی و لێهاتووی خۆی گەیشتە پایەی وەزیری ناوخۆ بەراستی نمونەیەك بوو لە بەرێوەبەرێکی سەرکەوتو، بەش بەحالْ گەلێ چیرۆك و بەسەرهاتم لەوانەی کە لەژێر دەستیا

کارمەند بوون گوی لی بووە، سەراپا هەموش ئازایەتی و دلسۆزی لە کارو رەفتاردا دەگەیەنن. پیکەوتن و ئاگاداربوونی لە کاروباری بەریوەبەرایەتی و فەرمانبەرو پیداویستی خەلك و شیوەی بەریوەچوون لەو پەری وولاتدا.

سەرەرای دلسۆزی بۆ پایەو پیشەو فرمانەکەی خۆی گەلێ هەلویستی نەتەوەیی و نیشتمانی پەروەری نواندووە، چەندین کەسایەتی و سیاسەتمەداری کوردی لەتەنگ و چەلەمەی ترسناك رزگار کردووە، ئەگەرچی دەشیزانی بەکاری سیاسی ئەوتۆ هەلساون کەوا بەپیی یاسا و بریاری دەولەت قەدەغە و تاوانە لە کاتیکا خۆشی وەزیرەو بەرپرسیارە، هەولیکی زۆری داوە کە مودیر ناحیەو قایمقام و ئەفسەری کورد دابمەزرینی و هانی دەدان کەوا بۆ گەل و نیشتمانەکەیان دلسۆزبن، وادیارە ئەو هەموو هەلویستە نەتەوەیی و نیشتمان پەروەرییەی جگە لەسەر راستی و جگەر سۆزی بۆ کارو فرمانەکەیا هیچیان لە کاتی بەرپابوونی شۆرشی "١٤ تەمموزی ١٩٥٨" دادی نەدا، تەنانەت حوکمەکەشی سووك نەکراو لە کاتیکا زۆربەی پیاوانی کاربەدەستانی سەردەمی پاشایەتی بەرامبەر مەحکەمەی شەعب وەستان، کەچی بەشی خوالیخۆش بوو سەعید قەزاز لەسیدارەدان بوو، هیچ حیزبیکی ئەوسا تەنانەت هیچ کەسیك نەهات بەرگری لی بکات. هەندێ راستی و حەقیقەتی شەرەف مەندی دەربخەن، بەلکو هەموو بێ دەنگ بوون، ئەوەش لە ترسی ئەوەی نەبادا لە لایەن جەماوەرەوە تاوانبار بکرین کە گۆیا بەرگری کردنە لە ئیمپریالیزم و کلکەکانی بەپیی باوبونی زاراوەی ئەوسا، ئیتر سەعید قەزاز بە مەردی و دلیری رووبەرووی مردن بۆوە و لەکاتی بەسەرکەوتنی سیدارەدا، گوتی‌یەتی "خەلکانی ئەوتۆ لە ژیر پیمەوە دەبینم کە شایستەی ژیان نین"، من مەبەستم لە نووسینی ئەم پیشەکی‌یە بەرگری کردن نیە لە شکۆداری کەسایەتی سەعید قەزاز بەلکو میژوو کەفیلی ئەوەیە، بەلام دەمەوێ بلیم کە چەندین پالەوان بەسەرگەرمی بەشداری لەناوبردنی کوردو هەلمەتی ئەنفال و ویران کردنی گوندەکان و ئەشکەنجەدانی تیکۆشەران و دابەزاندنی نەفسیەتیان کردووەو هەرگیز رۆژی لە رۆژان بەقەد تۆزقالیك بیریان لە خزمەتی کورد نەکردۆتەوە، هەروەك خوالیخۆش بوو سەعید قەزاز کردوویەتی. کەچی لەگەڵ ئەوەشا سەرکردەکانی شۆرشی کورد بەهۆی بیرجۆشی سۆزیانەوە تا ئەوەی چاولیگەری شۆرشی تەموزیشیان نەکرد بەلکو لیبووردنی گشتیان بۆ ئەو قارەمانانە دەرکرد، بەوەش نەوەستان بەلکو خەلات و بەراتیشیان پێ بەخشین و دەست پیشکەریان لە بەخۆوە گرتنیان دەکرد.

بەش بە حالی خۆم لە مەحکەمەی سەعید قەزاز ئامادەبووم (١٩٥٩) بۆ یەکەم جار بوو ئەو پیاوە کوردە ناودارەم دیت. پیاویکی سەر سپی بالا بەرزی سەرو سیما کۆك و لیوەشاوەم هاتە بەرچاو کە هێ نایان بە هیمنی لەناو قەفەسی ئاسنینی مەحکەمەکە راوەستا، بە چ باریك پەشۆکاوی و ترسی لی بەدی نەدەکرا.. ئینجا داواکاری گشتی عەقید روکن ماجید محمد ئەمین لائیحەی تۆمەت و برگە و بەندەکانی تاوانبار بوونی دەست پیکرد، ئەوەی جیگای سەرنج راکیشەر بوو کە نەیتوانی چ

تـاوانیکی ئـەوتۆ بخاتـە پـالی جگـە لـەوەی کـە وەزیـر بـووەو دژ بـە چـەپرەوی کۆمیۆنسـت بـووە. جەلسـەی دووەم سـەر لـە بـەیانی پاریزەرەکـەی کـە مەحکەمەکـە بـۆی دیـاری کردبـوو هەلسـاکەوتە بەرگری لیکردنی، (من له پشتیەوە دانیشتبووم) تەنیا ئەوەم لە یادماوە کە سەرەتاکەی بەم رستەیە دەستی پیکرد (لندع التاریخ یتکلم قلیلا) لە کۆتاییشدا گوتی " هذا هو المتهم واقفا امام ارادة الشعب خاضعا خاشعا ینتظر عطفکم و عفوکم عما جناه ".. سەعید قەزاز تیوەی رامابوو وەك زوبانی حالی بەم ووتانەی قایل نەبووبێ. یەك لەو شاهیدانەی هینایان فەرمانبەریکی پیشوو بوو، هەندێ لایەنی دەستپاکی و رەفتاری چاکی سەعید قەزازی باس کرد کە ئەوەش پیچەوانەی مەبەستیان بوو، شاهیدیکی تر "دیوالی ئاغا" بوو کە بەهۆی دەست دریژی بە تالان کردنی هەندێ گوندی هۆزی رکابەری هەلسابوو، لە کاتیکا سەعید قەزاز "متصرف"ی موسڵ بوو (ئیمەش خویندکاری خانەی مامۆستایان بووین)، سەعید قەزاز خۆی هاتە دهۆك لەسەرا بەدوای دیوالی ئاغای دا نارد یەکسەر فەرمانی گرتنی داو بەحەپسی ناردیە موسڵ.

(١٩ )عەلی حەیدەر سلیمان لە تشرینی دووەم ١٩٩١ لە بەغدا کۆچی دوایی دەکات. "وەرگیر".

(٢٠ )ئەوەی راستی بی وەك کاك فازل کاوانی لە لەندەن پیێ راگەیاندم گوتی: هۆی کوشتنی سدیق بەگ لەبەر ناکۆکی و کیشەی مولك و زەوی یان لەبەر ناحەزی و دوژمنیەتی نەبوو، بەلکو فەرمانیکی سەرکردایەتی شۆرشی ئەیلولی ١٩٦١ بەخالم مەحمود کاوانیان سپارد کە یەکیك بوو لە هەرە نزیکەکانی سەرەك بارزانی و سەرکردەیەکی شۆرشەکەش بوو، رووداوەکەش بەم جۆرە بوو: لە کاتیکا سدیق بەگ لەگەڵ چەندین چەکداری دەست و پیوەندی خۆیەوە لەسەر تازیەی حوسینی مەلا کە ئاغایەکی دزەیی و ئەندام پەرلەمان بوو بەرەو شەقلاوە دیتەوە لە نزیك گوندی حوجران مەفرەزەیەکی پیشمەرگە بەسەرکردایەتی مەحمود کاوانی خالم بۆسەی لی دادەنینەوەو دەستریژی لیدەکەن. دەبیتە شەرو تەقە لە نیوا نیاندا و سدیق بەگ تییدا دەکوژرێ، دەتوانم بلیم کوشتنی سدیق میران سەرەتای داگیرسانی شۆرش و خوین رژان و کوشت و کوشتار بوو لە کوردستان داو نەپسایەوە تا ئەمرۆشی لەگەڵ دابێ. دوای ئەم رووداوەش بەسالیك مەحمود کاوانیش لە ئاکامی بۆردومان کردنی فرۆکەکانی عیر اق لە گوندی عاقوبان نیوان ناحیەی هیران و شەقلاوە بریندار دەبێ، دو ای دوو هەفتە گیانی لەدەست داوە (١٩٦٢/٨/٢١).

(٢١)بابا عەلی لە ١٩٩٨ لە لەندەن کۆچی دوایی کرد، تەرمەکەیان بردەوە کوردستان لە سلیمانی دەنیژرێ. "وەرگیر"

(٢٢ )راستی میژووی هاتنە دنیای عیزەدین ئەفەندی وەك خۆی دەلێ ١٩١٧ بووە، لە مانگی ئازاری ١٩٩٧ لەگەڵ کاك نهاد نورەدین ئاغا ئەندامی پەرلەمان چوینە سەردانی، ئەگەرچی لە تەمەنی هەشتا سالی دا بوو بەلام هۆش و هەست و جولەی ئاسایی و پر چالاکی بوو، هەرچوار دەوری ژوورەکەی کتیبی هەمە جۆرەی بەهادار بوو، زۆرترین کاتی خۆی وەك پیێ راگەیاندم بۆ خویندنەوە

تەرخان کردووە، زمانی ئینگلیزی، فەر ەنسی، عەرەبی و تورکی جگە لە زمانی کوردی زکماکی خۆی و فارسی شی زانیوە. لە کتیب خویندنـەوەی فەرەنسـی و ئینگلیزی هـەر بەردەوامـە، یـادوەری و سەربوردەی ژیانی خۆی پێ بە پێ نووسیوەتەوە، بەلام نیازی بلاوکردنەوەی نیشان نەدا."وەرگیر"

(٢٣) دوایی شۆرشی تەمموزی ١٩٥٨ نزیکەی دوو مانگ دەگیرێ، دووبارە هەر لە سەردەمی عەبدول کەریم قاسم دا لە ١٩٦٢ بەند دەکریتەوە. دوای بەردانی دیسان لە ١٩٦٣ بەعسیەکان دەیخەنە بەندیخانەوە، دوای بەربونی دەچیتە پاریس لە ویشەوە روو دەکاتە بەیروت پاشان دیتەوە کوردستان هەوارگەی باب و باپیران. لە حوزەیرانی سالی ١٩٩٩ لە هەولیر جیهان بەجێ دیلێ. "وەرگیر".

زۆر لـه گـەریدەو میـژوو نووسـانی بیـانی یاداشـتی خۆیـان دەربـارەی کـورد و کوردستان نووسیوە زۆربەشیان بە چاپیان گەیاندووە بۆیە بە پیویسـتمان نـەزانی لـیرەدا دوبارەیـان بکەینـەوە، ئەوانـەی لـەم کتیبـەدا ناویـان هـاتووە لەسـەردەمی جیاجیادا سەردانی کوردستانیان کردووە ئەمانە بوون: "وەرگیر"

## لیکلاما ئینهۆلت

گەریدەیەکی هۆلەندی نەژادە، لە ١٨٣٧ لە بستروا‌غ هاتۆتە جیهان، گەشتەکەی لە سـالی ١٨٦٥ تـا ١٨٦٨ دەخایـەنی، لـەو ماوەیـەدا زۆرتریـن ولاتـانی رۆژهـەلاتی ناوەراست و کوردستان دیدار دەکات. لە سالی ١٩٠٠ کۆچی دوایی کردووە.

## کرترود مارغریت لۆپیان بیل

رۆژهـەلات ناسـی گـەریدە کرترود مارغریت لۆثیان بیـل لـە ١٤ تـەموز ١٨٦٨ لە ناوچەی درهام لـە بەریتانیا هاتۆتە دنیا. لـە تەمـەنی سـێ سالیدا دەبـێ کـە دایکـی

کۆچی دوایی دەکا، هیو بیلی باوکی بە ئەرکی پەروەردەو رۆشنبیر بوونی هەلدەستێ، خویندنی لە کولیەی مەلەکی لە لەندەن جامیعەی ئۆکسفۆرد تەواو دەکات، لە میژوو تایبەتمەند دەبێ، هەر لە هەرەتی نەوجەوانیدا هەواداری گەشت و سەفەر دەبێ، کەم ولات هەیە لە ئەوروپا، ئاسیا و باکوری ئەفریقا ئەم ئافرەتە سەردانی نەکردبێ، تا ئەوەی کەنەداو و ئەمریکاشی بەسەرکردۆتەوە. بەهۆی ئەوەوە زانیاری و شارەزاییەکی زۆری دەربارەی ئەو ولاتانە پەیدا کردووە، چەندین کتیب و نامیلکەی بەچاپ گەیاندووە، بە فارسی و عەرەبی بە باشی فیر بووە. لەهەواداری شاعیری ناوداری ئیرانی (حافز شیرازی) بووە. لەمیانەی گەشتەکانیدا سەردانی ناوچەی یەزیدییەکان دەکا، عەلی بەگ (کە ئەوسا سەردارو میری یەزیدییەکان بووە) پیشوازی میوان داری دەکات (١٩٠٩)، ئەم دیدار و چاوپیکەوتنەشی لە کتیبەکەیدا (من مراد الی مراد) بلاوکردۆتەوە (١٩١١)، ئەم خاتونە بەهرەوەرو هۆشمەندە رۆڵ و دەوری کاریگەری لەسەر دامەزراندنی حکومەتی نیشتیمانی عیراقی بەسەرۆکایەتی عەبدورەحمان نەقیب و دانانی مەلیك فەیسەڵ لەسەر عەرشی عیراقدا هەبووە. بەپێی ئەوەی سکرتیری برسی کۆکس حاکمی سیاسی ئینگلیز لە بەغدا دەبێ.

لە ١١ تەموز ١٩٢٦ لە بەغدا جیهان بەجێ دیلێ.

## ئیلی بانیستر سۆن

میجەر "رائید" ئیلی بانیستر سۆن خاوەنی گەشتی خۆگۆرین بۆ کوردستان لە ١٦ ئاب ١٨٨١ هاتۆتە دنیا دەچیتەوە سەر خیزانیکی دیرینی ئینگلیزی کە زۆربەی رۆلەکانی بە کشتوکالەوە خەریك بوون، کاتێ باوکی دەمرێ تەمەنی لە دوو ساڵ کەمتر دەبێ، خویندنی دواناوەندی لە ١٨٩٨ تەواو دەکات، دەبیتە فەرمانبەری بانقی شاهانەی ئیرانی، لەوێ فارسی بە باشی فیر دەبێ، چوارینەکانی خەیام وەردەگیریتە سەر زمانی ئینگلیزی. لە ١٩٠٥ پەیرەوی ئاینی ئیسلامیدەکا، سەردانی ناوچە جیاجیاکانی کوردستان و عیراقی کردووە. کتیبە بەناوبانگەکەی (رحلة تنکر الی بلاد الرافدین و کردستان) سالی ١٩١٢ بە چاپی گەیاندووە، سالی ١٩٢٦ دوای مردنی

دووباره چاپکراوەتەوە. سۆن سەردان و گەشت و سەفەری بۆ تورکیا و رۆژهەلاتی ناوەراست کردووە، جل و بەرگی کوردی و هەندێ جار هی ئیرانی پۆشیوە. ناوی لەخۆی ناوە (میرزا غولام حوسین شیرازی). دەنیردریتە ناوچەی بەختیار، توانیویەتی بەهۆی شەش جەنگاوەری ئازای کورد بزوتنەوەو سەربزیوی تورکی، ئەلمانی، لە ناوچەکەدا لەناو ببات. سالی ١٩١٩ دەبیتە حاکمی سیاسی شاری سلیمانی. ئەمن و ئاسایشی تیدا سەقام گیرکردووە، گەلێ پردو ریگاوبان و قوتابخانەی بنیاد ناوە. لە قوتابخانەکان بە کوردی خویندراوە، فەرمانبەرو کارمەندانی خۆی هەمووی لە رۆلەو پیاوی کورد پیك هینابوو. لە سالی ١٩٢١ پاش دامەزراندنی حکومەتی نیشتیمانی عیراق دەگەریتەوە ئینگلتەرە، بەردەوام دەبی لە دانانی فەرهەنگی زمانی کوردی، دەست نووسەکەی دوای مردنی لە (پەیمانگای دیراسەتی رۆژهەلات) پاریزراوە. نەخۆشی تینی بۆ دینێ، بۆ چارەسەر دەچیتە بنزرت لە تونس، لە گەرانەوەیدا لەناو کەشتیەکەدا لە ٢٤ شوبات ١٩٢٤ گیانی لەدەست داوە.

سۆن لەو ماوەیەدا شارەزایی و زانیاریەکی تەواوی لەسەر هۆزو عەشیرەتەکانی کورد پەیدا کردووە. سەردانی عادلە خانم دەکا بەراشکاوی باسی میوان داری و شیوەی روخسار و جلوبەرگی ئەم خاتونە سەردارە کوردە دەکات، پاشان چاوی بە تاهیر بەگی شاعیر دەکەویت و دەلێ: تاهیر بەگ جگە لە زمانی کوردی فارسی و تورکی و کەمێ فەرەنسی زانیوە.

سۆن لە کتیبەکەیدا باسی جلوبەرگ و داب و دەستور و نەریتی کوردی کردووە. کتیبەکەی بە لیدوان لەسەر هەندێ خیلەسات و عەشیرەتەکانی کورد کۆتا پێ هیناوە، لەوانە: حەیدەرانلۆ، شکاك، هەکاری، موکری، پشدەر، رەواندوز، شوان، بابان، بانە، مەریوان، جاف، هەماوەند، شەرەف بەیانی، باجەلان، هەورامان، سلاحی، جۆران، کەلهورو، سنجابی.

## سیرجۆن ئیدمۆندس

لـە پيشـەوەی شـارەزايانی كاروبـاری كـوردو زمانەكەيـەتی لـەم سـەردەمەدا. فەرمانبـەری بەريوەبەرايـەتی و ئـەديب و دانـەری ئينگلـيزی سـيرئيدمۆندس لـە ٢٦ تشرينی يەكەم ١٨٨٩ شاری ئۆسكای يابانی هاتۆتە دنيا، كەوالتـەر ئيدمۆندسـی باوكی لەوێ قەشە دەبێ.

سير لە جاميعەی كمبريدج خويندويەتی زمانی عەرەبی توركی و فارسـی فـير بووە، سالی ١٩١٠ بە سيفەتی وەرگير دەچيتە ناو كاری قونسوليەت، كارمـەند دەبێ لـە ئەسـتەنبۆڵ و بوشـەهر. جـەنگی جيـهانی بـەرپا دەبـێ، دەيكەنـە يـاريدەدەری ئەفسەری سياسی، لەو هەلمەتە سوپاييەی كە نيردراوەتە سەر عيراق (١٩١٥)، بەو پايەو بەو سيفەتە خزمەتگوزاری لە عيراق و ئيران و كوردسـتان دا كـردووە، دوای دامـەزراندنی حكومـەتی عـيراقی دەبيتـە پشـكنينەری بەريوەبەرايـەتی كـەركوك و سـليمانی (١٩٢٢)، دەگوازريتـەوە بـە يـاريدەدەری راويژكـار لـە وەزارەتـی نـاوخۆدا (١٩٢٥)، پاشان راويژ كار لە وەزارەتی دەرەوە (١٩٣٣)، دوايی راويژكاری وەزارەتی ناوخۆ (١٩٣٥-١٩٤٥)، دەگەريتەوە لەندەن دەيكەنە راويژكار لە وەزارەتی دەرەوەی بەريتانيا. دەبيتە نوينەری هەميشەيی لە دەزگاكانی نيودەولەتی بۆ پەناهـەندەكان لـە جنيڤ. بۆ پايەی وەزير مفەوەز بالا دەكرێ. لە ١٩٥٠ واز لەكارو فەرمان دينێ. دوای ئەوە دەستی كردووە بە موحازەرە لەسەر زمانی كوردی لـە پـەيمانگای ديراسـەتی رۆژهەلاتی و ئەفەريقی سەر بە جاميعەی لەندەن.

ئەم پياوە بەگەلی ئەركی گرنگی بەريوەبەرايەتی و سياسی لە عيراق هەلساوە، پـەيوەندی دۆسـتايەتی بەگەلـێ كەسـايەتی دەسـتەلاتداری عـيراق هـەبووە، بەشيوەيەكی تايبەتيش بە ئەديب و زانای مەزنی كورد تۆفيق وەهبی بەگەوە، هەتا مـەرگ ليكی دانـەبراندن ئاشنايەتی و هاموشۆيان لەگەڵ يـەكتر هـەر بـەردەوام بـووە، پيكەوە فەرهەنگيكی كوردی - ئينگليزی يان داناوە (١٩٦٦).

ئيدمۆنـدس دانـەری چـەندين كتيبـە ناودارترينيـان (كـورد - تـورك - عـەرەب) (١٩٥٧) پاريزەر جەرجيس فەتحوللا وەريگيراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

ئیدمۆندس لە ١١ حوزەیران ١٩٧٩ لە ناوچەی کند کۆچی دوایی دەکا. وتاریکی لە ژێر ناوی (الحلفیة الدستوریة للحرب الکردیة في العراق) نووسیوە و لە گۆڤاری کوردستان زمان حالی خویندکارانی کورد لە ئەوروپا کە لە لەندەن بە ئینگلیزی دەردەچوو بلاوکردۆتەوە.

# فەهرەست


پێشەکی وەرگێڕ

کورتەیەك لە ژیانی دانەر

پێشەکی دانەر

چاوپیاخشاندنێك لەسەر گەلی کورد

دەوڵەتی بنەماڵەی بابان

ئیمارەتی مەحمود پاشا

موقیمی بەریتانی و گەشتەکەی

دووا ڕۆژانی دەوڵەت

ناودارانی بنەماڵەی بابان

١. ئەحمەد پاشا

٢. عەزیز بەگ

٣. عەبدوڵڵا موسیب پاشا

٤. محەمەد رەشید پاشا

٥. خەلیل خالید پاشا

٦. محەمەد شەریف پاشا

مەسەلەی کورد لە کۆنگرەی قاهیرەدا

٧. شێخ مەحمود

بنەماڵەی بارزانی

٨. شێخ ئەحمەد بارزانی

٩. مەلا مستەفای بارزانی

١٠. دوکتۆر عەبدول رەحمان قاسملۆ

تەسەوف و زانیاری لە کوردستان
١١. شێخ مارفی نۆدێ
١٢. شێخ خالیدی نەقشبەندی
١٣. شێخ عەبدوڵڵای بێتوشی
١٤. نامی عەبدوڵڵا ئەفەندی حەیدەری
١٥. حاجی ئەسعەد ئەفەندی حەیدەری
کوردەکان لە تورکیا
١٦. سەعید پاشا
١٧. سەعید پاشای کورد
١٨. ئەحمەد سورەیا
١٩. رەسول مستی
٢٠. یوسف ضیاء پاشا
٢١. یوسف ضیاء
٢٢. ئەحمەد فایز
٢٣. عیزەت بەگ خەندان
٢٤. سلیمان بەگ خەندان
٢٥. ئیسماعیل پاشای بابان
٢٦. مستەفا زهنی پاشای بابان
٢٧. ئیسماعیل حەقی بەگ بابان
٢٨. سلیمان نەزیف بەگ
٢٩. فایق عەلی بەگ
٣٠. ئەمیر لیوا مستەفا پاشا یا مولکی
٣١. ئەمیر لیوا ئەمین پاشارواندوزی
کوردەکان لە میسر
٣٢. عەباس بارزلی
٣٣. عەلی رەزا بەگی کورد
٣٤. ئیسماعیل حەقی پاشا

٣٥. مشير شاهين پاشا

بنەماڵەی تەیموری

٣٦. عائیشەخانی تەیموری

٣٧. ئەحمەد تەیمور پاشا

٣٨. محەمەد تەیمور پاشا

٣٩. محەمەد تەیمور

٤٠. مەحمود تەیمور

٤١. شێخ محەمەد عەبدە

٤٢. قاسم ئەمین

٤٣. عوسمان ئەبو بەکر دقنە

کوردەکان لە حیجاز

٤٤. شێخ محەمەدی کوردە

٤٥. عەلی زوهری شێروانی

٤٦. محەمەد ماجدی کورد

٤٧. کوردەکانی سوریا

٤٨. هۆلۆ پاشاو بنەمالەکەی

٤٩. ئیبراهیم بەگ هنانۆ

٥٠. محەمەد کورد عەلی

پیاوانی ئایینی و ئەدەبی

بنەمالەی حەیدەری

٥١. ئیبراهیم فەسیح حەیدەری

٥٢. محەمەد ئەمین زەند

٥٣. موفتی زەهاوی

٥٤. شیخ رەزای تالەبانی

٥٥. محەمەد مەحوی

٥٦. سالح حەریق

٥٧. ئەحمەد مەلا قادر

٥٨. محەمەد ئەمین کوردە
٥٩. عەبدول رەحمان قەرەداغی
٦٠. ئەمین یومنی
٦١. محەمەد تەها شێروانی
٦٢. نورەدین شێروانی
٦٣. ئەمین فەیزی بەگ
٦٤. حوسین نازم
٦٥. مستەفا ساحیبقران
٦٦. ئەحمەد حەمدی ساحیبقران
٦٧. حەسەن بامەرنی
٦٨. ئەبوبەکر مەلا
٦٩. توفیق پیرەمێرد
٧٠. محەمەد کۆیی
٧١. عەبدول عەزیز حاجی ئەمین
٧٢. فایەق بێکەس
٧٣. ئەحمەد خانەقا
٧٤. عەبدول قادر زەهاوی
٧٥. رەفیق حیلمی
٧٦. عەبدوڵلا گۆران
میژوونوسان
٧٧. مەلا جەمیل رۆژبەیانی
٧٨. شوکری فەزلی
٧٩. عەبدول قادر رەشید ناسری
٨٠. حوسین مەردان
پیاوانی بەرێوبەرایەت و سیاسەتمەدار
٨١. عوسمان پاشای جاف
٨٢. مەحمود پاشای جاف

٨٣. مەحمود خدر
٨٤. تاهیر بەگ
٨٥. رەشید پاشای زەهاوی
٨٦. عەبدوڵلا موخلیس رەسول زادە
٨٧. حەمدی پاشای بابان
٨٨. محەمەد سالح میللی
٨٩. حەمدی بەگ بابان
٩٠. میر لیوا فەتاح پاشا
٩١. ئیبراهیم حەیدەری
٩٢. شێخ محەمەد بریفکانی
٩٣. سەعید مەعروف
٩٤. بابەکر سەلیم ئاغا
٩٥. ئەحمەد عوسمان
٩٦. رەشید بەگ بەرواری
٩٧. توفیق خالیدی
٩٨. جەمیل حەوێزی
٩٩. محەمەد ئەمین زەکی
١٠٠. هەیبەتوڵلای موفتی
١٠١. ئەحمەد کەرکوکی
١٠٢. میرزا فەرەج شەریف زادە
١٠٣. سەبیح نەشئەت
١٠٤. مەعروف عەلی ئەسغەر جیاوک
١٠٥. سدیق مەزهەر مستەفا
١٠٦. محەمەد حەبیب تالەبانی
١٠٧. فایەق تالەبانی
١٠٨. خدر ئەحمەد دزەیی
١٠٩. داود حەیدەری

١١٠. سالح زەکی ساحیبقران
١١١. فەریق ئەمین زەکی سلیمان
١١٢. محەمەد سالح خانەوادەی محەمەد عەلی بەگ
١١٣. فارس ئاغای محەمەد زێباری
١١٤. سەعید دۆسکی
١١٥. فەریق حوسێن فەوزی
١١٦. جەمیل بابان
١١٧. لیوا خالید مەحمود زەهاوی
١١٨. عەبدوڵلاّ سلێمان بەیاتی
١١٩. عەبدول حەمید جاف
١٢٠. فەریق بەکر سدقی
١٢١. تۆفیق وەهبی
١٢٢. محەمەد عەلی مەحمود
١٢٣. دارا بەگ
١٢٤. ئەمین رەشید ئاغا
١٢٥. سەلاحەدین بابان
١٢٦. جەلال بابان
١٢٧. جەمال بابان
١٢٨. سدیق رەسول قادری
١٢٩. شێخ قادر شێخ سەعید حەفید زادە
١٣٠. داود جاف
١٣١. ئیسماعیل رواندوزی
١٣٢. حازم شمدین ئاغا
١٣٣. ماجد مستەفا
١٣٤. راغیب عەبدوڵلاّ بەگ
١٣٥. دوکتور شەوکەت زەهاوی
١٣٦. ئەحمەد موختار جاف

١٣٧. ليوا بەهادين نوری
١٣٨. سەيفوڵلا خەندان
١٣٩. محەمەد عەتا ئەمين
١٤٠. ئەحمەد تۆفيق
١٤١. عەلی کەمال عەبدولڕەحمان
١٤٢. سەعيد بەگ ميری شێخان
١٤٣. غياث الدين نەقشبەندی
١٤٤. ئەحمەد موختار بابان
١٤٥. محەمەد سەعيد قەزاز
١٤٦. عەلی حەيدەر سلێمان
١٤٧. محەمەد سديق تەها
١٤٨. قاسم حەسەن
١٤٩. حەسەن فەهمی جاف
١٥٠. ميرانی قادر بەگ
١٥١. باباعەلی شێخ مەحمود حەفيد
١٥٢. نازم زەهاوی
١٥٣. خاليد نەقشبەندی
١٥٤. عيزەدين مەلا
١٥٥. مەحمود جەميل

گەريده و مێژوو نووسان

١٥٦. ليکلاما ئينهۆڵت
١٥٧. کوترد مارگريت لوپيان بێل
١٥٨. ئيلی بانيستر سئن
١٥٩. سێرجۆن ئيدمۆندس

# سەرچاوەکان

کەم تا زۆر سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە "وەرگێڕ"


١. دیوانی فایەق بێکەس / چاپی دووەم محەمەدی مەلا کەریم ١٩٨٠
٢. دیوانی پیرەمێردی نەمر / محەمەد ڕەسول هاوار
٣. دیوانی پیرەمێرد / فایەق هۆشیار
٤. دیوانی حاجی قادری کۆیی / عەبدول ڕەحمان سەعید ١٩٢٥ چاپخانەی دار السلام
٥. دیوانی گۆران – بەرگی یەکەم / محەمەدی مەلا کەریم چاپخانەی کۆری زانیاری کورد ١٩٦٦
٦. دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی
٧. پەندی پێشینانی – پیرەمێرد / بەشی یەکەم ١٩٩٥ بەشی دووەم ١٩٦٦
٨. شێخ مەحمودی قارەمان / محەمەد ڕەسول هاوار
٩. دیوانی حەمدی / ئەحمەد بەگی ساحێبقڕان
١٠. میرایەتی بابان لە نێوان بەرداشی ڕۆم و عەجەمدا / نەوشیروان مستەفا
١١. دیوانی ساڵح حەریق / مەحمود خاکی ١٩٦٩
١٢. چاوپێکەوتن لەگەڵ عیزەدین مەلا ئەفەندی
١٣. دیوانی پیرەمێرد / کۆکردنەوەو ساغکردنەوەی – مستەفا سالح کەریم – فائق هوشیار – مەحمود ئەحمەد محەمەد، محەمەد نوری تۆفیق، ئەحمەد زرەنگ.
١٤. پەیوەندی دیدار لەگەڵ مامۆستا مەسعود محەمەد
١٥. دیوانی ئەحمەد موختار جاف
١٦. الكرد و كردستان – في الوثائق البريطانية / دکتور وەلید حەمدی
١٧. چاوپێکەوتن لەگەڵ خوشکە نەجات کچی ڕەفیق حیلمی

١٨. **شاره شیرینەکەم سلیمانی / جەمال بابان**

١٩. **دیوانــی مــەحوی / مــەلا محەمــەدی بڵاخــی لیکدانــەوەو لیکۆڵینــەوەی مامۆســتا عەبدولکەریم مودەریس**

٢٠. **دیدارو چاوپیکەوتن لەگەڵ خوشکە پەری کچی سەعید قەزاز – لەندەن**

٢١. **رۆژنامەی خەبات / ١٦–١٢–١٩٤٢ ئەحمەد جەمال**

٢٢. **یادداشت / مامۆستا رەفیق حیلمی**

٢٣. **کۆماری مهاباد / مەحمود مەلا عیزەت**

٢٤. **دیوانی حاجی قادر / کەریم شارەزا – سەردار میران**

# سوپاس و پێزانین

## بۆ

- برازایانم قاسم عبد العزیز و فەرهاد عبد العزیز
- ئاراسی کوڕم
- سەرکەوت خۆشناو

**هیوادارم سەرفراز و سەرکەوتووبن و نمونەیان هەر زۆر بن.**

**عبد الخالق**